شەرحی

# بُلوغُ المَرامِ مِنْ أدِلَّةِ الأحْكام

لِلحافِظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني رحمه الله تعالى

بە پێنووسی

نوری فارس حەمەخان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد

﴿ بەرگی سێیەم ﴾

# شەرحی

# (( بُلُوغُ المَرَامِ

# مِنْ

# أَدِلَّةِ الأَحْكَام

للحافظ أحمد بن على بن حَجَرِ العَسْقَلاَنِىَ -رَحِمَهُ الله تعالى-))


بە پێنووسی:

نووری فارس حەمە خان

سەرپەرشتی چاپ:

محمود أحمد محمد



﴿بەرگی سێیەم﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**************************************************


🕮 ناوی کتێب: شەرحی (( بُلُوغ المَرَامِ مِنْ أَدِلَّةِ الأَحْكَام )) للعَسْقَلاَنِی

🕮 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان

🕮 چاپی: یەکەم

🕮 تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

🕮 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٧٠٥)ی پێدراوە.

🕮 ساڵی چاپ: ٢٠١٣

🕮 کۆمپیوتەرو دیزاین: ( نیان حسین )

## ٩- نامەی ژیوارەكان (نەفەقات)
## كِتَابُ النَّفَقَاتِ

{بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری بـەكوردی، بـەرگی پێنجـەم، زنجـیرە: ٧٢، لاپـەڕە: ٧٥، چـاپی یەكـەم، لـە فـەرموودەی ژمـارە: ١٧٩٧ = ٥٢٥١ بوخـاری هـەتا فـەرموودەی ژمـارە: ١٧٩٩ = ٥٣٥٧ فـتح البـاری + تـاجول ئوصـول، بـەكوردی، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٨٠، لاپەڕە: ٥٩٥، چاپی چوارەم، ژمـارە: ٢٢٧٩ هـەتا ٢٢٨٦ + فیقهـی ئاسـان، بـەرگی دووەم، چـاپی تـاران، لاپـەڕە: ٨٠٣، زنجـیرە: ٢٩٤ هـەتا كۆتـایی زنجیـرە: ٢٩٨} + {مختـصر صـحیح مـسلم/٢} بـەكوردی نامـەی/١٦ لـە ژمارە: ٨٨٣ هەتا ژمارە: ٨٩٠}.

١١٦٨- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {دَخَلَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ -اِمْـرَأَةُ أَبِي سُفْيَانَ- عَلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ أَبَـا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ لَا يُعْطِينِي مِنْ اَلنَّفَقَةِ مَا يَكْفِينِي وَيَكْفِي بَنِيَّ، إِلَّا مَـا أَخَـذْتُ مِـنْ مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمِهِ، فَهَلْ عَلَيَّ فِي ذَلِكَ مِنْ جُنَاحٍ؟ فَقَالَ: "خُذِي مِنْ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ مَـا يَكْفِيكِ، وَيَكْفِي بَنِيكِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمـارە: ٩٩٠ = ٢٢١١، ٢٤٦٠، ٣٨٢٥، ٥٣٥٩، ٥٣٦٤. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٧ = شیحا ٤٤٥٤ = ١٧١٤}:

**ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایە:**

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: هێنـدی دایكـی موعاوییـەی كـوڕی ئـەبو سـوفیان (ڕەزای خـودا لەهەرسـێكیان) هـات بـۆلای پێغەمبــەر (درودی خـودای لەســەر بــێ) عـەرزیكرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! سـوێند بەخودا، لەسەر ڕووی زەوی، بنەماڵەو وڵات نەبووە كەبەقـەد بنەماڵـەو وڵاتـی تۆ، پێم خۆش بـێ، كـەخودا دامـاوو كەساسـیان بكـا، بـەڵام خـودا كـارێكی وای كرد، كەئێستا بنـەماڵەو وڵات نییە كەبەقەد بنەماڵەو وڵاتی تۆ، كەپێم خـۆش بێ، خودا سەربەرزی هـەردوو جیهانیـان بكـا، پێغەمبـەریش (درودی خـودای

لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەم خۆشەویستییەی تۆ بۆ منو بۆ ئایینی من، ڕۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێ!)

ئەوجا هیند فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پرسیارێکم هەیە کە ئەمەیە: ئەبو سوفیانی مێردم، پیاوێکی ڕژدو گیرە، ئەوەندەم ناداتێ کەبەشی خۆمو منالەکانم بکا، بەئاسایی، مەگەر ئەو نەزانێ، خۆم شتی تری ببەم، ئەوسا بەشمان بکا، جا ئایا ئەگەر ئەو نەزانێ، بەنهێنی خۆم لەماڵەکەی ببەم، بۆ خەرجیو ژیواری خۆمو منالەکانم گوناهم ناگا؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گوناهت ناگا، کەبەپێی دەستووری جوانی ناوکۆمەڵ مەسرەفیان بۆ بکەیت!). (تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٦).

(ڕوونکردنەوە):

هیندی کچی عوتبە، هاوسەری ئەبو سوفیان، دایکی موعاوییە (ڕەزای خودا لەخۆیو لەمێردیو لەکوڕی بێ) هەرسێکیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون، خۆیو ئەبو سوفیانی مێردی لە (مەسەلەمەی فەتح) بوون، واتە: ڕۆژی ئازادکردنی مەککە ئیسلام بوون، لەناچاریدا، نەوەك بەخۆشی خۆیان، بەلام زۆرینەی ئەم مەسلەمەی فەتحە، بەرەبەرە باشترین موسوڵمانیان لێ دەرچوو، ئەوەتا لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەواڵ دەدا، کەڕۆژ بەڕۆژ هیند زیاتر دەبێ بەدۆستی دینی ئیسلام. گەرچی خۆیو ئەبوسوفیانی مێردی، لەپێشدا لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی پێغەمبەر بوون، بەلام کاتێکیش خودا هیدایەتی دانو موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو، هیند لەجەنگی ئوحوددا، لەگەڵ دەستەیێ لەژنان، بەسرود خوێندنەوە هانی مێردەکانی خۆیانیان دەدا، کەبەسەختی بجەنگن لەگەڵ پێغەمبەرو لەشکری ئیسلاما، هانیان دەدان لەسەر شەڕکردنو بەدەم دەف لێدانەوە دیانپچڕاندو دەیانگوت:

نَحْـــنُ بَنَـــاتُ طَـــارِقِ نَمْـــشِي عَلَـــى النَّمَـــارِقِ
إِنْ تُقْبِلُـــوا نُعَـــانِقِ أَوْ تُـــدْبِروا نُفَـــارِقِ
فِـــرَاقَ غَيْـــرِ وَامِـــقِ

واته:

كـــچى ئەســـتێرەی ســـوورين پەرومردەی سەر مـافوورين
عاشـــق بەشـــێرو شـــوورين لـەپياوی كـوونی دوورين
يـــاری لاوی جەســـوورين

يا ئاوا:

كـــچى ئەســـترەو مـــانگين بـەنازو شـۆخو شـەنگين
ئاشـــق بەشـــێری جـــەنگين ئـەو گوڵەو ئێمە هەنگين
لـــە هـــەڵهاتوو دڵتـــەنگين

كاتـێ هينـد (رەزای خـودای لێ بـێ) موسـوڵمان بـوو، بتێكـی هـەبوو، بەتەشوێ پارچە پارچەی كردو گوتی: بەڕاستی هەتا لەگەڵ تۆ بووين، چاك لەخۆمان بايی بوو بووين!!

هيند بەڵێنیدا بەوەحشی ئەگەر لەغەزای ئوحوددا ئيمامی حەمزەی بۆ بكوژێ، ئازادی دەكەن، جا كاتێ لەجەنگی ئوحوددا وەحشی پێشەوا حـەمزەی مـامی پێغەمبـەری كوشـت، هينـد ئەوكاتـە هێـشتا ئيـسلام نـەبووبوو، سـكی حەمزەی دڕیو جەرگی دەرهێناو برژاندیو ويستی بيخوات، چونكە حـەمزە لەجەنگی بەدردا عوتبەی باوكی كوشتبوو!

لەسـەردەمی جێنـشينی عومـەری كـوڕی خـەتابا، لـەو ڕۆژەدا كـە ئـەبو قوحافـەی بـاوكی ئـەبو بـەكری صـەديق مـرد، هينـدی كـچی عوتبـەيش مـرد (رەزاو رەحمـەتی خودايـان لێ بـێ). (بڕوانـە: ژمـارە: ٨٦ ژياننامـەی معاويـەی كوڕی ئەبو سوفيان كوڕی هيند + أم حبيبەی هاوسەری پێغەمبەر، ژمارە: ٢٦٤

+ ژمــاره: ٣٧٩ + مختــصر صــحيح مــسلم/٢، ژمــاره: ٨٨٧و ١٩٧و ٨٦٢ + تــاج/٣، زنجـيره: ٣٣، ژمـاره: ٣٤٢٢ + زنجـيره: ٣٤، ژمـاره: ٣٤٢٤و ٣٤٢٣ هـەروا تەجريـدى بوخارى، بەرگى يەكەم ژماره: ٦٣ + تەجريد/٢، ژماره: ٦١٤).

١١٦٩- وَعَنْ طَارِقِ الْمُحَارِبِيِّ (رضى الله عنه) قَالَ: {قَدِمْنَا اَلْمَدِينَةَ، فَإِذَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَائِمٌ يَخْطُبُ وَيَقُولُ: "يَدُ اَلْمُعْطِي اَلْعُلْيَا، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ: أُمَّكَ وَأَبَاكَ، وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ فَأَدْنَاكَ"} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ.

{صحيح الجامع: ٨٠٦٧، الصحيح المسند: ٥٢١}:

طاريقى موحاريبى (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: رۆژێ كەچووين بۆ مەدينـە، كـە سـەرنجماندا، وا پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسـەر بـێ) لەسـەر دوانگە وەستابوو وتارى دەدا بـۆ خەڵكەكە، وە دەيفـەرموو: (دەسـتى خێركـەر دەستى باڵايە، ئەى خێركەر! لـەخێزانو خزمـى خۆتـەوە دەسـت بكـە بـەخێر كـردن، ئـاوا رِێـزى لێ بگـره: ببەخـشە بـەدايكت، ئـەوجا بـەباوكت، ئـەوجا بەخوشـكت، ئـەوجا بـەبرات، ئـەوجا بـەنزيكترين خزمـت، وە هـەروەها). (رياض/١، زنجيره: ٥٧، ژماره: ٥٣١).

(رِوونكردنەوە):

طاريقى كوڕى عەبدوڵلاى موحاريبى كووفى، هاوەڵى پێغەمبەره، چەند گێڕانەوەيەكى هەيە، ئـەم زاتانـە لەگێڕانـەوەى فـەرموودەدا، فـەقێو شـاگردى طاريق بوون: ئەبو صەخره جاميعى كوڕى شـەددادو (ربعى كـوڕى خـراش)و (أبـو شـعثاء: سـليم بـن اسـود المحـاربى). بـەرقىو بەغـەوى دەڵـێن: دوو فەرموودەى هەيە، ئيبنو سەكەن دەڵێ: سێ فەرموودەى هەيە.

١١٧٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ، وَلَا يُكَلَّفُ مِنْ اَلْعَمَلِ إِلَّا مَـا يُطِيـقُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٨ = ٣٠، ٢٥٤٥، ٧٠٨٣ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٠٤ = شيحا: ٤٢٨٠. أبو داود: أدب: ٥١٦٦. ترمذی. ندورو أيمان: ١٥٤٢. تحفة الأشراف/٤٨١١}:

لەپوختەی صەحیحی موسلیمدا، ئاوایە، دەیکەین بەروونکەرەوەی ئـەم گێڕانەوەی ئێرە، کە لە ئەبوهورەیرەوەیە:

مـەعرووری کـوڕی سـوومید فـەرمووی: لـە ڕەبـەزە ئـەبو زەڕم بینـی، دەستێ بەرگی نیوە تازەو نیوە کۆنی لەبەردا بوو، پێمان گوت: ئەی ئەبو زەڕ! هـۆی چـییە کەبـەرگی خـۆت‌و بـەرگی خوڵامەکـەت وەك یـەك وایـە، هـی هەردووکتان نیوەی تازەیەو نیـوەی کۆنـە، ئەگـەر هـەردوو پارچـە تازەکـە بـۆ یەکێکتان بوایەو هەردوو پارچە کۆنەکەیش بۆ یەکێکتان بوایە، هەرکەسەتان قاتێکی یەك ڕەنگی لەبەر دەبوو، ئایا هۆی ئەمە چییە؟

ئەویش فەرمووی: لەسەردەمی خەزرەتدا (درودی خـودای لەسـەر بـێ) قسەم بـەبرادەرێکی خـۆم گـوت، کـەبیلالی حەبەشـی بـوو، دایکی بێگانـە بـوو، دایکی ناعەرەب بوو، تانەی ئەوەم لێ‌دا کەدایکی ڕەشە، پێم گوت: ئەی کـوڕی ژنە ڕەشەکە! ئەویش لـەلای پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) سـکاڵای ئەوەی لەدەستم کرد، کەمن تانەیەکی ئاوا ناهەقم لەدایکی داوە، کاتێ چوومە خزمـەتی حـەزرەت (درودی خـودای گـەورەو سـەروەری لەسـەر بـێ‌و سـەرو ماڵ‌و حاڵ‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەر گـۆڕی پـیرۆزی بـێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو زەڕ! هێشتا بۆنی ڕەگەزپەرستی سـەردەمی نـەزانی (جاهیلییەت)ت لێ دێت!).

منیش عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خۆی وایە: کەسێ جنێو بەکەسێ بدا، خەڵکیش جنێو بەباوكو دایکی ئەو دەدەن، فەرمووی: (ئەی ئەبو زەڕ! ئەوە ڕەوشتی سەردەمی نەزانییە، کە لەتۆدا ماوە، ئەم کۆیلانە هەرچەند بەندەو خوڵامو بەردەستو نۆکەری ئێوەن، بەڵام لەبنەڕەتدا براتانن و ئێوەو ئەوان لەیەك دایكو باوکن، کە باوە ئادەمو دایە حەوان، ئەوەندە هەیە خودا لەبەر حیکمەتێ ئەوانی کردووە بەژێردەستەی ئێوە، دەی برایەکی باش بن، ئەگەر یەکێ لەم برایانەی خۆتان، کەوتە ژێردەستتان، وەك برا ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن و خۆتان چی دەخۆن ئەوەیش بدەن بەئەوان، وەخۆتان چی لەبەر دەکەن، لەهەمان جلو بەرگیش بۆ ئەوان بکەن، قەتیش زەحمەتیان مەدەن و ئەرکێکی وا مەدەن بەسەریانا کە لە وزەو کێشیانا نەبێت، کە ئەرکیش دەدەن بەسەریانا خۆشتان بەپێی حاڵو توانا یارمەتیو یاریدەیان بدەن). (ریاض/۳، زنجیرە: ۲۳۷، ژمارە/۱/۱۳٦۰ + تاج/۲، زنجیرە: ۲۱، ژمارە: ۲۰۲۹ + تاج/۳، زنجیرە: ۱۱۰، ژمارە: ۳۱۸۵ ج/٤ = چاپی چوارەم).

۱۱۷۱– لە ژمارە: (۱۰٤۷) لەپێشەوە، لەباسی زنجیرە: ٦۲ – باب عُشْرَةِ النِسَّاءِ دا رابورد.

۱۱۷۲– لە ژمارە: (۷٥۹)دا، لە زنجیرە: ۳۷دا، باب صِفَةُ الحج رابورد.

۱۱۷۳– وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ. وَهُوَ عِنْدَ مُسْلِمٍ بِلَفْظِ: "أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ".

{مختصر صحيح مسلم/۲، ژمارە: ۸۸٤ شيحا ۲۳۰۹ = مسلم ۹۹٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەسە بۆ گوناهباری پیاوێ، کەنان و ئاو بگرێتەوەوە لەخێزان و ژێردەستەی خۆی!). (تاج/۲، زنجیرە: ۲۱، ژمارە:

١٢٧٥) لەگێڕانـەوەی ئـەبو داووددا ئاوایـە: (بەسـە بـۆ گوناهبـاری کەسـێ کـە ئەوکەسـانەی بـەخێویان دەکـا پـشت گوێیـان بخـات!) ئەمـەیش گێڕانەوەکـەی پێشەوا موسلیمە (ڕەحمەتی خودای لێ بـێ) حـەیثـەمـە (ڕەحمـەتی خـودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ بووین، لەخزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومـەردا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) دانیـشتبووین، لەوکاتـەدا کلیـل بەدەسـتەکەی هاتـە ژوورەوە، عەبدوڵڵا بەکلیلدارەکەی خۆی گوت: ئەری نانو ئـاوت دا بەکۆیلـەکان؟ گوتی: نەء، نەمداونەتێ، عەبدوڵڵا فەرمووی: (دەبڕۆ نانو ئاوەکەیان بدەرێ، بۆخۆم بیـستم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (بەسـە بـۆ تاوانبـاریی کەسـێ، کـەنانو ئـاو بگرێتـەوە لەکۆیلـەو ژێردەسـتەی خـۆی!). (تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٥).

١١٧٤– وَعَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) – يَرْفَعُهُ، فِـي اَلْحَامِـلِ اَلْمُتَـوَفَّى عَنْهَـا زَوْجُهَا – قَالَ: {لَا نَفَقَةَ لَهَا} أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، لَكِنْ قَالَ: اَلْمَحْفُـوظُ وَقْفُهُ.

{سُنَنُ البيهقي الكبرى: ١٥٢٥٤}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەژنی سکپڕی مێـرد مـردوو، لەچـرکە ساتی مردنی مێردەکەیـەوە، هـەتا عیددەکـەی تـەواو دەبـێ، نەفەقـەو ژێـواری دەکەوێ یان نا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سـەبارەت بـەم بابەتـە فەرمووی: (نەفەقەو ژێواری ناکەوێ!).

دانــەر حـافیظی عەسـقەلانی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: بەیهـەقی دەریهێنـاوە، پیـاوانی ڕشـتەکەی متمانـە پێکـراون، بـەڵام بەیهـەقی دەفەرموێ: (ڕەوان ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە مـەوقووف بـێ لەسـەر جـابیر، مەرفووع نـەبێ بۆ پێغەمبەر).

١١٧٥- فەرموودەكەی فاطیمەی كچی قەیس لە ژمارە: (١١٤٣)دا رابورد، بەڵام ئەو فەرموودەیە لەبارەی ژنی سێ بەسێ تەڵاقدراووەیە، وە دووگیانیش نییە، دیارە دانەر بابەتەكەی لێ گۆڕاوە.

١١٧٦- {وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْيَدِ اَلْعُلْيَا خَيْرٌ مِنْ اَلْيَدِ اَلسُّفْلَى، وَيَبْدَأُ أَحَدُكُمْ بِمَنْ يَعُولُ. تَقُولُ اَلْمَرْأَةُ: أَطْعِمْنِي، أَوْ طَلِّقْنِي. رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گەورەترین خێر ئەو خێرەیە كەلەسەر تێریو تەسەلیو دەوڵەمەندیی بێ، هەرچەندە ڕاستو دروستە: كە چەندەی لەدەستی پیاوی كەم دەست دێ، ئەوە خێرێكی گەلێ مەزنە، بەڵام هەندێ هەژار دەچن لەدەمیماڵو منالی خۆیانی دەگرنەوەو دەیكەن بەقوڕگی ئەمو ئەودا، گوایە خێر دەكەن، دەستی سەرەوەیش كەدەستی خێركەرە، لەدەستی ژێرەوە كە دەستی خێر وەرگرە چاكترو باشترە، وەلەخێزانی خۆشتەوە دەست پێ بكە بەخێركردنو بەشت بەخشینو بەماڵ بەختكردن)

ئەوجا فەرمووی: (ژن دەڵێ: یا نانو ئاوم بدە یا كەژنت پێ بەخێو ناكرێ تەڵاقم بدە، بەندەو كۆیلەیش دەڵێ: تێر نانو ئاوم بكەو ئیشم پێ بكە، كوڕیش دەڵێ: ئەگەر خۆت بەخێوم ناكەی ئەی بەتەمای كێی تری كەبم سپێری پێی تا بەخێوم بكا).

گوتیان: ئەی ئەبوهورەیرە! ئەم پەراوێزەی دواوەیشت، لە پێغەمبەر خۆی بیستووەو ئەمەی كە گوتت هەمووی فەرمایشی ئەوە، یا لەوێوە كەگوتت: (ژن دەڵێ......... تاد). تێچەنو قسەی خۆتە؟ ئەبوهورەیرە فەرمووی: (نەء، هەموویم لە پێغەمبەر نەبیستووە، لەوێوە كە دەڵێم (ژن

دەڵێ.........تاد) تێچەنەو هی گیرفانی خۆمە. (تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٤ — بوخاری ژمارە: ٥٣٥٥).

١١٧٧- {وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ اَلْمُسَيَّبِ – فِي اَلرَّجُلِ لَا يَجِدُ مَا يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ– قَالَ: {يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا}. أَخْرَجَهُ سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ: عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ أَبِي اَلزِّنَادِ، عَنْهُ. قَالَ: {فَقُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ اَلْمُسَيَّبِ: سُنَّةٌ؟ فَقَالَ: سُنَّةٌ}. وَهَذَا مُرْسَلٌ قَوِيٌ {ضعيف، الإرواء: ٢٢٩/٧}. ب– وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أُمَرَاءِ اَلْأَجْنَادِ فِي رِجَالٍ غَابُوا عَنْ نِسَائِهِمْ: أَنْ يَأْخُذُوهُمْ بِأَنَّ يُنْفِقُوا أَوْ يُطَلِّقُوا، فَإِنْ طَلَّقُوا بَعَثُوا بِنَفَقَةِ مَا حَبَسُوا}. أَخْرَجَهُ اَلشَّافِعِيُّ. ثُمَّ اَلْبَيْهَقِيّ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ}:

{صحيح، الإرواء: ٢١٥٩}

ئەم ژمارەیە دوو گێڕانەوەیە:

یەکەمیان: ئەبو زەڕناد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی سەعیدی کوڕی موسەییەبم کرد: ئەگەر پیاوێ نەیبێت مەسرەف بۆ ژنەکەی بکاتو پێی بەخێو نەدەکرا، چاریان چییە؟ فەرمووی: لەیەك جیادەکرێنەوەو ژنەکە بۆی هەیە شووەکەی هەڵوەشێنێتەوە. گوتم بەسەعیدی کوڕی موسەییەب: (ئایا ئەمەی تۆ دەیڵێت لەم بارەیەوە بەپێی ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەرە، یان ڕاوبۆچوونی خۆتە؟ سەعید فەرمووی: (ڕای خۆم نییە، ئەم بڕیارە بەپێی ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەرە).

دووەمیان: پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا: (نامەی نووسی بۆ فەرمانەدەی سەرلەشکرەکان، لەبارەی ئەو مێردانەوە، کەژنەکانیان بەسەر ناکەنەوەو سەردانیان ناکەن، کەناچاریان بکەن یا ژێوارو خەرجییان بۆ دابین بکەن، یان تەڵاقیان بدەن، ئەگەر تەلاقیان دان، ئەوە دەبێ نەفەقەی ئەو ماوەیە بدەن کەلێیان نەپرسیونەتەوە).

**(ڕوونکردنەوە):**

**سەعیدی کوڕی موسەییەبی کوڕی حەزن (ڕەزای خودای گەورە لەخۆی و لەباوکی و باپیری بێ).**

**سەعید خۆی تابیعی یە، باوکی و باپیرەی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، لەمەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، موسەییەب بازرگان بوو، لەو کۆمەڵەیە، کە لەژێر درەختەکەی شەجەرەتولریضواندا، پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، حەوت فەرموودەی گێڕاوەتەوە (٣) سیانیان لە بوخاریدایە، فەرموودەی لەموسلیمیشدا هەیە، وەك فەرموودەی ژمارە: (٣ = ١٣١ مختصر صحيح مسلم/شيحا).**

**حەزن ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە ئیسلام بوو، یەکێك بوو لەپیاوماقوڵانی قوڕەیش، ئامادەی شەڕی یەمامە بوو، کەجەنگێکی گەورە بوو لەنێوانی موسوڵمانان و لەشکری موسەیلەمەی کەززابدا ڕوویداوە. حەزن دەیفەرموو: چوومە خزمەتی حەزرەت فەرمووی: (ناوت چییە؟ گوتم: ناوم حەزنە (واتە: هەردەو هەڵەت و ڕەقەن!) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا تۆ ناوت سەهلە). (واتە: دەشت و نەرمانی). منیش ڕازی نەبووم و بەگوێم نەکردو عەرزیمکرد: ناوێ ناگۆڕم کەباوکم لەمنی ناوە!**

**ئیبنو لموسەییەب دەیفەرموو: (ئیتر لەوساکەوە کەباپیرەم ئەم قسە ڕەقەی لەڕووی پێغەمبەردا کردووەو بەگوێی نەکردووە، کەخۆی ناو بنێ (سەهل) سەرڕەقی و توندوتیژیمان هەتا ئێستا لەناودا ماوەو لێمان نابڕێ.**

**(تاج/٥، ژمارە: ٥٤٠٧ چاپی چوارەم – گۆڕینی ناوی ناشیرین بەناوی لەبارتر)**

**ڕەحمەت لەو کەسەی لەبارەی ڕێزو خۆشەویستی باوکی و دایکییەوە دەڵێ (نووری فارس).**

**بەبێ تۆ بابە! ماوی نەماوم**

**دایەگیان! ئەتۆش هێزی هەناوم**

ئەوەنـــــــدە ڕێزتـــــان وا لەبەرچـــــاوم

پـێم شـــەرمە ناوتـــان وا لـــەپاش نـــاوم!!

حەزن (ڕەزای خودای لێ بێ) دوو فەرمموودەی لەبوخاریدا هەیە، کاتێ لـەپێش هـاتنی ئیـسلامدا بناغـەی کابـەیان دانایـەوە، حـەزن بـەردێکی لەبـەردەکانی کابـە بـرد، بەردەکـە خـۆی لەدەسـتی ڕاپـسکان‌و ڕۆیـشتەوە جێگەکەی خۆی لەدیواری کابەتەوڵلا. حەزن دەستی شیعری هەبوو، لـەکاتی جێنـشینی ئـەبو بـەکردا، لەڕۆژەکـەی شـەڕی یەمامـەدا شـەهید کـرا (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەخۆی‌و لەموسەییەبی کوڕی‌و لەسـەعیدی کوڕەزای. ڕۆحـی نووریش بە قوربانی گەردی سەر گۆڕیان بێ).

سەعید لەپەیڕەوانە (واتە: لەتابیعیە)  یەکێکە لەپیاوانی صەحیحەین، واتە: لەڕیجاڤلی صەحیحەینە، کـەبریتین لـە (صحیح البخاری)و لـە (صحیح مـسلم). ڕاوی ئەگـەر ژنـیش بـێ هـەرپێی دەگـووترێ، لـەپیاوانی ڕشـتەی بوخارییە، یا لەپیاوانی ڕشتەی موسلیمە، وەك دەگوترێ: عائیـشەو ئـەسماءو ئـوم عـەتێ‌و ئـوم سـەلەمە لـەریجالی صـەحیحەینن، نـاگوترێ لـەژنانی صەحیحەینن!

سەعید یەکێکە لەمەلا گەورەکانی مەدینە، کەناسراون بـە (فُقَهَاءُ المَدِينة: شـەرعزانەکانی مەدینـە) لـەنزیکی چـل کـەس لـەهاوەڵانی پێغەمبـەرەوە، فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، دادەنـرێ بەسـەروەری تـابیعین، لەسـاڵی سـێیەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتابا لـەدایك بـووە، لەساڵی (٩٤) نـەوەدو چواری کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی وەلیدی کوڕی عەبدولەلیکدا، فـەرمانی هـەقی بـەجێهێناوەو مـردووە (ڕەزاو ڕەحمـەتی خـودای گـەورەو سـەروەر لـەم کـوڕو باوك‌و باپیرەیە بێت). (بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/١، لاپـەڕە: ١٧، ژمـارە: ٣، + تـاج/٥، لاپـەڕە: ٣٣١ + تـاج/١٠، لاپـەڕە: ١٦١، ژمـارە: ١، چـاپی یەکـەم + عمـدة

القــارى/٨ص١٨٠ + العمــده/٢٢ ص٢٠٧ + إصــابه واســتيعاب لــەناوى (حَــزن ومُسَيّب)دا.

١١٧٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: {جَـاءَ رَجُـلٌ إِلَـى اَلنَّبِـيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: يَـا رَسُـولَ اَللَّـهِ! عِنْـدِي دِينَـارٌ؟ قَـالَ: "أَنْفِقْـهُ عَلَـى نَفْسِكَ". قَالَ: عِنْدِي آخَرُ؟ قَالَ: "أَنْفِقْهُ عَلَـى وَلَـدِكَ". قَـالَ: عِنْـدِي آخَـرُ؟ قَـالَ: "أَنْفِقْهُ عَلَى أَهْلِكَ". قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: "أَنْفِقْهُ عَلَى خَادِمِكَ". قَالَ عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: "أَنْتَ أَعْلَمَ"} أَخْرَجَـهُ اَلـشَّافِعِيُّ، وَأَبُـو دَاوُدَ، واللفـظُ لَـهُ وَأَخْرَجَـهُ النَّـسَائِيُّ وَالْحَاكِمُ بِتَقْدِيمِ. اَلزَّوْجَةِ عَلَى اَلْوَلَدِ.

{صحيح، المشكاة: ١٩٤٠}:

ئــەبوهورەيرە (رەزاى خــوداى لێ بــێ) فــەرمووى: پيــاوێ هاتــە لاى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ئەم پرسيارانەى لێ كـرد: گـوتى: ئـەى پێغەمبەرى خودا! دينارێكى زێڕم هەيـە، چى لێ بكەم؟ فـەرمووى: (خـەرجى بكە بۆ خۆت). گـوتى دينـارێكى تريـشم هەيـە؟ فـەرمووى: (خـەرجى بكـە بـۆ منداڵـەكانت). گـوتى: دينـارێكى تريـشم هەيـە؟ فـەرمووى: (خـەرجى بكـە بـۆ خێزانــت). گــوتى: دينــارێكى تريــشم هەيــە؟ فــەرمووى: (خــەرجى بكــە بــۆ نۆكەرەكانت). گوتى: دينارێ تريشم هيە؟ فەرمووى: (خۆت باشترى لێ دەزانى كــە چــى لێ دەكــەيت!). (شــافيعى دەريهێنــاوە، ئەمــە گفتــەى ئــەبو داوودە، نەسـائىو حـاكميش گێڕاويانەتـەوە، بـەڵام لەگێڕانـەوەى ئـەوانا، ژن لـەپێش منداڵە).

١١٧٩- وَعَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَـالَ: {قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اَللَّهِ! مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: "أُمَّكَ". قُلْتُ: ثُمَّ مِنْ؟ قَـالَ: "أُمَّـكَ". قُلْـتُ: ثُـمَّ مِـنْ "؟ قَـالَ: "أُمَّكَ". قُلْتُ: ثُمَّ مِـنْ؟ قَـالَ: "أَبَـاكَ، ثُـمَّ اَلْـأَقْرَبَ فَالْـأَقْرَبَ"} أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{صحيح، الإرواء: ٨٣٧} + {رياض/١، زنجيره: ٤٠، ژماره: ١٣١٦}:

بەهزی کوڕی حەکیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: باپیرەم فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ کێ باش بم؟ فەرمووی: (لە پێش پێشا بۆ دایکت) گوتم: ئەی دوای ئەو کێی تر؟ فەرمووی: (دیسان هەر بۆ دایکت باش بە) گوتم: ئەی ئەوسا کێ؟ فەرمووی: (دیستان هەر بۆ دایکت) گوتم: ئەی ئەوسا بۆکێ؟ فەرمووی: (ئەوجا باش بە بۆ باوکت، ئەوجا ڕێز لەنزیکترین کەسەکانت بگرە!).

(ڕوونکردنەوە):

(ژێوار بەپێی پێویستە)

١- ژێواری خزمو کەسوکار ئەندازەی بۆ دیاری نەکراوە، بەڵکوو بەپێی بەسبوونی کەسەکەیە، کەبەپێی گەورەو بچووکو ڕەگەزی نێرو مێو پێویستی کەسەکە دەگۆڕێ، کورتو پوخت، بەکورتی پەتی (ژێوار دەبێ ئەوەندە بێ لەهەموو ڕوویەکەوە، کە گوزەرانی ئاسایی کەسەکەی پێ بچێ بەڕێوە، نەوەك هەر ئەوەندە بێ کە بە کولەمەرگی پێی بژی).

٢- ژێواری کۆیلە، ژن بێ یان پیاو، پێویستە لەسەر خاوەنی کۆیلە، ژێوارێکی شایان دابین بکا بۆی، واتە: جێگەو بەرگو خواردنو خەرجی پێویستی تری بۆ مسۆگەر بکا.

٣- هەروەها پێویستە لەسەر خاوەنی ئاژەڵو وڵاخو زیندەماڵ، کەجێگەو ڕێگەی شیاویان بۆ مسۆگەر بکا، وەك گەوڕو تەویلەو کولانەو لەوەڕانو ئالیكو ئاودانو حەوانەوەو جلو کورتانو ناڵ.

٤- دەرمانو چارەسەرو پزیشك، بەپێی حاڵو بارودۆخ، بەشێکە لەژێوار، چی بۆ کەسوکار، چی بۆ کۆیلەو کەنیزەك، چی بۆ ئاژەڵو زیندەماڵ.

٥- ئەوەی بەپێی شەرعی خودا، ئەرکی خۆی جێبەجێ بکا، لەگەڵ ئەم سێ تاقمەدا، ئەوە پاداشی باشی خۆی لەلای خودا مسۆگەر دەکا، ئەوەی

ناهەقیان لێ بکا، مافی خۆیان نەداتێ، گوناهبارە، شایانی تۆڵەی لەبارە لەدوارۆژدا.

## ٧٢- باسی پەروەردەکردنی ساوا (حضانە)
## بابُ: الحَضَانَةِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٠٠و ٣٠١ + تاجول ئوصول، بەرگی دووەم لاپەڕە: ٥٨٧، زنجیرە: ٧٧ لە ژمارە: ٢٢٦٨وە هەتا ژمارە: ٢٢٧٠}.

١١٨٠- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ اِمْرَأَةً قَالَتْ: {يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ اِبْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً، وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً، وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءً، وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي، وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ، مَا لَمْ تَنْكِحِي"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.
{حسن، صحيح أبي داود: ١٩٩١}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەمم بەچەرمی سك نۆ مانگ هەڵگرتووەو بەشیری مەمکم گۆشم کردووەو لەکۆشما، بەدڵو بەداو پەروەردەم کردووە، ئێستایش باوکی تەڵاقی داوەو بەرەڵای کردووەو دەیەوێ بەزۆر ئەم جگەرگۆشەیەمم لێ بستێنێ، جا تۆ فەرمانت بەچییە؟

پێغەمبەریش پێی فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (تا شوو نەکەیتەوە تۆ لەپێشتری بەو کوڕە!). (تاج/٢، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ٢٢٦٨).

١١٨١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اِمْرَأَةً قَالَتْ: {يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي، وَقَدْ نَفَعَنِي، وَسَقَانِي مِنْ بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ فَجَاءَ زَوْجُهَا، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "يَا غُلَامُ! هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ، فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ" فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ، فَانْطَلَقَتْ بِهِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح، الإرواء: ٢١٩٣}:

لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ لەخزمـەتی پێغەمبـەردا بـووم (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئافرەتـێ هـات گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا! مێردەکـەم دەیـەوێ کوڕەکـەم ببـات، کوڕەکەیـشم بەکـەڵکم دێو لـەبیری ئـەبو عەینەبـە ئـاوی خواردنـەوەم بـۆ دێنـێ. پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: دەوی لێ بکـەن، تیروپـشکی لێ بکـەن، لـەنێوانی هـەردووکتانا، مێردەکەشی گـوتی: لەسـەر کـوڕی خـۆم کـێ دەتوانـێ گەرم تێ بئالێنێ؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی بەمناڵەکە:

(ئەمەیان باوکتەو ئەمەیان دایکتـە، بـەئارەزووی خـۆت ئـەی کوڕەکـە! دەستی کامیان دەگریت بیگرە).

ئەویش دەستی دایکی گرتو، ئیتر دایکەکەی بردی بۆ خـۆی. (تـاج/٢، زنجیرە: ٧٧، ژمارە: ٢٢٧٠).

١١٨٢- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ سِنَانٍ" {أَنَّهُ أَسْلَمَ، وَأَبَـتِ اِمْرَأَتُـهُ أَنْ تُـسْلِمَ. فَأَقْعَـدَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْأُمَّ نَاحِيَةً، وَالْأَبَ نَاحِيَةً، وَأَقْعَدَ اَلصَّبِيَّ بَيْنَهُمَـا. فَمَـالَ إِلَى أُمِّهِ، فَقَالَ: "اَللَّهُمَّ اِهْدِهِ". فَمَالَ إِلَى أَبِيهِ، فَأَخَذَهُ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّـسَائِيُّ، وَالْحَاكِمُ.

{صحيح أبي داود: ١٩٦٣}:

رافیعی کوڕی سینان (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: کەئیـسلام بـووم ژنەکەم قایل نەبوو کەئیسلام ببێ، جـا هاتـە لای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گـوتی کـچەکەمم دەوێ، منـیش عـەرزیمکرد: کـچ کـچی منـە، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەمنی فـەرموو: (تـۆ لـەم لایـەوە دانیشە) وە بەویشی فەرموو: (تۆیش لەملایەی ترەوە دانیشە).

ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کچۆڵەکەی لەنێوانمانا داناو فەرمووی پێمان: (دەی هەردووکتان بانگی بکەن، هەرکەسەتان بۆلای خۆی) جا کچۆڵەکە لاربۆوە بەلای دایکیداو ویستی بچێ بۆلای ئەو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اللَّهُمَّ اهْدِهَا: ئەی خودایە، ڕێنمایی بکەو ڕێگەی هەقی نیشان بدە) جا کچەکە بایدایەوە بەلای مناو هات بۆ لام‌و من بردم بۆ خۆم. (تاج/٢، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٢٣٦٧ ج/٤ = چاپی چوارەم).

(ڕوونکردنەوە):

رافیعی کوڕی سینان، هاوەڵە، کەسناوی ئەبولحەکەم بوو، برای معقیلی ئەشجەعییە، ئەنصارییە، لەهۆزی ئەوسە، لەدایکەوە باپیرەی عەبدولحەمیدی کوڕی جەعفەرە، جەعفەری کوڕی گێڕانەوەی لێیەوە ئەنجام داوە، ئەم کچەی ناوی عوومیرە.

١١٨٣- وَعَنْ اَلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَضَى فِي اِبْنَةِ حَمْزَةَ لِخَالَتِهَا، وَقَالَ: اَلْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ اَلْأُمِّ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری = پوختەی صحیحی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/٣، ژمارە: ١١٢٨ = ٢٦٩٩، ٢٧٠٠، ١٨٤٤، ٤٢٥١ بخاری. مختصر صحیح مسلم = پوختەی صەحیحی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٧٧ }:

ئەم فەرموودەیە دوورو درێژە، پوختەکەی ڕاگوێز دەکەم:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە، کە ناموسوڵمانەکان، ڕێگەی پێغەمبەرو هاوەڵانیان نەدا، کەبچن بۆ کردنی عەمرە، لەئەنجامدا خەڵکی مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێکەوتن لەسەر ئەوە: کە پێغەمبەرو یارانی ئەمساڵ کە ساڵی شەشی کۆچییە عەمرە نەکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ مەدینەو ساڵی ئایندە بێنەوە بۆ عەمرەو بچنە ناو مەککەوەو سێ ڕۆژ لەوێ بمێننەوە، بەو

مەرجـەی کـە چـەك و شمـشێرەکانیان بەکێلانـەوە لـەناو هەبگـەدا بـن، وە کەسـیش لەخـەڵکی مەککـە لەگـەڵ خۆیانـدا نەبـەن بـۆ مەدینـە، لـەکاتی گەڕانەوەدا، وە ئەگـەر کەسـێ لـەهاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) ویستی لەمەککە بمێنێتەوە، ڕێگەی پێ بدەن و ڕێگەی مانـەوەی لەمەککە لێ نەگرن!

حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەعـەلی کـوڕی ئـەبو طـالیبی فەرموو: (مەرجەکان لەنێوانمانا لەسەر ئەم شێوەیە بنووسە: بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيَم: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو ڕێکەوتن نامەیەیە، کـە موحەممـەدی پێغەمبـەری خـودا ڕێککـەوتووە لەسـەری........ ناموسـوڵمانەکان گوتیـان: ئێمـە ئەگـەر بـزانین کـە تـۆ پێغەمبـەری خودایـت، ئیـسلام دەبـین و شـوێنت دەکـەوین، کەواتـە شـتی وا نابـێ، بـەڵام بنووسـە (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا).

حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەعـەلی فـەرموو کـە وشـەی (پێغەمبەری خودا) بکوژێنێتـەوەو لەشوێنی ئـەوە وشـەی (کوڕی عەبـدوڵلا) بنووسێ، بەڵام عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نا، بـەخودا نایـسڕمەوە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) شوێنەکەیم پێ نیشان بـدە، مـن خـۆم دەیکوژێنمەوە، ئەویش جێگەکەی پێ نیشان دا.

جا پێغەمبەر خۆی (دروودی خـودای لەسـەر بێ) وشـەی (پێغەمبـەری خـودا)ی کوژانـدەوەو فـەرمانی بەعـەلی فـەرموو نووسـی: (ئەمـە ئـەو ڕێکەوتننامەیەیە، کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا لەگەڵ قوڕەیشدا، لەسەری ڕێککەوتوون...............تاد).

جـا لەسـاڵی ئاییـنـدەدا بـەپێی بەنـدەکانی ئـەم ڕێکـەوتن نامەیـە، پێغەمبـەرو هاوڕێیـانی هاتنـەوەو عـەمرەیان بـەجێ هێنـاو سـێ ڕۆژ لـەناو مەککەدا مانەوە، لەسەری ڕۆژی سێیەمدا، خەڵکەکە بەعـەلییان گـوت: بـەپێی

مەرجەکە، هاوڕێکەت ئەمڕۆ دواڕۆژیەتی، دەی پێی بڵێ: با بڕوات، عەلیش پێی گوت، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ باشە).

ئینجا پێغەمبەرو هاوەڵانی لەشار دەرچوونو بەرەو شاری مەدینەی نازدار کەوتنە ڕێ.

کچەکەی حەمزەی مامی پێغەمبەریش، کە حەمزە لەغەزای ئوحوددا شەهید بوو، بەمامە مامە شوێنیان کەوت، عەلیش پەلاماری داو دەستی گرتو دایە دەستی فاطیمەی هاوسەریو پێی گوت: ئەی فاطیمە! کچی مامەت بگرەو هەڵی بگرە.

جا عەلیو زەیدی کوڕی حاریثەو جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب لەسەر ئەم کچۆڵەیە، کەهی کامیانە، بوو بەکێشەیان: عەلی دەیگوت: کچی مامەمەو بەمن لەپێشترە، جەعفەریش دەیگوت: کچی مامەی منیشەو پوورەکەیشی ژنی منە، خوشکی دایکی خێزانی منە، زەیدیش فەرمووی: هی منە، چونکە بەپێی پەیمانامەی برایەتی بەستن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حەمزەی کردووە بەبرای من، کەواتە ئەم کچۆڵەیە برازای منەو هی خۆمەو من لەپێشترم بە پەروەردەکردنو بەخێوکردنی.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دا کە بەر پوورەکەی دەکەوێو شەرع دەیدا بەو، وە فەرمووی: (پوور لەجێگەی دایکە). وە بەعەلی فەرموو: (تۆ لەمنیو من لەتۆم). بەجەعفەریشی فەرموو: (تۆ هەم لەشێوەداو هەم لە ڕەفتاری بەرزدا لەخۆم دەکەیت). وەبە زەیدیشی فەرموو: (تۆ هەم برامانیو هەم دۆستی ئازادکراومانی!). (تاج/٤، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٤٥٥٤) + (ریاض/١، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٣٥).

١١٨٤- وَأَخْرَجَهُ أَحْمَدُ: مِنْ حَدِيثِ عَلِيٍّ (رضى الله عنه) فَقَالَ: {وَالْجَارِيَةُ عِنْدَ خَالَتِهَا، فَإِنَّ اَلْخَالَةَ وَالِدَةٌ}.

{صحيح الجامع: ١٣٤٧}.

لـه ژماره: (١١٨٣)دا، مەبەست لێی رابورد.

١١٨٥– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰـهِ (صَـلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ، فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تەجریـدی بوخـاری = مختـصر صـحيح البخـاری = پوختـەی صـەحیحی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٩٢ = ٢٥٥٧، ٥٤٦٠ بوخاری. مختـصر صـحيح مـسلم/٢، ژمارە: ٩٠٥ = شیحا/٤٢٩٣ = صحيح مسلم/١٦٦٣}:

ئـەبوهورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان نۆکەرەکەی نانی بۆ دانا، ئەگەر لەگەڵ خۆشی داینەنیشێنێ کە لەگەڵیدا بخوات، با پاروویێ دووپاروو، یان تیکەیێ دوو تیکەی لە خواردنەکەی پێ بدا، چونکە ئەو خۆی دروستی کردووەو ئەرکی پێوە کێشاوە، بێ ویژدانییە کەخۆی لێی نەخوا). (تـاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٣١ + ریاض/٣، ٢٣٧، ژمارە: ١٣٦١/٢).

١١٨٦– وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللّٰـهُ عَنْهُمَـا)" عَـنْ اَلنَّبِيِّ (صَـلّى الله عَلَيْـهِ وسَلّم) قَالَ: {عُذِّبَتْ اِمْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ، فَدَخَلَتِ اَلنَّارَ فِيهَا، لَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَسَقَتْهَا إِذْ هِيَ حَبَسَتْهَا، وَلَا هِيَ تَرَكَتْهَا، تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ اَلْـأَرْضِ} مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ.

{مختـصر صـحيح مـسلم/٤، ژمـارە: ١٥٠٣ = شـیحا ٥٨١٣ = ٢٢٤٢ + بخاری. بدء الخلق/٣٤٨٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ژنـێ لەسـەر پـشیلەیێ سـزا دراوە، پشیلەکەی بەند کردبوو، هـەتا لەبرسـانا مردبـوو، لـەو ماوەیـەدا نـەخۆی ئـاو نـانی پـێ دابـوو، وە نەبـەرەڵای کردبـوو هـەتا بۆخـۆی ملۆمووشـێ بکـاو لەجرِوجانەوەری ناو زەوی بخوات، لەسـەر ئـەوە خـودا ئـەو ژنـەی خـستە نـاو

ئاگری دۆزەخەوە). (ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠٠ + تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٦٣).

## ١٠- نامەی تاوانکاریەکان
## كِتَابُ الجِنَايَاتِ

**٧٣- بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٨٣٠، زنجیرە: ٣٠٢.**

١١٨٧- عَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّمَ): {لَا يَحِلُّ دَمُ اِمْرِئٍ مُسْلِمٍ" يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلّا اَللّٰهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اَللّٰهِ، إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: اَلثَّيِّبُ اَلزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ" اَلْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{مختصر صحيح البخارى = تجريد البخارى = پوختەی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٦ = ٦٨٧٨ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٢٣ = شيحا: ٤٣٥١ = مسلم ١٢٧٦. أبوداود. حدود: ٤٣٥٢. ترمذى. ديات: ١٤٠٣. نسائى. تحريم الدماء/٤٠٣٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ شایەتمان بهێنێو بڵێ: أَشْهَدُ أَنْ لاإِلـه إِلاَّ اللّـه وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰهِ، بەدڵ باوەڕ دەکەمو بەزمان دەڵێمو شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو بەس، خودای تر نییە، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایش پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خوایە). هەرکەسێ ئەم شایەتییە بدا، ئیتر ئەوە موسوڵمانەو خوێنی ئەو کەسە حەرامەو بەهیچ شێوەیێ خوێنی بەکەس ڕەوا نابێ، مەگەر لە یەکێ لەم سێ کاتەدا نەبێ:

یەکەم: بێوەی داوێنپیس، چ ژن بێ، چ پیاو.

دووەم: کەسێ بەناڕەوا کەسێ بەقەستی بکوژێ.

سێیەم: موسوڵمانێ لەئایینی خۆی وەرگەڕێ‌و لەکۆمەڵەی موسوڵمانان تەرا ببێ!. (تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٢٣٣٥ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٢٠ چاپی تاران، لاپەڕە: ٨٧٨).

١١٨٨- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم) قَالَ: {لَا يَحِلُّ قَتْلُ مُسْلِمٍ إِلَّا فِي إِحْدَى ثَلَاثِ خِصَالٍ: زَانٍ مُحْصَنٌ فَيُرْجَمُ، وَرَجُلٌ يَقْتُلُ مُسْلِمًا مُتَعَمِّدًا فَيُقْتَلُ، وَرَجُلٌ يَخْرُجُ مِنْ اَلْإِسْلَامِ فَيُحَارِبُ اَللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَيُقْتَلُ، أَوْ يُصْلَبُ، أَوْ يُنْفَى مِنْ اَلْأَرْضِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح سُنَنُ النَّسَائِي: ٤٢٤٣}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەم سێ بارو دۆخەدا نەبێ، دروست نییە موسوڵمان بکوژرێ:

یەکەم: داوێنپیسی موحصەن (بڕوانە: ١١٣٤).

دووەم: پیاوێ موسوڵمانێ، بەقەستی، بەبێ مەهانەی ڕەوا بکوژێ‌و بەناڕەوا خوێنی بڕێژێ، ئەویش لەباتی ئەو دەکوژرێتەوە.

سێیەم: پیاوێ لەئایینی ئیسلام هەڵ بگەڕێتەوەو شەڕ لەگەڵ خوداو پێغەمبەردا بکا، ئەوە پێشەوای موسوڵمانان خۆی سەرپشکە بەپێی بەرژەوەندی گشتی لەیەکێ لەم سێ تۆڵەیەدا:

١- بەشیرو بەتیرو بەچەك بیکوژێ.

٢- بکرێ بەداراو لەسێدارە بدرێ.

٣- سوپای ئیسلام بنیشێتە سەری‌و شار بەشار هەڵیفڕێنێ تا دەیگرێ‌و دەیکوژێ.

١١٨٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ اَلنَّاسِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ فِي اَلدِّمَاءِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{مختصر صحيح البخاری/٥، ژماره: ٢٠٣١ = ٦٥٣٣، ٦٨٦٤ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ١٠٢٢ = صحيح مسلم، ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٤٣٥٧ = ترقيم صحيح مسلم لمحمد فؤاد عبدالباقی/١٦٧٨. ترمذی. ديات: ١٣٩٦. نسائی. تحريم الدم: ٤٠٠٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەتدا، یەکەم شت کە ئادەمیزاد، دادگایی دەکرێ لەسەری: پرسی خوێن ڕشتنو مرۆڤ بەناڕەوا کوشتنە). (تاج/٣، زنجیرە: ٨١، لاپەڕە: ٤، ژمارە: ٢٢٨٨ + ریاضی صالحین/٤، لاپەڕە: ١٣٣٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٤٥/٣٨).

١١٩٠- وَعَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَهُوَ مِنْ رِوَايَةِ اَلْحَسَنِ اَلْبَصْرِيِّ عَنْ سَمُرَةَ، وَقَدْ اُخْتُلِفَ فِي سَمَاعِهِ مِنْهُ. وَفِي رِوَايَةٍ لِأَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ: {وَمَنْ خَصَى عَبْدَهُ خَصَيْنَاهُ}. وَصَحَّحَ اَلْحَاكِمُ هَذِهِ اَلزِّيَادَةَ.

{ضعيف، المشكاة: ٣٤٧٣}:

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ کۆیلەی خۆی بکوژێ لەتۆڵەی ئەوەدا ئێمەیش کە کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلامین ئەو بکوژە دەکوژینەوە، وەهەرکەسێ لووتی بەندەی خۆی ببڕێ، ئێمەیش لووتی ئەو دەبڕینەوە!).

(ڕوونکردنەوە):

آ- حەسەنی بەصری تابیعی‌یە، لەپەیڕەوانە، زانایەکی زۆر ناودارو ناسراوە، حەسەن زۆر لەهاوەڵانی پێغەمبەری دیوە، وەك عەلی‌و طەلحەو عائیشە، ناسراوە بە (حەسەنی بەصری) چونکە لەبەصرە نیشتەجێ بوو، لەپێش مەرگی ئیمامی عومەردا، بەدوو ساڵ لەدایك بووە، پیاوێکی زمانپاراوی ڕەوانبێژی قسەنەستەقی قسەزان بوو، کاتێ باسی ڕۆژی دوایی دەکرد، لەتۆ وایە کە شتەکان بەچاوی خۆی دەبینێ‌و باسیان دەکا.

زانایەکی شەرعزانی گەورە بوو، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەفەرموێ: دە ساڵ، ڕەنگبێ زیاتریش، بەگەرمی هاموشۆی کۆڕی زانستی حەسەنی بەصریم دەکرد، ڕۆژ نەبوو کەشتێکی نوێی لێ نەبیستم!!

ئەبو جەعفەر، واتە: ئەلباقیر، دەفەرموێ: (فەرمایشتی حەسەن ڕێك لە فەرمایشتی پێغەمبەران دەکا!).

موحەممەدی کوڕی ئەسعەد دەفەرموێ: (حەسەن کەسایەتییەکی مەوسووعی بوو، دەتگوت دەریای ئۆقیانووسە: زانا بوو، دانا بوو، شەرعزان بوو، متمانە بوو، خواپەرستێکی سۆفیلکە بوو، زۆر زۆر زانا بوو، قسەڕەوان‌و جوان خاس‌و قۆزو شۆخ بوو).

عەبدوڵڵای کوڕی، دەفەرموێ: باوکم کە مەرگ بوو بەمیوانی، تەمەنی لەدەوری هەشتاو هەشت ساڵیدا بوو، دوو حەجی کردووە، ئەمەیش کۆمەڵێ زانیاری گرنگە سەبارەت بەژیانی شێخ حەسەنی بەصری، بەڕێز دەیاننووسین بەئومێدی پیت‌و فەڕو بەهرەو سوودیان بۆ هەمووان:

١- ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) نزای باشی بۆ کردووە.

٢- ناوی حەسەنی کوڕی یەسارە، نازناوی (حەسەنی بەصری‌یە) کەسناوی (کونیەی) أبو سعیدە: باوکی سەعید.

٣- دایکــی نــاوی خەیرەیــە، ئــازادکراوی ئوممــو ســەلەمەی هاوســەری پێغەمبەر بوو، بەردەوام خزمەتی حەزرەتی ئوممو سەلەمەی دەکرد، هەموو جارێ کەئوممو سەلەمە، دایکی حەسەنی دەنارد بۆ کارێ، کە حەسەن دەگریا، ئوممو سەلەمە، مەمکی خۆی دەنایە سەر دەمی، دەهاتە شیر بۆیو دەیمژیو بەوە ژیری دەکردەوە. زۆرجار ئوممو سەلەمە حەسەنی دەبرد بۆ ناو هاوەڵانی پێغەمبەر، ئەوانیش نزای باشیان دەکرد بۆی!

٤- عومەر ئەم نزایەی بۆ کردووە {اللمَّ فَقِههُ فِي الدِّين، وحَبِّبْهُ إلَى النَّاسِ: ئەی خودایە! شارەزای ئایینی بفەرموو، وە لەناو خەڵکا خۆشەویستی بکە!} .

٥- ئەو کۆمەڵە رەفتارو رەوشتە جوانانەی کە لەحەسەندا کۆبوونەوە، بەقسەی زانایان، لەپیتو فەری نزای هاوەڵانەوە بووە، لەگەڵ پیتو فەری شیری دایکە ئوم سەلەمە خاتوون!

٦- حەسەن مەلایەکی گەورە بوو، هەروەك خواناسێکی کەم مانەند بوو، سۆفیلکە بوو، شێوەیەکی رێکوپێکی زۆر جوانی هەبوو، زۆر گرنگی بەپاكو پوختەیی دەدا، هەتا بڵێی زاهدو وارعو عابدو ناسك بوو.

٧- جلو بەرگی شایانی لەبەر دەکرد، لەزستانا کەواو حیبرەو طەیلەسانی کوردیو مێزەری رەشی دەپۆشی.

٨- ریشی خۆی بە بۆیەی زەرد زەرد دەکرد.

٩- خواپەرستییەکی زۆر جوانی دەکرد.

١٠- دوو حەجی کردووە.

١١- رۆژووی ئەییامولبیضی لەهەموو مانگێ دەگرت، کەبریتین لەو رۆژانەی کە شەوەکانیان تابەیانی مانگە شەون، کەسیازدەو چواردەو پازدەی مانگن، هەروا هەموو هەفتەیێ دوو شەممەو پێنج شەممە بەرۆژوو دەبوو، وە مانگە حەرامەکانیش کەناسراون بە (أشهرالحرم) بەرۆژوو دەبوو.

١٢- گەرچی حەسەنی بەصری زاهیدو ناسكو عابیدو دڵنەرمو چاوتەڕ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا پاكخۆر بوو، میوەی دەخوارد، خزمەتی لەشی خۆی دەكرد، جلی جوانی ڕێكوپێكی دەپۆشی، وەهەروا پیاوێكی ئازاو دلێرو پاڵەوان بوو، بەسەختیو دلێرانە دەجەنگی لەگەڵ ناموسوڵمانەكاندا.

١٣- مرۆیەكی خەمباری خەفەتبار بوو، هەمیشە پەستو خەماوی بوو، كە بەخزمەتی دەگەیشتیت لەتۆ وایە كەتازە تووشی چورتومێ بووە، یاكێشەیەكی گەورەی هەیە.

١٤- زۆر كەم پێ دەكەنی، وە زۆر بەكەمی سوعبەتی دەكرد، وە زۆر دەگریاو زۆرینەی كات چاوی تەڕ بوو، فرمێسكی وشك نەدەبۆوە، بەشەو هەر خەریكی شەونوێژو پەرستش بوو، زۆر كەم دەخەوت!

١٥- شارەزایەكی چاكی لەم زانستانەدا هەبوو:

١٦- لەزانستی تەفسیردا، ڕاوبۆچوونی جوان جوانی هەیە، لەبارەی ڕاڤەو واتای زۆر شوێن لە قورئانی پیرۆزدا، لەم ڕوانگەوە دادەنرێ بەئیمامو پێشەوا لەبابەتی تەفسیردا، زۆر لەتەفسیر نووسەكانی قورئان، ڕاوبۆچوونەكانی ئەو ڕاگوێز دەكەن، لەكاتی پەندو ئامۆژگاریدا، تەفسیرو ڕاڤەو واتای ئایەتەكانی تێكەڵی وتارەكەی دەكرد.

١٧- لەزانستی فەرموودەدا دەستێكی باڵای هەبوو، گێڕانەوەی زۆری مەرفووعو مورسەلی هەیە، بەڵام دانراوی لە فەرموودەدا نییە، چونكە لەسەردەمی ئەودا هێشتا فەرموودە لەتۆمارگەدا دانەدەنرا، فەرموودەی لەچەند زاتێكەوە لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووەو گێڕاویەتەوە، وەك ئەنەسو سەمموورەی كوڕی جوندوب.

١٨- ڕاوبۆچوونە فیقهییەكانی، زۆر لەزانا گەورەكانی فیقەو شەرع بۆچوونەكانی حەسەنیان، لەپەڕاوە فیقهییەكانی خۆیاندا ڕاگوێز كردووە.

رای وابوو کە درووستە پارە بدرێ لەباتی سەرفترە، مەرج نییە کە هەر خۆراك بێ.

دەیفەرموو: ناشتنی مردوو بەشەو بەبێ مەهانەی ڕەوا ناباش‌و ناپەسەندە. دەیفەرموو: دروستە موسوڵمان ببێ بەهاوبەشی گاورو جوولەکە لەبازرگانیدا. دەیفەرموو: دروستە کرێگر بەکرێگیراوی خۆی بداتەوە بەکرێ، وەك ئەوە: سەردار دووکانێ لەبەختیاری خاوەنی دووکانەکە دەگرێ بە (١٠٠) سەد دینار، بۆ سەردار هەیە ئەو دووکانە بەکرێ بدا بە فەرهاد، بە دوو سەد دینار. دەیفەرموو: (تەڵاقی سەرخۆش دەکەوێ ئەمە ڕاوبۆچوونی جەماوەری زانایانە، گەرچی بەلای شێخی ئیبنو تەیمییەوە تەڵاقی سەکران (سەرخۆش) ناکەوێ، چونکە لایەنێکی بێ تاوان هەیە لەم بابەتەدا کە ژنەکەیە.

١٩- گەلێ جار ئەنەسی کوڕی مالیك دەیفەرموو: (لەحەسن بپرسن، چونکە ئەو شتەکانی لەبەر کردووە بەڵام ئێمە لەیادمان نەماوە!).

٢٠- حەسەن، لەکاتی سەرەمەرگا، هەر خەریکی (إِنَّا لِلهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) بوو. کەمێ بوورایەوە، کە بەئاگایان هێنایەوە، فەرمووی: (بە خەبەرتان کردمەوە لەناو باخ‌و بۆلاخ‌و کانیاوو گوڵ‌و گوڵزاردا بووا).

لەپێش مەرگی حەسەندا، پیاوێ بەئیبنو سیرینی فەرموو: لەخەوما باڵندەیێ، جوانترین چەوی مزگەوتەکەی برد؟ ئیبنو سیرین فەرمووی: (ئەگەر (ڕاست بکەی حەسەنی بەصری دەمرێ) وە خۆی وابوو، کەمێ لەوە دوا حەسەن مرد. حەسەن لەشەوی هەینیدا، لەسەرەتای مانگی رەجەبی (١١٠) سەدو دەی کۆچی مەرگ بوو بەمیوانی، وەك کوڕەکەی دەفەرموێ: (٨٨) هەشتاو هەشت ساڵ ژیاوە. خەڵکێکی زۆر ئامادەی بەڕێکردنی تەرمەکەی بوون، لەپاش نوێژی هەینی لەبەصرە نوێژی تەرمی لەسەر کرا.

ب- دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە کە حەسەنی بەصری لە سەمورەی جوندوبەوە دەیگێڕێتەوە، گەرچی ئیمامی

تەرمــەزی بەحەســنی دانــاوە، بــەڵام ڕاجیــایی هەیــە لــەوەدا، کــە حەســەن گێڕانەوەی لە سەموورەوە هەبێت.

ج- لەگێڕانەوەی ئەبو داوودو نەسائیدا ئەمەی پترە:

(وە هەر کەسێ کۆیلەی خۆی بخەسێنێ، ئێمـەیش لەتۆڵـەی ئـەوەدا ئـەو دەخەسێنینەوە!).

(ڕوونکردنەوە):

هەندێ لەخاوەنی بەندەو کۆیلەکان، لەسەردەمی نـەزانیو لەپاشـتریش، دەچوون کۆیلەی خۆیان دەخەساند، یان گەڵو گونیـان دەبـڕین، نـەبادا تـەماع بکاتە ژنو کەنیزەکەکانی، جا هۆی هاتنی ئـەم فەرموودەیـە، هەڕەشـە کردنـە لەو جۆرە کارە زۆر دزێوو ناپەسەندانە.

١١٩١- وَعَنْ عُمَرَ بْنِ اَلْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {لَا يُقَادُ اَلْوَالِدُ بِالْوَلَدِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْجَارُودِ وَالْبَيْهَقِيُّ، وَقَالَ اَلتِّرْمِذِيُّ: إِنَّهُ مُضْطَرِبٌ.

{صحيح الجامع: ٧٧٤٤}:

عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبـەرم بیـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (باوك ئەگەر منالّی خۆی بکوژێ لەتۆڵەی ئەوەدا ناکوژرێتەوە!).

ئەحمــەدو تەرمــەزیو ئیبنــو ماجــە گێڕاویانەتــەوە، ئیبنولجــاروود بەتەندروسـتی دانـاوە، هـەروا بەیهـەقی، بـەڵام تەرمـەزی دەڵـێ: ڕشـتەکەی شلّەژاوە، واتە: موضطەریبە.

١١٩٢- وَعَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: {قُلْتُ لِعَلِيّ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: هَلْ عِنْـدَكُمْ شَيْءٌ مِنْ اَلْوَحْيِ غَيْرَ اَلْقُرْآنِ؟ قَالَ: لَا وَاَلَّذِي فَلَقَ اَلْحَبَّةَ وَبَرَأَ اَلنِّسْمَةَ، إِلَّا فَهْمٌ يُعْطِيهِ

اَللَّهُ رَجُلًا فِي اَلْقُرْآنِ، وَمَا فِي هَذِهِ اَلصَّحِيفَةِ. قُلْتُ: وَمَا فِي هَـذِهِ اَلـصَّحِيفَةِ؟ قَـالَ: "اَلْعَقْلُ، وَفِكَاكُ اَلْأَسِيرِ، وَلَا يُقْتَلُ مُسْـلِمٌ بِكَافِرٍ} . رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمـارە: ١٢٤٢ = ٣٠٤٧، ١١١، ١٨٧٠، ٣٠٤٧، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٦٩٠٣، ٦٩١٥، ٧٣٠٠}:

ئـەبو جوحەیفـە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بەپێشەوا عـەلیم گـوت: ئێـوە کـە خانــەوادەی پێغەمبــەرن (دروودی خــودا لەســەر خــۆیو خانەوادەو بنەماڵەی بێ). ئایا هیچ نامەو نووسـراوو سرووشـێکی تایبـەتیتان لەلا هەیە، کە لەلای خەڵکی تر نەبێ، وەك هەندێ کەس ئەم داوایە دەکەن؟

فەرمووی: عەلی لە وەلاما فەرمووی: (بەو کەسـە کـە تۆمـە دەتـەقێنێو دەیڕوێنـێو، بـەو کەسـە کەهـەموو گیانلەبـەرانی لەنـەبوون دروسـت کـردووە، شتی وامان لەلا نییە، جگە لـە قورئـان کەنامـەی خودایـە، کـە ئـەویش لـەلای سەرجەمی موسوڵمانان هەیە، مەگەر تێگەیشتنو فەهمێ باش، کەخودا دەیـدا بە بازێ موسوڵمان، کە بەجوانی لە قورئان تێ دەگا، لەگەڵ ئەمەیش کەوا لەم تۆمارەدا نووسراوە).

گـوتم: باشـە ئـەم تۆمـارە چـی لێ نووسـراوە؟ عـەلی فـەرمووی: (باسـی چۆنێتی خوێندانو ئەنـدازەو چەشـنی خوێنبـاییو باسـی سـەرانەو بارمتـەی دیــلو ئــەو بڕیــارە شــەرعییەیش: کــە موســوڵمان لــەباتی موســوڵمان ناکوژرێتەوە!). (تاج/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١١٧).

(ڕوونکردنەوە):

١- لـەلای جـەماوەری زانایـانی یاسـانامەی خـودا، لـەهیچ بارودۆخێکـا، موسـوڵمان لـەجیاتی ناموسـوڵمان ناکوژرێتـەوە، بـەڵام ئـەوە واتـای وانییـە، کـەدونیا بـێ حاکمـەو هـەر موسـوڵمانێ بـۆی ڕێکـەوت بەهـەقو ناهـەق ناموسوڵمانێ بکوژێ، شتی وا نییە، چونکە ناموسوڵمانیش مـافی خـۆی هەیـە، زوڵـمو زۆرو ناهـەقی لێـی، وەك زوڵـمو زۆرو ناهـەقی وایـە لـە موسـوڵمان،

بەمەرجێ ئەو ناموسوڵمانە لەشەڕدا نەبێ لەگەڵ ئێمەداو خاوەن پەیمانو دالّدەدراو بێ، ئەویش بەپێی ئەم فەرموودەیە چەسپاوە کە دەفەرموێ: {لَهُمْ مَالَنَا وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَيْنَا} واتە: چی مافێ بۆ ئێمەی موسوڵمان هەیە، هەمان ماف بۆ ناموسوڵمانیش هەیە بەمەرجی خۆی، وە هەروەها چی ئەرکو مافێ لەسەر ئێمەی موسوڵمان هەیە هەمان ئەرکو مافیش لەسەر ناموسوڵمانیش هەیە بەمەرجی خۆی!).

٢- لەلای حەنەفییەکان، لەچەند دۆخێکا موسوڵمان لەجیاتی ناموسوڵمان دەکوژرێتەوە، وەك ئەوە ناموسوڵمانە کوژراوەکە پەنادار (ذیمی) بێت، پەنادار ئەو هاوڵاتییە ناموسوڵمانانەیە، کە لەسێبەری پەنای دەوڵەتی ئیسلامدا دەژینو پابەندن بە ئەرکی سەرشانی خۆیان، بەڵام لەباتی بێباوەڕی جەنگی، کەپێی دەگوترێ: کافری جەنگی موسوڵمان ناکوژرێتەوە.

(هەقایەتێ):

دەڵێن: جارێ موسوڵمانێ ناموسوڵمانێ دەکوژێ، بۆ دادگایی دەیبەن بۆ خزمەتی ئەبو یوسف، کە یەکێکە لە شاگردە گەورەکانی ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودایان لێ بێ) ئەبو یوسف بڕیاردەدا کە موسوڵمانەکە لەجیاتیی بێبڕواکە بکوژرێتەوە، جا پیاوێ کاغەزێکی بۆ دەبا، ئەم شیعرانەی تیا دەنووسرێ:

يَاقَاتِــــــلَ الْمُــــــسْلِمِ بِالْكَــــــافِرِ
جُــــرْتَ، وَمَـــا العَــــادِلُ كَالجَـــائِرِ
يَــــا مَــــنْ بِبَغْــــدَادَ وَأَطْرَافِهَــــا
مِــــنْ فُقَهَــــاءِ النَّــــاسِ أَوْ شَــــاعِرِ
جَــــارَ عَلَــــى الــــدِّينِ أَبُــــو يُوسُــــفَ

فَاسْتَرْجِعُوا وَابْكُوا عَلَى دِينِكُمْ
وَاصْطَبِرُوا فَالْأَجْرُ لِلصَّابِرِ

واته:

لەحیاتی کافر دەکوژی موسوڵمان
کەی ئەوە دادە؟ ئەی خاوەن ویژدان!
ئەی خەڵکی بەغدا، ئەی خەڵکی جیهان!
لەمەلای زاناو لە شاعیری جوان!
وا ئەبو یوسف دینتانی فەوتان!
لەحیاتی کافر، دەکوژێ موسوڵمان
(إنّا لِلّه)کەن، بگرین بۆ دینتان
پاداشی خۆگر، وا لەلای یەزدان!

١١٩٣- وَأَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ: مِنْ وَجْهٍ آخَرَ عَنْ عَلِيّ وَقَالَ فِيهِ: {اَلْمُؤْمِنُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ، وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، وَلَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ} . وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.
{صحيح، المشكاة: ٣٤٧٥}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمانان لەناو خۆیانا یەکسانن وەك ددانی شانە، کەسیان لەکەسیان زیاترنین و خوێن و سەریان لەناو خۆیاندا هاوتای یەکترین.

دەبێ موسوڵمانان لەناو خۆیانا یەك دڵ و یەك دەست بن و دەشێ پشتی یەکتری بگرن و یاریدەی یەکتری بدەن و لەدژی ئەوانەی کە لەملەتی خۆیان نین یەك بگرن!

لەهەمان كاتـا: خـوارینترین كەسـیان، مـافی ئـەوەی هەیـە كـە ئامـانو پەیمان بدا بەهەركەسێ، كە خۆی بیەوێ ئامانی پێ بـدات، وەنابـێ موسـوڵمان لەجیاتی ناموسـوڵمان بكوژرێتـەوە، وە هـەروەها نابـێ پەیمانـدار بكوژرێ، كـە ئـەو جـۆرە كەسـانەن لەلایـەنی موسـوڵمانانەوە ئـەمانو پـەیمانیان پـێ دراوە، بەمەرجێ پەیمانەكە مابێ لەنێوانا).

(ڕوونكردنەوە):

ناموسوڵمان ئەم چوار جۆرەیان هەیە:

یەكـەم: ئـەهلی نیممـە، كـە ئـەو هـاو وڵاتـیـیانـەن لـە وڵاتـی ئیـسلامدا دەژینو پابەنـد ئەبن، بە ئەركی سەرشانی خۆیان بەرابەر بە وڵاتو نیشتمان، ئەمانە هاووڵاتییەكی ئاسایین. (اهل الذمة: پەنادار).

دووەم: موعاهەد: هـاووڵاتی دەوڵـەتێكی ناموسـوڵمان كـە لەگـەڵ ئێمـەدا لـەبارودۆخی ئاشـتیدا بـنو هـیچ كێـشەیەك لەگـەڵ ئێمـەو ئەوانـدا نـەبێ. (موعاهەد: پەیماندار).

سێیەم: ناموسوڵمانێ كە سەر بەدەوڵەتێكی تر بێ، كە دەوڵـەتی ئیـسلام ڕێگەی پێ دابێ لەناو وڵاتی ئێمەدا بژیو كاری خۆی ئەنجام بدات، بەم جۆرە ناموسـوڵمانە دەگـوترێ: موسـتەئمەن، وەك: سـەفیرو بـاڵوێزو بازرگـانو مامۆستاو پسپۆڕانی بوارەكانی تری ژیان. (موستەئمەن: ئەماندار).

چوارەم: كافری حەربی = ناموسوڵمانی جەنگی.

١١٩٤- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ جَارِيَةً وُجِدَ رَأْسُـهَا قَـدْ رُضَّ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَسَأَلُوهَا: مَنْ صَنَعَ بِكِ هَذَا؟ فُلَانٌ. فُلَانٌ. حَتَّـى ذَكَـرُوا يَهُودِيًّـا. فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَأُخِذَ اَلْيَهُودِيُّ، فَأَقَرَّ، فَأَمَرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریـــدی بوخـــاری/٣، ژمـــارە: ١٠٥٣ = ٢٤١٣، ٢٧٤٦، ٥٢٥٩، ٦٨٧٦، ٦٨٧٧، ٦٨٧٩، ٦٨٨٤، ٦٨٨٥ بوخـاری. مختـصر صـحیح مـسلم/٢،

ژماره: ١٠٢٨ = شيحا ٤٣٤١. ترمذى. ديات: ١٣٩٤. نسائى. قَسَامَة: ٤٧٥٦. ابن ماجة. ديات: ٤٧٥٦. تحفة الأشراف: ١٣٩١}:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی جوولەکە، لەسەر هەندێ خشڵ، لەنێوانی دوو بەرددا سەری کچۆڵەیەکی ئەنصاری شکاندبوو، لەپاشا تووڕی دابووە ناو بیرێکەوە، کاتێك کچۆڵەکە دۆزرایەوە هێشتا نیوەگیانێکی تیادا مابوو، جا لێیان پرسی: کێ وای لێ کردوویت؟ ئایا فیسارە کەس بوو؟ ئایا ئەم بوو؟ ئایا ئەو بوو؟ تا ناوی کابرایەکی جوولەکەیان هێناو گوتیان: ئایا فیسارە جوولەکە وای لێ کردوویت؟

ئەویش سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی کرد: ئائەو وای لێ کردووم، جا کابرای جووەیان هێناو، پێی لەتاوانی خۆی ناو ددانی بەکارەکەدا ناو چووە ژێری‌و گوتی: من ئەم کچۆڵەیەم کوشتووە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی‌دا، لەنێوانی دوو بەرددا سەری ئەویشیان شکاندو لەباتی کچۆڵە ئەنصارییەکە کوشتیانە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٢٣٠٢. ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١١٩٥- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ غُلَامًا لِأُنَاسٍ فُقَرَاءَ قَطَعَ أُذُنَ غُلَامٍ لِأُنَاسٍ أَغْنِيَاءَ، فَأَتَوا النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمْ يَجْعَلْ لَهُمْ شَيْئًا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالثَّلَاثَةُ، بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ.

{صحيح، سُنَنُ أَبِي دَاوُدَ: ٤٥٩٠}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ کوڕێکی هەرزەکاری کۆمەڵێ خەڵکی هەژار، گوێچکەی کوڕێکی هەرزەکاری کۆمەڵێ خەڵکی دەوڵەمەند دەبڕێ‌و دەیقرتێنی، بۆ دادگایی هاتن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هیچی نەدانێ لەباتی گوێ بڕاوەکە).

**١١٩٦- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ" (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) {أَنَّ رَجُلًا طَعَنَ رَجُلًا بِقَرْنٍ فِي رُكْبَتِهِ، فَجَاءَ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَقَالَ: أَقِدْنِي. فَقَالَ: "حَتَّى تَبْرَأَ". ثُمَّ جَاءَ إِلَيْهِ. فَقَالَ: أَقِدْنِي، فَأَقَادَهُ، ثُمَّ جَاءَ إِلَيْهِ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! عَرِجْتُ، فَقَالَ: "قَدْ نَهَيْتُكَ فَعَصَيْتَنِي، فَأَبْعَدَكَ اَللَّهُ، وَبَطَلَ عَرَجُكَ". ثُمَّ نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) "أَنْ يُقْتَصَّ مِنْ جُرْحٍ حَتَّى يَبْرَأَ صَاحِبُهُ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَأُعِلَّ بِالْإِرْسَالِ.**

**{صحيح الإرْوَاء: ٢٢٣٧}:**

**عەمری کوڕی شوعەیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، فەرمووی: پیاوێ بەشاخی ئاژەڵێ، ئەژنۆی پیاوێکی تری زامارکرد، کابرای زامار هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: هەقم بۆ بستێنە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (با چاك ببێتەوە، ئەوسا تۆڵەت بۆ لێ دەستێنم، ئەو چی لەتۆ کردووە ئاوای لێ دەکەینەوە بەبێ کەم‌و زۆر) کە بەم کردارە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ (قەوەد = تۆڵەسەندن). کابرای زامار ڕۆیشت، بەڵام پێش ئەوەی کە بەتەواوی چاك ببێتەوە هاتەوە بۆ لای پێغەمبەرو داوای لێکردەوە کە تۆڵەی لە کابرای تاوانبار بۆ بستێنێ، پێغەمبەریش تۆڵەی بۆ سەند لەکابرای تاوانکار. بەڵام پاش ماوەیێ کابرای زامار هاتەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەهۆی ئەو دەستدرێژییەی کابراوە شەل بووم، تۆڵەی ئەم شەلییەیشم بۆ بستێنە لێی. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (من پێم گوتی چاوەڕوان بکە هەتا بەتەواوی چاك دەبێتەوە، ئەوسا تۆڵەت بۆ دەستێنم، بەڵام تۆ پەلەت کردو بەگوێت نەکردم، لەبەرئەوە خودا ڕێگەی ئەوەی نەداوی کە تۆڵەی شەلییەکەتت بۆ بستێنرێ‌و شەلییەکەت پووچەو خوێنی نییەو بێ تۆڵەیە!).**

جا لەپاش ئەم رووداوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا کە تۆڵەی زام‌و برین بستێنرێ، هەتا زامەکەی چاك نەبێتەوە).

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەحمەدو دارە قوطنی گێڕاویانەتەوە، وە عیللەی ئیرسالی واتیادا.

١١٩٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {اِقْتَتَلَتِ اِمْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا اَلْأُخْرَى بِحَجَرٍ، فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَضَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا: غُرَّةٌ" عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ، وَقَضَى بِدِيَةِ اَلْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا. وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ. فَقَالَ حَمَلُ بْنُ اَلنَّابِغَةِ اَلْهُذَلِيُّ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! كَيْفَ يَغْرَمُ مَنْ لَا شَرِبَ، وَلَا أَكَلَ، وَلَا نَطَقَ، وَلَا اِسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ اَلْكُهَّانِ"" مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ اَلَّذِي سَجَعَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٨٦ = ٥٧٥٨، ٥٧٥٩، ٥٧٦٠، ٦٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٣٢ = شيحا ٤٣٦٧ = ١٦٨١ مسلم. أبو داود. ديات: ٤٥٧٦. نسائي. قسامة: ٤٨٣٣. تحفة الأشراف/١٣٣٢}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دووژنی هوزەیلی بوو بەشەڕیان، یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریان‌و، خۆی‌و سکەکەی کوشت، جا کەبۆ داخوازی‌و دادگایی، دادیان بردە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا: کەخوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ کۆیلە، ئیتر ئەو کۆیلەیە بەندەبێ، یا کەنیزەك بێ دەبێ، وە بڕیاریشیدا کە خوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی کۆرپەلە لەبارچووەکەی، لەسەر خوێنڕەسانی ژنە تاوانبارە بکوژەکەیە، نەوەك لەسەر ژنەکە خۆی، وە کەلەپووری ژنە کوژراوەکەیشی دا بەمناڵەکانی‌و بەخزمەکانی تری، جا حەمەلی کوڕەزای نابیغەی هوزەیلیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من چی ببژێرم‌و خوێنی

چی بدەم، ئەم ئاوەڵەیە کە لەسکی دایکیدا کوژراوە، نەچەشکەی نان و ئاوی کردووە، نە ورتەی لەدەم دەرچووە، نە نقەی لێوە هاتووە، شتی وا خوێنی نییە!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە بەم قسە قوتانەیدا وادەردەکەوێ کە لەدەستەی کوڵەنانی و کاهینانە). {تاج/٣، ژمارە: ٢٣٢٢، زنجیرە: ٨٤ چ/٤}.

١١٩٨– وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ: مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عَبَّاسٍ " أَنَّ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) سَأَلَ مَنْ شَهِدَ قَضَاءَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فِي اَلْجَنِينِ؟ قَالَ: فَقَامَ حَمَلُ بْنُ اَلنَّابِغَةِ، فَقَالَ: كُنْتُ بَيْنَ اِمْرَأَتَيْنِ، فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا اَلْأُخْرَى... فَذَكَرَهُ مُخْتَصَرًا. وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أبو داود/٤٥٧٢. نسائي في الكبرى/٦٩٩١}:

ئەبو داوودو نەسائی، لەڕێگەی فەرموودەی ئەبو عەبباسەوە دەگێڕنەوە: کە عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم پرسیارەی کرد: کێ ئامادەی ئەو بڕیارەی پێغەمبەر بووە، کە لەبارەی لەباربردنی سکی ژنەوە بووە؟ فەرمووی: حەمەلی کوڕی نابیغە هەڵسا فەرمووی: من خۆم لەنێوانی دوو ژندا بووم، یەکێکیان تێلایەکی دا لەوی تریان و خۆی و کۆرپەلەکەی ناو سکی کوشت. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەخوێنی کۆرپەلەکە بڕیاریدا کە دەکاتە سەرێ کۆیلە، وەژنە بکوژەکەیش بکوژرێتەوە!). {سنن أبی داود – باب دیه الجنین. ئەلبانی دەڵێ: صەحیحە}.

١١٩٩– وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلرُّبَيِّعَ بِنْتَ اَلنَّضْرِ – عَمَّتَهُ – كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ، فَطَلَبُوا إِلَيْهَا اَلْعَفْوَ، فَأَبَوْا، فَعَرَضُوا اَلْأَرْشَ، فَأَبَوْا، فَأَتَوْا رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَأَبَوْا إِلَّا اَلْقِصَاصَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) بِالْقِصَاصِ، فَقَالَ أَنَسُ بْنُ اَلنَّضْرِ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَتُكْسَرُ ثَنِيَّةُ اَلرُّبَيِّعِ؟ لَا،

وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، لَا تُكْسَرُ ثَنِيَّتُهَا، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "يَا أَنَسُ! كِتَابُ اَللَّهِ: اَلْقِصَاصُ". فَرَضِيَ اَلْقَوْمُ، فَعَفَوْا، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "إِنَّ مِنْ عِبَادِ اَللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اَللَّهِ لَأَبَرَّهُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٥٦ = ٢٨٠٥، ٤٠٤٨، ٤٧٨٣ + ٢٨٠٦ صحيح البخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٣٠ = ٤٣٥٠ شيحا = مسلم/١٦٧٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو خوشکەی مامە ئەنەسم، کەمن بەناوی ئەوەوە ناو نراوم، کە لەباوکەوە پووری منە، کە ئەو خوشکەی ناوی روبەییع بوو، ددانە دووینەی ژنێکی شکاندبوو، داوایان لێی کرد کە لێی ببورێ، بەڵام کەسوکاری کچە ددان شکاوەکە قاییل نەبوون کە چاوپۆشی لێ بکەن، گوتیان خوێنی ددانە شکاوەکە دەدەین؟ دیسان رازی نەبوون، جا بۆ دادپرسی چوونە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێش گوتیان بەتۆڵە سەندن نەبێ بەهیچی تر رازی نابین، دەبێ دیانی روبەییعیش لەتۆڵەی ددانی کچەکەی ئێمەدا بشکێتەوە، ئیتر پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە تۆڵە بستێنرێو فەرمووی: دەبێ لەبریتی ئەوە ددانی روبەییعیش بشکێنرێ. ئەنەسی کوڕی نەضری براشی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەو کەسەی کەتۆی بەڕاستی کردووە بە پێغەمبەری خۆیو، بەم ئایینە راستو دروستەوە رەوانەی کردووی، پشت بە بەخششو کەرەمی خودا، ددانی ئەم خوشکەم ناشکێنرێ.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئەنەس! خودا لەقورئانی پیرۆزدا، کە نامەی خۆیەتی دەفەرموێ: {السِّنَّ بِالسِّنِّ}. واتە: ددان لەباتی ددان هەڵ دەکەنرێ، ئەگەر تاوانکار ددانی تاوان لێکراوی هەڵکەندبوو، وەددان لەجیاتی ددان دەشکێنرێ، ئەگەر تاوانبار ددانی تاوانلێکراوی

شكاندبوو). كەواتە: تۆڵە سەندن لەمكاتەدا بڕیاری نامەی خودایە، پێویستە هەمووومان ملکەچ بین بۆی).

جا لەپاش هەوڵو کۆششی ئاشتییانە، کەسوکاری ژنە ددان شکاوەکە، بەخوێنی ددانەکە قاییل بوونو، وازیان لەتۆڵە سەندنەوە هێنا.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (خودای گەورە بەندەی باشی وای هەیە، ئەگەر وڕك لەخودا بگرێو سوێندی لێ بخوات، کە دەبێ فیسارە ئیشم بۆ بکەیت، خودا دڵی ناشکێنێو ئیشەکەی بۆ دەکات، وەك ئەم سوێندەی ئەنەسی کوڕی نەضر خواردی، کە سەرەنجام ددانی خوشکەکەی ناشکێنرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٤ – ج/٤. فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٠٦}.

١٢٠٠– وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيًا أَوْ رِمِّيًا بِحَجَرٍ، أَوْ سَوْطٍ، أَوْ عَصًا، فَعَلَيْهِ عَقْلُ اَلْخَطَإِ، وَمِنْ قُتِلَ عَمْدًا فَهُوَ قَوَدٌ، وَمَنْ حَالَ دُونَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اَللَّهِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، بِإِسْنَادٍ قَوِيّ.

{صحيح الجامع: ٦٤٥٠}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ کوێرانە لەنێواندا کوژرا، لەشەڕە قەمچیو شەڕە تێلاو شتی واداو، کەس نەیدەزانی کێ کوشتوویەتی، ئەوە دادەنرێ بەکوشتنی نیمچە هەڵەو خوێنباییەکەی قورسە (دِيَةُ مُغَلَّظَة) وەك خوێنبایی کوشتنی هەڵە وایە دیارە کە شەڕکەرەکانن دوو لایەنن، خوێنی کوژراوەکە دەکەوێتە سەر ئەو لایەنە، کە لەگەڵ لایەنی کوژراوەکەدا شەڕیان کردووە، بەڵام کەسێ بەقەستی بکوژرێ ئەوە تۆڵەی دەسەندرێو بکوژەکەی لەتۆڵەی ئەودا دەکوژرێتەوە، وە ئەوەی سەرپێچی لەمەبکاو ڕێگەی نەدا کەجێبەجێ بکرێ، لەعنەتو نەفرەتی خودای لێ بێو ڕقو خەشمو

غەزەبی خودای لێ بێو، فەرزو سوننەتی هەرگیز گیرانەبێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٢٣١٩}.

**(ڕوونکردنەوە):**

١- مەبەست لەکوێرانە ئەوەیە، کە زۆرینەی کات بکوژ نیازی کوشتن نەبێو بگرە بەدڵ شتی وای پێ ناخۆش بێ، بەڵام بەناچاری بەشداری کردبێ لەکوشتنی کەسێکا، وەك ئەوە زۆرجار، لە تەوافی حەجا، یا لە ڕەجمی شەیتاندا، کۆمەڵێ دەبن بەژێر پێوەو دەکوژرێن، یا لەکاتی تەواوبوونی نوێژدا، هەندێ لەنوێژکەرەکان دەبن بەژێر پێوەو دەمرن. یا لەکاتی تەقەکردندا، بە گوللەی وێڵ کەسێ دەکوژرێ. خوێنی ئەم جۆرە کوژراوە وەك خوێنی کوشتنی بەهەڵە وایە، بەڵام ئەو خوێنە لەسەر کێیە؟ ئەوە وەڵامێکی دوورو درێژی هەیە.

**٢- کوشتن سێ جۆری هەیە:**

یەکەم: کوشتنی بەقەستی پەتی، ئەوەیە: کە بکوژ نیازی کوشتنەکەیشو نیازی کەسە دیاری کراوەکەیشی کردبێ بەهۆی شتێکەوە کە زوربەی کات ئەو شتە کوشندە بێ، وەك خەنجەرو گوللەو زەهر، بڕیاری ئەم جۆرە کوشتنە، یەکێکە لەم سێ شتە:

آ- بکوژ بکوژرێتەوە، لەلایەنی دەوڵەتەوە، یا دەوڵەت لەپاش دادگایی، بکوژ ڕادەستی کەسوکاری کوژراوەکە بکا، ئەوانیش بیکوژنەوە (بەمە دەگوترێ: قَوَد: تۆڵەسەندن).

ب- کەسوکاری کوژراوەکە واز لەتۆڵە سەندن بهێننو بەخوێن ڕازی بنو خوێن وەربگرن. (بەمە دەگوترێ: صوڵح).

ج- یا کەسوکاری کوژراوەکە لەبکوژ خۆش ببن بەبێ بەرابەرو هیچیان نەوێ. (بەمە دەگوترێ: عەفو: بەخشین).

دووەم: کوشتنی هەڵەی پەتی، هەڵەی پەتی بەم دوو نموونەیە روون دەکەینەوە:

نموونەی یەکەم: وەك ئەوە تیرێ، یا گوللەیەك بنێ بەشتێکەوە، وابزانێ کە نێچیرە، یا درندەیە، یا شتێ تری خوێن رەوایە، بەڵام بەر پیاوێ بکەوێو بیکوژێ، لەم نموونەدا بکوژ نیازی کوشتنی بووە، بەڵام نیازی کەسەکەی نەبووە.

نموونەی دووەم: نەنیازی کوشتنو نەنیازی کەسەکەی نەبێ، وەك لەکاتێکا کە بەرێگەدا دەڕوا، بەبێ قەست، پێی هەڵبکەوێ لە منداڵێو بکەوێ بەسەریداو بیکوژێ، یا وەك کارەساتەکانی ئوتومبیل، کەزۆر کەسی تیادەکوژرێ، یا وەك ئەوە پڕ جامێ تێزابی بەدەستەوە بێو دەستی بلەرزێو بڕژێ بەسەر کەسێکاو بیکوژێ، وەهەروەها.....

سێیەم: کوشتنی نیمچە قەستیو نیمچە هەڵە، ئەوەیە کە نیازی ئیش (فعل)ەکەو کەسەکەی هەبێ، بەڵام بەشتێك ئیش (کوشتن)ەکە، ئەنجام بدات، کە زۆرتر وابێ کە ئەو شتە کوشندە نەبێ، وەك بە قەمچی، یا بە تووڵێ، یا بە بەردێکی ئاسایی بچووك بدا لەکەسێو بەو لێدانە سووكو کەمە بەرێکەوت بمرێ. جا لەجۆری دووەمو سێیەمدا، کوشتنەوە پێویست نابێ، بەڵکوو یەکێ لەم دوو بڕیارە دەچەسپێ:

آ- کەسوکاری کوژراو خوێن وەربگرن، بەپێی ئەو وردەکاریەی کە لەپەڕاوە شەرعییەکاندا هاتووە.

ب- یا بەبێ بەرابەر لێی خۆش بنو بکوژەکە لەهەموو شتێ عەفوو بکەن. {بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٠٢ بە تەواوی، لەلاپەڕە: ٨٣٠یەوە هەتا لاپەڕە: ٨٤١ چاپی: تاران}.

١٢٠١- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا أَمْسَكَ اَلرَّجُلُ اَلرَّجُلَ، وَقَتَلَهُ اَلْآخَرُ، يُقْتَلُ اَلَّذِي قَتَلَ، وَيُحْبَسُ اَلَّذِي

أَمْسَكَ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ مَوْصُولًا وَمُرْسَلًا، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْقَطَّانِ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، إِلَّا أَنَّ اَلْبَيْهَقِيَّ رَجَّحَ اَلْمُرْسَلَ.

{دارقطني (٣/١٤٠) بيهقي (٨/٥٠) أبو نعيم في الحلية (٧/١١٠)}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئەگـەر دوو کـەس یـەکێکیان پیـاوێ بگـرێو ئەوی تریشیان بیکوژێ، ئەوە بکوژەکە دەکوژرێتـەوەو ئەوەیشی کـە دەیگـرێ بۆی زیندانی دەکرێ).

دانـەر دەڵـێ: دارە قـوطنی بەموصـولیو بەمرسـلی گێڕاویەتـەوە، ئیبنـو قـەططـان بەتەندروسـتی دادەنـێ، پیاوەکـانی ڕشـتەکەی متمانـەدارن، بـەڵام بەیهەقی لایەنی ئیرسالی بە بەهێزتر دەزانێ.

١٢٠٢– وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ الْبَيْلَمَانِيِّ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَتَلَ مُسْلِمًا بِمَعَاهِدٍ. وَقَالَ: "أَنَا أَوْلَى مَنْ وَفَى بِذِمَّتِهِ} . أَخْرَجَهُ عَبْـدُ اَلـرَّزَّاقِ هَكَـذَا مُرْسَلًا. وَوَصَلَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، بِذِكْرِ اِبْنِ عُمَرَ فِيهِ، وَإِسْنَادُ اَلْمَوْصُـولِ وَاهٍ. وَعَـنْ اِبْـنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {قُتِلَ غُلَامٌ غِيلَةً، فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ اِشْتَرَكَ فِيهِ أَهْلُ صَـنْعَاءَ لَقَتَلْتُهُمْ بِهِ} . أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

١- عەبـدوڕەحمانی کـوڕی بەیلـەمانی دەفـەرموێ: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موسوڵمانێ لەجیاتی موعاهـەدێ دەکوژێتـەوە، وە دەفەرموێ: (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (باشـترین کـەس کەشـایانی ئـەوەبێ وەفاو ئەمەك بەپەیمانو بەڵێنی خۆی بکا منم!).

دانـەر سـەبارەت بـە بەشـی یەکـەمی ئـەم فەرموودەیـە دەفـەرموێ: عەبـدوڕڕەزاق لـە موصـەننەفدا، ئـاوا بـە مورسـەلی دەری هێنـاوە، بـەڵام دارە قوطنی بە مەوصولی دەری هێناوە، ئاوا:

لـه عەبـدوڕەحمانى كـوڕى بەيلەمانييـەوە، لـە ئيبنـو عومـەرەوە، لـە پێغەمبـەرەوە (كـە جـارێ پێغەمبـەر .........) وە هـەروەها دانـەر (ڕەحمـەتى خـوداى لێ بـێ) دەڵـێ: ڕشتە پەيوەست (موصـول)ەكـەى بـەربادە. مامۆسـتاى ئـەلبانيش (ڕەحمـەتى خـوداى لێ بـێ) لـە (السِّلْـسِلَة الـضَعِيفَةُ)دا دەڵـێ: (فەرموودەيەكى مونكەرە).

٢- ئيبنـو عومـەر (ڕەزاى خـودا لـەخۆى‌و لـەباوكى بـێ) فـەرمووى: (كـوڕێكى مێـرد منـاڵ تـيرۆر كـراو لـەناكاوا بـەبێ ئاگـا كـوژرا، ئەمـەيش لەسـەردەمى جێنـشينى ئيمـامى عومـەردا بـوو، ئيمـامى عومـەر فـەرمووى: (گريمان هـەموو خـەڵكى شـارى صـەنعاء بەشـدارييان كـردووە لەكوشـتنى ئـەو كوڕەدا، بەحەددى شەرعى هەموويانم دەكوشتەوە، لەتۆڵەى ئەودا!!).

بوخارى دەرى هێناوە لـە (باب إِذَا أَصَابَ قَـوْمٌ مَـنْ رَجُـلٍ هـل يُعَاقَـبُ أَوْ يُقْتَصُّ مِنْهُمْ كُلِّهِمْ). ئەم فەرموودەيە لە (فيقهى ئاسـان)دا، لەبـەرگى دووەمـدا، لە زنجيرە: ٣٠٤دا چاپى تاران ئاوايە:

ئيمامى عومەر (ڕەزاى خوداى لێ بێ) حەوت كەسى، يـان پێـنج كەسـى، لەخـەڵكى صـەنعاى يەمـەن، لـەجياتى يـەك كـەس كوشـتەوە. وە فـەرمووى: (ئەگـەر گريمـان سـەرجەم خـەڵكى وڵاتـى يەمـەن، دەسـتيان لەكوشـتنى ئـەم كـوژراوەدا هەبوايـە، هـەموويانم وەك ئـەم چـەند كەسـە لـەجياتى ئـەو دەكوشتەوە).

(ڕوونكردنەوە):

عەبـدوڕەحمانى كـوڕى بەيلـەمانى، تـابيعىيـە، گێڕانـەوەى لـە ئيبنـو عـەبباس‌و ئيبنـو عومـەرو معاويـەو كەسـانى تـريش هەيـە، موحەممـەدى كوڕى‌و كەسانى تريش گێڕانەوەى لێوە ئەنجام دەدەن، دەڵێن: شاعيرێكى جوان بووە.

١٢٠٣- وَعَنْ أَبِي شُرَيْحٍ اَلْخُزَاعِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {فَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ بَعْدَ مَقَالَتِي هَذِهِ، فَأَهْلُهُ بَيْنَ خِيرَتَيْنِ: إِمَّا أَنْ يَأْخُذُوا اَلْعَقْلِ. أَوْ يَقْتُلُوا} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ.

{صحيح، المشكاة: ٣٤٥٧}:

بۆ واتای ئەم ژمارەیە بڕوانە ژمارەی پاش خۆی کە ژمارە: (١٢٠٤).

١٢٠٤- {وَأَصْلُهُ فِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ بِمَعْنَاهُ}: لەپێشەوە لە ژمارە: (٧٥٩)دا رابورد.

(ڕوونکردنەوە):

١- لەکاتی ڕوودانی تاوانێکدا، لەکەسێ، ئەم دوو ئەگەرە رەچاو دەکرێ:

یەکەم: مافی خودا، کە ئەوە شایانی چاوپۆشی لێ کردن نییەو دەبێ بکەر (تاوانکار) بەپێی یاسانامە سزا بدرێ، وەك کەسێ لەئیسلام پاشگەز بێ، ئەوە ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە دەکوژرێ، یان کەسێ داوێنپیسی بکا، بەپێی تاوانەکەی یان داری حەددی لێ دەدرێ، یان بەردەباران دەکرێ، تا دەمرێ.

دووەم: مافی بەندەی خودا، ئەم بابەتەیش بەشی زۆری لێ دەبێتەوە:

یەکەم: تاوانلێکراو خۆی مابێ، ئەوە بڕیار بەدەستی خۆیەتی لەقیصاص‌و لەخوێن وەرگرتن‌و لەلێخۆشبوون بەبێ بەرابەر، ئەمە لەکاتێکا وایە، کەتاوان لێکراو خۆی هۆشیارو فامیدەو رەسیدە بێ‌و شێت‌و منداڵ‌و خەڵەفاو نەبێ.

دووەم: تاوانلێکراو نەمابێ، یان لەبڕیار (حوکم)ی نەماودا بێ، ئەوە کەسوکاری‌و خوێن ڕەسەنەکانی سەرپشکن لەیەکێ لەم سێ کردارە:

یەکەم: قەصاص. واتە: تۆڵەسەندن، وەك ئەوە لەباتی کوژراوەکەی خۆیان بکوژ بکوژنەوە، یان کەسێ ددانی منداڵێکی خستبێ، بەعەمدی عودوان، ئەمانیش هەمان ددانی ئەو تاوانکارە بەهەمان شێوە بخەنەوە.

دووەم: خوێن وەربگرن، لەسەر چی ڕێك بكەون دەبێ، مەرج نییە، كەخوێنەكە هەمان شتو هەمان ئەندازە بێ كە یاسانامە دایناوەو دیاری كردووە، ئەوەی شەرع دایناوە بۆ حەسمی نیزاعەو بۆ بەرگریو ئاگر بڕە لەدروستبوونی گرفتو كێشە. دەنا هەردوولایەن لەسەر هەرچی كارێكی ڕەوا ڕێك بكەون دەبێ، وەك ئەوە خوێنڕەسانی كوژراوێ لەباتی خوێنی كوژراوەكەیان (١٠٠)دیناری زێڕ وەربگرن، یان (١٠٠) سەد سەر مەڕ، یان بزن وەربگرن، لەكاتێكا كە خوێنی بڕیاردراو بەپێی یاسانامە (١٠٠) وشترە.

## ٧٤- باسی خوێنو خوێنبایی
## بَابُ: الدِّيَّاتِ

(بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٥، زنجیرە: ٩١، لە ژمارە: ٢٠٧٤وە هەتا ژمارە: ٢٠٧٩ + مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٨٠٠ هەتا زنجیرە: ٨٠٢ لە ژمارە: ١٠٢١ وە هەتا ژمارە: ١٠٢٣ فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٠٧، لاپەڕە: ٨٤٩ چاپی تاران هەتا زنجیرە: ٣١٦ لە لاپەڕە: ٨٦٥دا. تاجول ئوصول/٣، لە زنجیرە: ٨٣وە هەتا زنجیرە: ٨٥ لە ژمارە: ٢٣٠٦وە هەتا ژمارە: ٢٣٢٧).

١٢٠٥- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَتَبَ إِلَى أَهْلِ اَلْيَمَنِ... فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ، وَفِيهِ: {أَنَّ مَنْ اِعْتَبَطَ مُؤْمِنًا قَتْلاً عَنْ بَيِّنَةٍ، فَإِنَّهُ قَوَدٌ، إِلَّا أَنْ يَرْضَى أَوْلِيَاءُ اَلْمَقْتُولِ، وَإِنَّ فِي اَلنَّفْسِ اَلدِّيَةَ مِائَةً مِنْ اَلْإِبِلِ، وَفِي اَلْأَنْفِ إِذَا أُوعِبَ جَدْعُهُ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَللِّسَانِ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَلشَّفَتَيْنِ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَلذَّكَرِ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَلْبَيْضَتَيْنِ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَلصُّلْبِ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَلْعَيْنَيْنِ اَلدِّيَةُ، وَفِي اَلرِّجْلِ اَلْوَاحِدَةِ نِصْفُ اَلدِّيَةِ، وَفِي اَلْمَأْمُومَةِ ثُلُثُ اَلدِّيَةِ، وَفِي اَلْجَائِفَةِ ثُلُثُ اَلدِّيَةِ، وَفِي اَلْمُنَقِّلَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ مِنْ اَلْإِبِلِ، وَفِي كُلِّ إِصْبَعٍ مِنْ أَصَابِعِ اَلْيَدِ وَالرِّجْلِ عَشْرٌ مِنْ اَلْإِبِلِ، وَفِي اَلسِّنِّ خَمْسٌ مِنْ اَلْإِبِلِ وَفِي اَلْمُوضِحَةِ خَمْسٌ مِنْ اَلْإِبِلِ، وَإِنَّ اَلرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرْأَةِ، وَعَلَى أَهْلِ اَلذَّهَبِ أَلْفُ

دِينَارٍ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ فِي "اَلْمَرَاسِيلِ" وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْـنُ اَلْجَـارُودِ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَأَحْمَدُ، وَاخْتَلَفُوا فِي صِحَّتِهِ.

{ضعيف الجامع: ٢٣٣٣}:

ئـەبو بـەكری كوڕی موحەممـەدی كوڕی عـەمری كوڕی حـەزم (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) لەباوكیـەوە، لەباپیریـەوە، دەفـەرموێ: لـەو نامەیـەدا، كـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆ خەڵكی یەمەن، ئەمەی تیادا نووسیبوو:

(هەركەسـی لەخۆیـەوە بەقەسـتی، موسـوڵمانێكی بـێ سـووچ بكـوژێو بەشـایەتو بـە بەڵگـە ئیـسپات ببـێ لەسـەری، ئـەوە لـەجیاتی ئـەو كـوژراوە ئەویش دەكوژرێتەوە، مەگەر خاوەن خوێنـەكان بـەخوێن وەرگـرتن ڕازی بـن، یان بەبی بەرابەر لێی خۆش بن!).

خوێنی هەموو پیاوێكی ئـازادی موسـوڵمانیش دەكاتـە سـەد سـەر وشـتر، لووتیش ئەگەر لەلایەنی كەسێكەوە بەتەواوی قرتابوو، یـەك خـوێنی تـەواوی خاوەنەكـەیی دەكـەوێ، هـەروا هـەردوو چـاویش یـەك خـوێنی تـەواوی خاوەنەكـەیان دەكـەوێ، هـەروا زمـانیش خـوێنێكی تـەواوی خاوەنەكـەیی دەكـەوێ، هـەروا خـوێنی هـەردوو لێـویش دەكاتـە خـوێنێكی تـەواوی خاوەنەكەیان، هەروا چووكیش یـەك خـوێنی تـەواوی خاوەنەكـەیی دەكەوێ، هەروا هـەدوو هێلكـەی گون، هـەروا خـوێنی بڕبڕاگـەی پـشت، هـەروا خـوێنی یەك تاقە پایش دەكاتە نیو خـوێنی خاوەنەكـەی، وە ئـەو زامـەیش كـە بگاتـە پـەردەی مێـشك، كـەپێی دەگـوترێ: (المَأْمُومَـةُ) خوێنەكـەی دەكاتـە سـێیەكی خوێنبـایی خاوەنەكـەی، هـەروا ئـەو زامـەیش كـە بگاتـە بۆشـایی سـەر، یـان بۆشـایی سـینگ، یـان نـاو بۆشـایی سـك، خوێنەكـەی دەگاتـە سـێیەكی خـوێنی خاوەنەكەی، وە ئـەو زامـەیش كـە ڕامـاڵەو تـوێخی سـەر ئێـسك دەگوێزێتـەوە، كەناسراوە بە (المُوضِحَة) خوێنەكـەی دەكاتـە پـازدە وشـتر، ئەگـەر برینـدارەكە

نێرینەیەکی موسوڵمانێکی ئازاد بوو، خوێنی هەموو پەنجەیەکیش، چی هی دەست بێ، چی هی پێ بێ، دەکاتە دە وشتر، ئەگەر خاوەنەکەی پیاوێکی موسڵمانی ئازاد بێ، خوێنی یەك ددانیش دەکاتە پێنج وشتر، بەبێ جیاوازی لەنێوانی ددانەکاندا، بەمەرجێ خاوەنی ددانەکە نێرینەی ئازادی موسوڵمان بێ، خوێنی ئەو زامەیشی کە ئێسکی دەرخستبێ، کەناسراوە بە (الموضحة) دەکاتە پێنج وشتر، بەمەرجێ خاوەنەکەی نێرینەی ئازادی موسوڵمان بێ، وەبێگومان کەپیاویش لەجیاتی ژن دەکوژرێتەوە، وە ئەوکەسەیشی کەزێڕی هەیەو دەیەوێ بەزێڕ خوێن بدا، نەوەك وشتر، دەبێ هەزار دیناری زێڕ بدا، بەمەرجێ کوژراوەکە نێرینەی ئازادی موسوڵمان بێت. (فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣١١، لاپەڕە: ٨٥٥ چاپی تاران) + (تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٢٣٢٦) + (تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٢٣١٦).

(ڕوونکردنەوە):

١- خوێنبایی بەهۆی چەند شتێکەوە زیادو کەم دەکا، بەشێوەی گشتی:

یەکەم: خوێنی موسوڵمانی نێرینەی ئازاد دەکاتە سەد وشتر، یان (١٠٠٠) هەزار دیناری زێڕ.

دووەم: خوێنی ئەندامەکانی نێرینەی ئازادی موسوڵمانیش لە فەرموودەکەدا ڕۆیشت.

سێیەم: خوێنی مێینەی موسوڵمانی ئازاد دەکاتە نیوەی خوێنی موسوڵمانی نێرینەی ئازاد کە دەکاتە (٥٠) پەنجا وشتر، یان (٥٠٠) پێنج سەد دیناری زێڕ، یان دوازدە هەزار درەمی زیو.

چوارەم: خوێنی برینو ئەندامەکانیشی دەکاتە نیوەی خوێنی برینو ئەندامەکانی نێرینەی موسوڵمانی ئازاد، بەوێنە: خوێنی لووتی پیاو دەکاتە سەد وشتر، کەواتە: خوێنی لووتی ژن دەکاتە (٥٠) وشتر، یان (٥٠٠) پێنج سەد دیننماری زێڕ، خوێنی زامی (المنقلة)ی پیاو دەکاتە (١٥) وشتر، کەواتە: خوێنی

زامـی (المنقلـة)ی مێیینـەی ئـازادی موسـوڵمان دەکاتـە حـەوت وشـترو نیـو، وەهەروەها ئەندامەکانی تری. (بڕوانە: ژمارە: ١٢١٣.........لەدواوە دێت).

پێنجەم: خوێنی کۆیلەی خوێن پارێزراو (المعصوم الدَّم) نێر بێ، یان مێ بێ، یان نێرو مێ بێ، موسوڵمان بێ، یان ناموسوڵمان بێ، خوێنەکەی یەکسانە بەنرخەکەی، جیاوازی لـەنێوانی قەستیو هەڵـەو نیمچە هەڵەیدا نییـە، وە قورسو سووکی بۆ نییە.

شەشەم: خوێنی زامو ئەندامەکانی دەبن بەدوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: ئەو جۆرە زامو ئەنـدامو پارچانەی لەشـە کە یاسـانامەی خودا، لەمرۆڤی ئازاددا، خوێنی دیاری کراوی بۆیان دانـاوە. بـۆ نموونـە: زامـێ لەدەسـتی کۆیلـەیێ دەکـرێ، کـە لەشـەرعا ئـەو جـۆرە زامـە لـەمرۆڤی ئـازاددا، خوێنی بۆ دیاری نەکراوە، دەڵێین: ئەم کۆیلەیـە ئەگـەر زامـار نـەکرایێ، بـایی چەند بوو؟ دەڵێین: بایی سەد بوو، دەڵێین: ئەی ئێستاکە کە زامار کراوە بایی چەندە؟ دەڵێین: بایی نەوەدە، کەواتە: خوێنی زامەکە دەکاتە (١٠٠ – ٩٠ = ١٠) دە دینار.

بەشی دووەم: ئەو جۆرە زامو ئەندامو پارچانەی لەشە، کە لەیاسانامەی خودادا، لەمرۆڤی ئازاددا، خوێنیان بۆ دیاری کراوە، وەك: دەستو پێو چاوو لووتو چووكو ددانو موضحەو مەئموومەو جائیفەو ئـەوانی تـر، کـەخوێنی ددیاری کراویان بۆ دانراوە لەئازاددا.

جا لەکاتی وادا، بەپێوەری خوێنی ئـازاد، نرخـی کـەمی کۆیلەکـە دیـاری دەکـرێ، وەك: بڕینـی دەسـت لـەئازاددا نیـو خوێنـە، کەواتـە بڕینـی دەسـت لەکۆیلەدا نیوەی نرخەکەیەتی، هەردوو دەست لەئازاددا یەك خـوێنی تـەواوە، هـەردوو دەسـت لەکۆیلـەدا، یـەك نرخـی تـەواوە، خـوێنی زامـی (الموضـحة) لەئازاددا دەکاتە پێنـج وشتر، کـەنیوەی دە یـەکی خوێنەکەیـەتی، نرخـی زامـی

(الموضـــحة) لەكۆیلـەدا دەكاتــە نیـوەی دە یــەكی نرخەكـەی، گریمـان نرخــی كۆیلەكە (٨٠٠) دیناری زێڕ بێ، نرخـی زامەكـەی دەكاتـە (٨٠٠ ÷ ١٠ = ١٠٠) وە (١٠٠ ÷ ٢ = ٥٠) نرخی زامەكە دەكاتە پـەنجا دینـاری زێـڕ، كـەنیوەی دە یـەكی نرخەكەیەتی.

حەوتەم: خوێن بەهۆی یەكێ لەم پێنـج شتەوە قورس دەبـێو دەبـێ بـە (دِيَةٌ مُغَلَّظَة):

١- كوشتنی قەستی.

٢- نیمچە قەستی.

٣- لەبەست (حەرەم)دا بێ.

٤- لە (أشهر الحرام)دا بێ.

٥- كوژراوەكە خزمو كەسوكارێكی خۆییو مەحرەم بێ.

وە خوێن بەهۆی یەكێ لەم چوار هۆیەوە كەم دەبێ:

١- بەهۆی ڕەگەزی مێوە، خـوێنی ژن یەكسانە بـەنیوەی خـوێنی پیـاوێ، كە لەسەر دینی ئەو ژنە بێ.

٢- بەهۆی كۆیلەییەوە، خـوێنی كۆیلـە بریتییـە لەنرخەكـەی، وەك لـە بڕگەی (شەشەم)دا رابورد.

٣- لەبار بردنی كۆرپەلە، كە بریتی بوو لە (غـوررە)یـێ بڕوانـە: ژمـارە: (١١٩٧) كە لەپێشەوە رابورد.

٤- بەهۆی بێباوەڕیو كوفرەوە، كە بەهۆی كوفرەوە دەبێ بە سێ یـەك، یان بەكەمتریش.

هەشتەم: خوێنی نێرو مێی كێشەدار، كە لەیاسانامەدا ناسراوە بە (خُنْثَى مُشْكِل) دەكاتە خوێنی ژنێ، كە نێرو مێ كێشەدارەكە لەسەر ئایینی ئـەو بـێ. (بڕوانە: پێنجەم).

نۆیەم: عـەمری کـوڕی حـەزمی کـوڕی زەیـدی کـوڕی لـوزانی ئەنـصاری، هـاوەڵ (سـەحابە)ی پێغەمبـەرە، لەغـەزای خەندەقـدا بەشـداری کـردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەکاربەدەست (عامـل)ی خۆی لەسەر نەجران لەیەمەن، عەمری کوڕی حەزم دەفەرموێ:

جارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) بینیمی لەسـەر گۆڕێ، فەرمووی: (دابەزە لەسەریو ئازاری خاوەنی ئەم گۆڕە مەدە!).

عەمر نووسراوێ دەگێڕێتەوە لـە پێغەمبـەرەوە کەناسـراوە بـە (کیتـابی عەمری کوڕی حەزم) کە بەشێ لەو نووسراوە لە ژمارە: (١٢٠٥)ی ئەم پەڕاوەدا رابـورد، کـە ئەوکیتابـەی عـەمر باسـی فـەرائیزو کەلـەپوورو زەکـاتو خوێنباییەکان دەکات، لەگەڵ گەلێ شتی تردا، عەمر ناسراوە بە (أبو الـضّحَّاك) لەساڵی (٥١) پەنجاو یەکی کۆچیدا لەمەدینە مردووە،

موحەممـەدی کـوڕی سـیرین دەگێڕێتـەوە: (کاتـێ موعاوییـە ویـستی یەزیدی کوڕی، لەشوێنی خۆی بکا، بەجێنشین، عەمری کوڕی حەزم سەبارەت بەو بابەتە ڕەخنەی توندی لەموعاویە گرتو قسەی توندی لەروودا کرد).

یەکێ لەوانەی کە گێڕانەوەی لەعەمرەوە ئەنجام دەدا:

موحەممەدی کوڕیەتی، کە لەساڵی دەی کۆچیدا لەنەجران لەدایك بووە، لەو سەردەمەدا کە باوکی کاربەدەستی پێغەمبەر بوو لەسـەر شاری نـەجران، باوکی ناوی موحەممەدەو ئەبو سولەیمانی کرد بە کەسناو (کونیـە)ی، وە لـەم بارەیەوە کاغەزی نووسی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر نامەی نووسییەوە بۆی، فەرمووی: (ناوی بنێ موحەممەد، بەڵام کەسـناوەکەی بگـۆڕە بـە ئـەبو عەبـدول مـەلیك) ئـەویش وای کـرد، لـەم سـۆنگەیەوە کـە هەرکەسـێ لەبنەماڵـەی عـەمری کـوڕی حـەزم نـاوی موحەممـەد بـێ، ئـەبو عەبدولمەلیك دەکەن بەکەسناوی.

موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم شەرعزانێکی گەورە بوو، کۆمەڵێ لەخەڵکی مەدینە فەرمووده لێیەوە دەگێڕنەوە، گێڕانەوەی هەیە لەباوکیو لەکەسانی تریشەوە لەیارانی پێغەمبەر.

موحەممەد لەڕۆژەکەی (الحَرَّ)دا، کە لەساڵی (٦٣) شەستو سێی کۆچیدا، لەسەردەمی یەزیددا قەوما، لەتەمەنی (٥٣) پەنجاو سێ ساڵیدا شەهید کرا، سیازدەکەس لەکەسوکاری لەگەڵیدا شەهید کران.

ڕۆژی ئەلحەررە ڕۆژێکی ناسراوە لەمێژووی ئیسلامدا، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاوییەدا رووی داوە، سوپایەکی زۆری گەورەی لەخەڵکی شام هێنا بۆسەر شاری مەدینە، بەسەرکردەیی موسلیمی کوڕی عوقبەی ئەلموڕی، لەمانگی قوربانی ساڵی (٦٣) شەستو سێی کۆچیدا، بەرابەر (٦٨٢ز) دەستیان کرد بەکوشتو بڕی خەڵکی مەدینە، وەشاری مەدینەیان تالان کرد، سەحابەو تابیعییەکی زۆریان شەهید کرد، ئەلحەررە خرره بەرداوییەکە، وا لەدەوری مەدینەی جاران، بەردێکی رەشی زۆری وا لێ، جەنگەی کوشتارەکە لەوێدا رووی دا (بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم باسە بڕوانە موختەصەری صەحیحی مەسلیم، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٢٩٠، چاپی یەکەم + تەجریدی بوخاری بەکوردی لاپەڕە: ٣٣٦، چ/١، ژمارە: ١٢١٣).

دەیەم: ڕشتەی ئەم فەرموودەیە:

١- ئەبو داوود لە (المراسیل)دا دەریهێناوە.

٢- نەسائیو ئیبنو خوزەیمەو ئیبنولجاروودو ئیبنو حیببانو ئیمامی ئەحمەد گێڕاویانەتەوەو راجیاییـیان هەیە لەوەدا کە ئایا فەرموودەیەکی تەندروستە یا نا.

٣- ئەلبانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە (ضعیف الجامع الصغیر للشیخ الألبانی)دا، بەلاوازی داناوە.

١٢٠٦- {وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {دِيَةُ اَلْخَطَأِ أَخْمَاسًا: عِشْرُونَ حِقَّةً، وَعِشْرُونَ جَذَعَةً، وَعِشْرُونَ بَنَاتِ مَخَاضٍ، وَعِشْرُونَ بَنَاتِ لَبُونٍ، وَعِشْرُونَ بَنِي لَبُونٍ} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ. وَأَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ، بِلَفْظِ: {وَعِشْرُونَ بَنِي مَخَاضٍ}، بَدَلَ: {بَنِيَ لَبُونٍ}. وَإِسْنَادُ اَلْأَوَّلِ أَقْوَى. وَأَخْرَجَهُ اِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ مَوْقُوفًا، وَهُوَ أَصَحُّ مِنْ اَلْمَرْفُوعِ}:

آ- ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خوێنی کوشتنی هەڵە، سەد وشترە، دەکرێ بە پێنج بەشەوە لەسەر ئەم شێوەیە: بیست وشتری مێچکەی سێ ساڵەو، بیست وشتری مێچکەی چوار ساڵەو، بیست وشتری مێچکەی یەك ساڵەو، بیست وشتری مێچکەی دوو ساڵەو، بیست وشتری نێرەی دووساڵە).

(ئەم بەشەی ئەم ژمارەیە دارە قوطنی دەریهێناوە، ئەلبانی لە (الجامع الصغیر)دا بەلاواز (ضعیف)ی داناوە).

ب- ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، بەلام لەشوێنی (وَعِشْرُونَ بَنِي لَبُونٍ = بیست وشتری نێرەی دوو ساڵە) ئەم دەستەواژەی ترە، کە دەڵێ: (وَعِشْرُونَ بَنِي مَخَاضٍ = بیست بەچکە وشتری نێری یەك ساڵە).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (گێڕانەوەی یەکەم، ڕشتەکەی بەهێزترە (ضعیف أبی داود: ٩٨٤).

ج- ئیبنو ئەبی شەیبە لەلایەکی ترەوە، بە مەوقوفی لەسەر ئیبنو مەسعوود دەیگێڕێتەوە، ئەم گێڕانەوە موقوفە، تەندروستترە لە مەرفوعەکە.

١٢٠٧- وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ: مِنْ طَرِيقِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رَفَعَهُ: {اَلدِّيَةُ ثَلَاثُونَ حِقَّةً، وَثَلَاثُونَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً. فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا}:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (خوێنی کوشتنی نیمچە بەئارەزوو دەکاتە: (٣٣) سیو سی وشتری مێچکەی سێ ساڵو (٣٣) سیو سێ وشتری مێچکەی چوار ساڵو (٣٤) سیو چوار وشتری ئاوس). (تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٢٣١٢ ج/٤).

لێرەدا لە (بلوغ المرام)دا ئاوایە:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (خوێن دەکاتە (٣٠) سی وشتری مێچکەی سێ ساڵو (٣٠) سیی وشتری مێچکەی چوار ساڵو (٤٠) چل وشتری ئاوس کە بەچکە لەسکێدا بێ). (حسن، إرواء الغليل للألباني: ٢١٩٩).

١٢٠٨- وَعَنْ اِبْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { إِنَّ أَعْتَى اَلنَّاسِ عَلَى اَللَّهِ ثَلَاثَةٌ: مَنْ قَتَلَ فِي حَرَمَ اَللَّهِ، أَوْ قَتَلَ غَيْرَ قَاتِلِهِ، أَوْ قَتَلَ لِذَحْلِ اَلْجَاهِلِيَّةِ} . أَخْرَجَهُ اِبْنُ حِبَّانَ فِي حَدِيثٍ صَحَّحَهُ.

{ابن حبان: ٥٩٩٦ وقال الأرنؤوط: إِسنادُهُ حَسَنٌ}:

ئەصڵی ئەم فەرموودەیە لەبوخاریدا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا لەهەموو تاوانبارێ، زیاتر ڕقی لەم سێ جۆرە تاوانبارەیە:

یەکەم: زەندیقی ناو بەست (حەرەم)ی مەککە.

دووەم: کەسێ لەسەردەمی ئیسلامەتیدا، منەیی ڕەوشتو یاسای سەردەمی نەزانی بکا.

سێیەم: کەسێ منەی خوێنی کەسێ بکا، هەتا بەناڕەوا خوێنی بڕێژێ. (تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٧ = بوخاری: ٦٨٨٢ + تاجول ئوصول/٣، ژمارە: ٢٢٩٥، زنجیرە: ٨١).

لێرەدا لە (بلوغ المرام)دا ئاوایە:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـە بـاوکی بێـت) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (لـەخودا یـاخی تـرین کەس، یەکێکە لەم سێ کەسە:

یەکـەم: کەسـێ لـەناو حـەرەم (بەسـت)ی مەککـەدا، یـان لـەناو حـەرەم (بەست)ی مەدینەدا، کەسێ بەناڕەوا بکوژێ‌و بەناهەق خوێنی بڕێژێ.

دووەم: کەسێ خوێنی لەسـەر بکوژێکـە، بـچێ کەسـێکی تـر لـەباتی ئـەو بکـوژە بکـوژێ، وەك: بـاوك کـوژرراوێ، بـچێ بـرای بکوژەکـەی بـاوکی بکـوژێ، لەجیاتی باوکی.

سـێیەم: کەسـێ لەسـەردەمی نـەزانی پـێش هـاتنی ئیـسلامدا، کەسـێکی کـوژراوە، بـچێ لەتۆڵـەی ئـەو کوژراوەیـدا، لەسـەردەمی ئیـسلامدا موسـوڵمانێ بکوژێ، یان بەهۆی کینەو دەغەزی سەردەمی نەزانییەوە موسوڵمانێ بکوژێ.

١٢٠٩ – وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَلَا إِنَّ دِيَةَ اَلْخَطَأِ شِبْهِ اَلْعَمْدِ -مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا- مِائَةٌ مِنَ اَلْإِبِلِ، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الإرواء: ٢١٩٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عـاص (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی بێـت) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئاگـادارბن! کـەخوێنی کوشـتنی نیمـچە بـەئارەزوو دەکاتـە سـەد وشـتر، دەبـێ چلیان بەچکەیان لەسـکدا بـێ، کوشـتنی نیمـچە بـەئارەزوویش وەك ئـەوە کـە کوشتنەکە بە قەمچی یان بەدار بێ، واتـە: بـەئامێرێ وا بیکـوژێ کـە بـەزۆری لێـدان بـەو ئـامێرە نـەبێ بـەهۆی کوشـتن‌و لەهـەمان کاتـدا قەسـتی کوشـتنی نەبێ، بەڵکوو مەبەستی تەمێ‌و شتی وا بێ، وەك لێدان بەقەمچی‌و شەپازللەو شتی وا). (بڕوانە: ژمارە: ١٢١٤).

١٢١٠– { وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ –يَعْنِي: اَلْخُنْصَرَ وَالْإِبْهَامَ } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَلِأَبِي دَاوُدَ وَاَلتِّرْمِذِيِّ: {دِيَةُ اَلْأَصَابِعِ سَوَاءٌ، وَالْأَسْنَانُ سَوَاءٌ: اَلثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ} :

{صحيح الإرواء: ٢٢٧٧}

١- ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەمەو ئەمە یەکسانن‌و خوێنیان وەك یەکە. واتە: پەنجە تووتەو پەنجە کەڵە خوێنیان چوون یەکە، کەخوێنی هەریەکێکیان دەکاتە دە سەر وشتر، بە هەردووکیان دەکەنە بیست وشتر). (تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٢٣٢٣) + (تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٩ = بوخاری: ٦٨٩٥).

٢- ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (خوێنی پەنجەکان یەکسانن، خوێنی ددانەکان یەکسانن، ددانە دووینەو کاکیلە یەکسانن). {صحیح إرواء الغلیل للألبانی: ٢٢٧٧}.

٣- عەکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە، لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (خوێنی پەنجەکانی هەردوو دەست‌و خوێنی پەنجەکانی هەردوو قاچ وەك یەکن، کەخوێنی یەك پەنجە لەم بیست پەنجەیە دەکاتە دە سەر وشتر!). {صحیح إرواء الغلیل: ٢٢٧١} + {تاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٢٣٢٤}.

١٢١١– وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ رَفَعَهُ قَالَ: { مَنْ تَطَبَّبَ –وَلَمْ يَكُنْ بِالطِّبِّ مَعْرُوفًا– فَأَصَابَ نَفْسًا فَمَا دُونَهَا، فَهُوَ ضَامِنٌ } أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَهُوَ عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ وَغَيْرِهِمَا" إِلَّا أَنَّ مَنْ أَرْسَلَهُ أَقْوَى مِمَّنْ وَصَلَهُ.

{حسن، صحيح الجامع: ٦١٥٣}:

عـەمری كـوڕی شـوعەیب لەباوكیـەوە، لەباپیریـەوە لـە پێغەمبـەرەوە دەفەرموێ: (كەسێ پزیشك نەبێو لافی پزیشكی لێ بداو بـەدرۆ خـۆی بكا بـە پزیـشكو بەچارەسـەركردنی هەڵـەو بـەتیماری هەڵـە، كەسـێ بكـوژێ، یـان زیانێكی جەستەیی تـری لێ بـدا، وەك ئـەوە كوێری بكـا، یـان شـەلی بكـا، ئـەوە دەسـتەبەرەو ئـەو زیانـەی كەداویـەتی لەكەسـێ پێـی دەبـژێرێ)٠ {تـاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٢٣١٤}.

١٢١٢- { وَعَنْهُ" (رضي الله عنه) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـالَ: {فِي الْمَوَاضِحِ خَمْـسٌ، خَمْـسٌ مِـنْ اَلْإِبِـلِ} رَوَاهُ أَحْمَـدُ. وَالْأَرْبَعَـةُ. وَزَادَ أَحْمَـدُ: {وَالْأَصَابِعُ سَوَاءٌ، كُلُّهُنَّ عَـشْرٌ، عَـشْرٌ مِـنَ اَلْإِبِـلِ} وَصَـحَّحَهُ اِبْـنُ خُزَيْمَـةَ، وَابْـنُ اَلْجَارُودِ}:

١- دیـسان ئـەو (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: (لەزامە ئێسك دەرخەرەكانا، لەهەر زامێكا پێنج وشتر خوێن هەیە).

زامـی دەرخـەر واتـە: موضـیحە. {صـحیح، الإرواء: ٢٢٨٥} + {تـاج/٣، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ٢٣٢٨}.

٢- ئیمامی ئەحمەد ئەمەی پتر كردووە:

(پەنجەكان بۆ خوێن یەكسانن، خوێنی هەموو پەنجەیێ بەبێ جیاوازی لەنێوانیانا دە سەر وشترە. واتە: بیست پەنجەكان دەكەنە (٢٠ × ١٠ = ٢٠٠) دوو سەد سەر وشتر. {صحیح الجامع للألبانی: ٢٧٨٢}.

١٢١٣- { وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {عَقْلُ أَهْلِ اَلذِّمَّةِ نِصْفُ عَقْلِ اَلْمُسْلِمِينَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالْأَرْبَعَةُ. وَلَفْـظُ أَبِـي دَاوُدَ: {دِيَةُ اَلْمُعَاهِدِ نِصْفُ دِيَةِ اَلْحُرِّ}. وَلِلنِّسَائِيِّ: {عَقْلُ اَلْمَرْأَةِ مِثْلُ عَقْلِ اَلرَّجُـلِ، حَتَّى يَبْلُغَ اَلثُّلُثَ مِنْ دِيَتِهَا وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ}:

١- عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەحمەتو ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

(خوێنی ناموسوڵمانی پەنادار (ئەهلی زیممە) دەکاتە نیوەی خوێنی موسوڵمانێ). {حسن إرواء الغليل: ٢٢٥١ + تاج/٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ٢٣١٧ ج/٤}.

٢- گفت (لەفظ)ی ئەبو داوود لەگێڕانەوەی خۆیدا ئاوایە: (خوێنی پەیمان دار (موعاهەد) نیوەی خوێنی موسوڵمانی ئازادە). {صحيح الجامع للألباني: ٣٣٩٥}.

٣- لە فەرموودەیەکا کە نەسائی دەیگێڕێتەوە ئاوایە:

لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە: (ئەندازەی خوێنی ژنیش وەك هی پیاوە، هەتا دەگاتە سێیەکی خوێنی پیاو، بەڵام کەلەوە تێپەڕی، ئیتر ئەندازەی خوێنی ژن نیوەی ئەندازەی خوێنی پیاوە). {ضعيف الجامع للألباني: ٣٧١٩}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەم نموونەیە ئەم بڕگەی سێیەمی ئەم فەرموودەیە ڕوون دەکاتەوە:

ڕەبیعە بەسەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: خوێنی پەنجەیەکی ژن چەندە؟ سەعید دەڵێ: دە وشتر، دەڵێ: ئەی دوو پەنجەی؟ دەڵێ: دەکاتە بیست، دەڵێ: ئەی سێ پەنجەی؟ دەڵێ: دەکاتە سیی، دەڵێ: ئەی چوار پەنجەی؟ دەڵێ: دەکاتە بیست وشتر!.

لەسەر ئەم بنیاتە: خوێنی ئەندامو زیانی جەستەی ژن هەتا دەگاتە (٣/١، ٣٣) سییو سێ وشترو یەك لەسەر سێی وشترێ، وەك هی پیاو وایە، لەوە زیاتر بوو، خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە.

١٢١٤- وَعَنْهُ (رضـي الله عنـه) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {عَقْلُ شِبْهِ اَلْعَمْدِ مُغَلَّظٌ مِثْلُ عَقْلِ اَلْعَمْدِ، وَلَا يَقْتَلُ صَاحِبُهُ، وَذَلِكَ أَنْ يَنْـزُوَ اَلشَّيْطَانُ، فَتَكُونُ دِمَاءٌ بَـيْنَ اَلنَّـاسِ فِـي غَيْـرِ ضَـغِينَةٍ، وَلَـا حَمْـلِ سِلَـاحٍ} أَخْرَجَـهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَضَعَّفَهُ.

{دارقطني/٣/٩٥. راجع: صحيح الجامع للألباني: ٤٠١٦}:

له عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لەباوكیەوە، لەباپیریەوە، له پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خوێنبایی كوشتنی نیمچه قەستیش هەر قورسه، وەك خوێنی كوشتنی بەقەستی (قەتلی عەمد) بەڵام جیاوازی لەنێوانی ئەم دوو جۆره كوشتنەدا ئەوەیه: كه لەكوشتنی نیمچه قەستیدا بكوژ ناكوژرێتەوە، بەڵام لەكوشتنی قەستیدا، ئەگەر كەسوكاری كوژراو بەخوێن قایل نەبوون بكوژ دەكوژرێتەوە.كوشتنی نیمچه قەستی وەك ئەوە شەیتان ڕادەپەڕێو دوو كۆمەڵ لەو خەڵكه دەدا بەشەڕ، بەبێ ئەوە كۆنه قین لەنێوانیاندا هەبێ، یان بەبێ ئەوە پەلاماری چەك بدەن، لەو بەینەدا خوێن دەڕژێ، بەبێ ئەوە كەسێ قەستی كوشتنی هەبێ!). {تاج/٣، زنجیره: ٨٣، ژماره: ٢٣١٠. بڕوانه: ژماره: ١٢٠٩ لەپێشەوە لەم پەڕاوەدا رابورد}.

١٢١٥- عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: { قَتَلَ رَجُلٌ رَجُلًا عَلَى عَهْـدِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَجَعَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم) دِيَتَـهُ اِثْنَـيْ عَـشَرَ أَلْفًا} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَرَجَّحَ النَّسَائِيُّ وَأَبُو حَاتِمٍ إِرْسَالَهُ.

{ضعيف إرواء الغليل للألباني: ٢٢٤٥}:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ لەبەنی عەدی كوژرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوازده هەزار درەمی دانا بەخوێنبایی بۆی!. {تاج/٣، زنجیره: ٨٣، ژماره: ٢٣٠٨ چاپی چوارەم}.

١٢١٦- وَعَنْ أَبِي رِمْثَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: { أَتَيْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَمَعِي اِبْنِي. فَقَالَ: "مَنْ هَذَا؟" قُلْتُ: اِبْنِي. أَشْهَدُ بِهِ. قَالَ: "أَمَّا إِنَّهُ لَـا يَجْنِـي

عَلَيْكَ، وَلَا تَجْنِي عَلَيْهِ } رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْـنُ خُزَيْمَـةَ، وَابْـنُ اَلْجَارُودِ.

{صحيح الجامع للألباني: ١٣١٧. الصحيح المسند: ١٢١٦}:

**ئـەبو ریثمـە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: چـوومە خزمـەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کوڕێکی خۆمم لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە کێیە لەگەڵتا؟) گوتم: کوڕی خۆمە، خۆم شایەتی بۆ دەدەم کە کوڕی خۆمە!!**

**وەك ئەبو ریثمە هەستی کردبێ کەپرسیارەکەی پێغەمبەر، بۆنی داوای روونکردنـەوەی لێ بـێ، بۆیـە ئـەو جەختـە دەکاتـەوە لەسـەر ئـەوە کـە کـوڕی خۆیەتی.**

**جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی بزانـە نـەتۆ بەرپرسیاری لەتاوانی ئەو، وە نە ئەو بەرپرسیارە لەتاوانی تۆ، هـەموو کەسـێ خۆی بەرپرسیارە لەکارو کردەوەی خۆی!).**

**(روونکردنەوە):**

**ئەبو ریثمە ناوی ریفاعەی یەثرەبیـیە، ئـەو کـوڕەی کـە لەگەڵیـدا بـوو، کەچوون بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـاوی (لقـیط) بـوو، لەپاش ئەو پرسیارو وەڵامە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەسـەر رانی خۆی دایناو نزای باشی کرد بۆی‌و دەستی هێنا بەسەریدا، لەقیط خۆی‌و باوکی هاوەڵی پێغەمبەرن، دەڵێ: کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەباوکمی پرسی: (ئەمە کوڕی خۆتە؟) باوکم گوتی: بەڵێ، سوێندم بـەخودای کابە ئەمە کوڕی خۆمە! جا پێغەمبەر لەبەر ئەم دوو هۆیە، زەردەخەنەیـەکی کرد: لەبەر ئەوەی کەمن زۆر لەباوکم دەکەم، دووەم: سوێندەکەی باوکمی لەلا سەیر بوو!**

لقيط دەڵێ: باوكم شتێكی وەك بالووكەی لەبەینی هەردوو سەرشانی پێغەمبەردا دی، عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من پزیشكی پیاوانم، ئەگەر دەفەرمووی، تیماری دەكەم بۆت؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو كەسە پزیشكیەتی كە لەوێی داناوە!!.

## ٧٥- باسی تۆمەتی كوشتنو پاكانە
## بابُ: دَعْوَى الدَّمِ وَالقَسَامَةِ

{بڕوانە: مختصر صحيح مسلم، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٥٤٤ چ/١، زنجیرە: ٨١٢ زمارەی نامە/٢٦ لە زمارە: ١٠٣٤ وە هەتا زمارە: ١٠٣٥ + تەجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٨٢ = ٣١٧٣ بوخاری + فیقهی ئاسان بەرگی دووەم لاپەڕە: ٨٦٧، زنجیرە: ٣١٧ چاپی تەهران + تاجول ئوصول/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٣٢٩ چ/٤}.

١٢١٧ – عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، عَنْ رِجَالٍ مِنْ كُبَرَاءِ قَوْمِهِ، أَنَّ عَبْدَ اَللَّهِ بْنَ سَهْلٍ ومُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأُتِيَ مُحَيِّصَةُ فَأُخْبِرَ أَنَّ عَبْدَ اَللَّهِ بْنِ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ، وَطُرِحَ فِي عَيْنٍ، فَأَتَى يَهُودَ، فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاَللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ. قَالُوا: وَاَللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَأَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ وَعَبْدُ اَلرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {"كَبِّرْ كَبِّرْ" يُرِيدُ: اَلسِّنَّ، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يَأْذَنُوا بِحَرْبٍ". فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ فِي ذَلِكَ ]كِتَابًا﴾. فَكَتَبُوا: إِنَّا وَاَللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ لِحُوَيِّصَةَ، وَمُحَيِّصَةَ، وَعَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنَ سَهْلٍ: "أَتَحْلِفُونَ، وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟" قَالُوا: لَا. قَالَ: "فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ؟" قَالُوا: لَيْسُوا مُسْلِمِينَ فَوَدَاهُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مِنْ عِنْدِهِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَائَةَ نَاقَةٍ. قَالَ سَهْلٌ: فَلَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٨٢ = ٣١٧٣ بوخاری + تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢١١٠ = ٧١٩٢ بوخاری + مختصر صحیح مسلم = پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٣٤ = صحیح موسلیم تەرقیمو ژمارە دانانی شێخ خەلیل مەئموون شیحا: ٤٣٢٥ = ترقیم صحیح مسلم/١٦٦٩ + أبو داود: دیات: ٤٥٢٠. ترمذی. دیات: ١٤٢٢. نسائی. قسامة: ٤٧٢٤. تحفة الأشراف: ٤٦٤٤}:

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لەگەورە پیاوانی خزمانی خۆم گێڕایانەوە بۆم، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهلو موحەییصەی کوڕی مەسعوودی کوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەچن بۆ خەیبەر، خەیبەر ئەو سەردەمە ئاشتو بێ شەڕو شۆڕ دەبێو لەلایەنی موسوڵمانانەوە ئازاد کرابوو، لەبەر بارودۆخی گرانی گوزەران دەچن بۆ ئەوێ، لەوێ بەناو باخە خورماکانا بڵاو دەبنەوە، لەوێ عەبدوڵڵایان دەکوژرێ، کە موحەییسەی ئامۆزای دەیدۆزێتەوە دەڕوانێ کەوا لەخوێنی خۆیدا گەوزاوە، جا لەوێ دەینێژێو دەگەڕێتەوە بۆلای جوولەکەکانو پێیان دەڵێ: کە عەبدوڵڵا کوژراوە، وەفڕێ درابووە کارێزێکەوە، یان تووڕ درابووە ناو بیرێکی دەم پەل نزیکە دەستەوە، وە دەڵێ: بەخودا ئێوە کوشتووتانە، جوولەکەکان دەڵێن: بەخودا ئێمە نەمان کوشتووە، جا موحەییصە هاتەوە بۆناو هۆزەکەیو هەواڵەکەی پێ گوتنو ئەوجا خۆیو حوەیصەی برایو عەبدوڕەحمانی کوڕی سەهل چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) حوەیصە لە موحەیصە گەورەتر بوو، عەبدوڕەحمانیش برای کوژراوەکە بوو، جا موحەیصە ویستی قسە بکا، چونکە ئەو لەگەڵ کوژراوەکەدا بووە لەخەیبەر، بەڵام پێغەمبەر پێی فەرموو: (ڕێزی لەخۆت گەورەتر بگرە با ئەو دەست بەقسەکردن بکا). مەبەستی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەوە بوو کێتان گەورەترە، با ئەو دەست بەقسەکردن بکا، جا حوەیسە چیرۆکەکەی گێڕایەوە، ئەوجا موحەیصەی براشی قسەی کرد،

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بەهۆی پاکانەی ئێوەوە خوێنەکە تلایەوە بەسەر جوولەکەکانا، ئەوە یان دەبی خوێنی کوژراوەکەتان پێ بدەن، یان دەبێ بێ پەیمان دەرچن‌و بارودۆخی جەنگ ڕابگەیەنین، لەنێوانی ئێمەو ئەواندا)٠

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەم بابەتە کاغەزێکی نووسی بۆیان، ئەوانیش وەڵامیان نووسییەوە: (بەخودا ئێمە نەمان کوشتووە!) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەحوەیسەو موحەیسەو عەبدوڕەحمانی فەرموو: (ئایا ئێوە سوێند دەخۆن کەئەوان کوشتوویانە، هەتا خوێنی کوژراوەکەتان بچێتە ئەستۆی ئەوان‌و خوێنتان پێ بدەن؟).

گوتیان: نەء، سوێند ناخۆین، فەرمووی: (کەواتە جوولەکەکان پاکانەتان بۆ دەکەن‌و سوێندتان بۆ دەخۆن کە ئەوان نەیانکوشتووە؟).

گوتیان: ئەوانە موسوڵمان نین، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لەوشتری زەکات، خوێنی کوژراوەکەی دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەد وشتری مێنگەی نارد بۆیان هەتا کرانە ژوورەوە بۆیان. سەهل فەرمووی: وشترێکی سووریان لەقەیەکی لێم دا. {تاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٣٢٩ چ/٤}.

١٢١٨- وَعَنْ رَجُلٍ مِنْ اَلْأَنْصَارِ" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَقَرَّ اَلْقَسَامَةَ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي اَلْجَاهِلِيَّةِ، وَقَضَى بِهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَيْنَ نَاسٍ مِنَ اَلْأَنْصَارِ فِي قَتِيلٍ اِدَّعَوْهُ عَلَى اَلْيَهُودِ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٣٥ = ٤٣٢٦ شیحا = مسلم: ١٦٧٠}:

پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەیاریدەدەران (ئەنصار) بوو، فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای

لەسەر بێ) سوێندی پاکانە، کەسوێندێکە بەکۆمەڵ دەخورێ، لەسەر شێوەی خۆی هێشتەوە، وەك سەردەمی نەزانی چۆن بوو ئاوا، کۆمەڵێ لە یاریدەدەران (لە کۆمەڵەی ئەنصار) تۆمەتی کوشتنی کەسێکی خۆیاندا لە جوولەکەکان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دا: کە بەسوێندی پاکانە، کە لەیاسانامەدا ناسراوە بە قەسامە، کۆتایی بەداواکەیان بێت.

(ڕوونکردنەوە):

لە فیقهی ئاساندا، لە زنجیرە: (٢١٧)دا، لە لاپەڕە: (٨٦٧)دا، چاپی تاران = بەرگی سێیەم زنجیرە: ٣١٦، لاپەڕە: ٨٠٠ چاپی یەکەم، ئاوا پێناسەی پاکانە کراوە:

(پاکانە – واتە: دڵپاك کردنەوەی کەسێ بەسوێند بۆ خواردن بۆی – لەشەرعا (لە یاسانامەدا) بریتییە لەنیشانەیەکی وا کەهێز بدا بەدروستیو ڕاستیی داواکار لەداواکەیدا، شێوەکار (صورت)ی پاکانە ئاوایە: تەرمی کوژراوێ لەشوێنێ بێت، نەزانرێ کەبکوژ کێیەو کێ کوشتوویەتی، بەڵگەیش نەبێ لەسەر هۆی کوشتنەکەی، وەهەقدارەکەی تۆمەتی کوشتنی بدا لەکەسێکی ناوبراو، یاخود لەکۆمەڵێکی دیاری، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا نیشانەو قەرینەیەکی وا لەئارادا هەبێ کەبۆنی ئەوەی لێ بێ، کەقسەی خوێنڕسەکان ڕاستە، کە بەوە دەگوترێ: (اللـوث: البَيِّنَـةُ الـضَّعِيفَةُ): ورده بەڵگە: قـولاخ: سووسە).

پاکانە زیاتر ئەوەیە کەداواکار پەنجا سوێند بخوا لەسەر ڕاستی ئەو داوای کوشتنەی کە دەیکا لە داوالێکراو. جا هەرکاتێ لەسەر داواکەی، پەنجا سوێندی خوارد، کە بەقەستی کوژراوەکەی، کەسێ کوشتوویەتی، خوێنێکی قورس لەسەر داوالێکراو خۆی پێویست دەبێ، بەڵام ئەگەر پەنجا سوێندی خوارد کە بەهەڵە کوژراوە، یان بەنیمچە هەڵە کوژراوە، ئەوە لەم دوو بارەدا

خوێن لەسەر خوێنڕسەکانی داوالێکراو پێویست دەبێ نەك لەسەر تۆمەتبار خۆی.

## ٧٦- باسی جەنگ کردن لەگەڵ یاخییەکان
## بابُ: قِتَالِ أهْلِ البَغْيِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٩١٦ چاپی تاران، زنجیرە: ٣٤٠ + مختصر صحیح مسلم/٣، لە ژمارە: ١٢٣٢ هەتا ژمارە: ١٢٣٥ + تاج/٣، ژمارە: ٢٣٣٥ هەتا ژمارە: ٢٣٣٩ لە زنجیرە: ٨٨ وە هەتا زنجیرە: ٨٩ + تەجریدی بوخاری/٥، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٠٨٠}.

١٢١٩- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رِضَيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا اَلسِّلَاحَ، فَلَيْسَ مِنَّا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٥م = ٦٨٧٤ بوخاری، مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٣٥ = شیحا ٢٧٩ = مسلم: ٩٨}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی کە چەك لەئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نییە، وە ئەوەی گزی لەئێمە بکا، لەئێمە نییە). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٧٦، ژمارە: ١٥٧٩} + {تاج/٤، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٤٤٨٨}.

١٢٢٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ خَرَجَ عَنْ اَلطَّاعَةِ، وَفَارَقَ اَلْجَمَاعَةَ، وَمَاتَ، فَمِيتَتُهُ مِيتَةٌ جَاهِلِيَّةٌ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ}:

ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٣٢ ئاوایە، بەهەرەی پتری وا تیادا: (صحیح مسلم ترقیم شیحا: ٤٧٦٣).

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ لەفەرمانی فەرمانڕەوا دەربچێ و

لەکۆمەڵ جیا ببێتەوە، لەپاشا لەسەر ئەو حاڵی داپچڕانە بمرێ، ئەوە بەنەزانی دەمرێ، وەك مردنی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام، وە کەسێ بکوژرێ، یان کوشتار بکا لەژێر ئاڵای کوێرانەدا، کە ئاڵای کوێرانە ئەومیە: بەهەق و بەناهەق لەسەر خزم و خوێشی خۆی هەڵبداتێ و لەپێناوی ئەوانا جەنگ بکاو گوێ بەهەق و ناهەق نەدا، ئەوە لەئومەتی من نییەو کوشتنەکەی کە دەکوژرێ کوشتنەکەی وەك کوشتنی سەردەمی نەزانی لەپێناوی ڕەگەزپەرستیدایە، نەوەك لەبەر خودا، وە هەرکەسێ لەئومەتم ڕاست بێتەوە لەئومەتم و پەلاماری بداو کوێرانە خاس و خراپی داپلۆسێ و بەهەرکەسێکا بگا تێی بسرەوێنێ و شەلم و کوێرم دەست لەموسوڵمانان نەپارێزێ و پەیمانی خاوەن پەیمانەکان، کەپێیان دەگوترێ: پەنادارو ئەهلی زیممە نەباتە سەر، ئەویش لەمن نییەو لەسەر شەقامە ڕێگەی ڕاست و دروستی ئایینی ئیسلامی من نییە!). {تاج/٣، لاپەڕە: ٨٢، ژمارە: ٢٤٢٧، زنجیرە: ١٠٥ ج/٤}.

١٢٢١- وَعَنْ أَمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { تَقْتُلُ عَمَّارًا اَلْفِئَةُ اَلْبَاغِيَةُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٠٦ = ترقيم شيحا لصحيح مسلم/٧٢٥٣}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵان و هاوسەران و پەیڕەوانی بێ، هەتا ڕۆژی قیامەت) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ و سەرو ماڵ و منداڵ و کەسوکارو هەست و نەست گشتی بەقوربانی بەرپێی دێنیکارانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: بەعەمماری کوڕی یاسیر، کە لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بوو، لەشکری موعاوییە کوشتیان، پێغەمبەر پێی فەرموو: (ئەی عەممار!

موژدەی شادبوون بەشەهیدیت لێ بێ: دەستەی ناهەقیکارو لەخودا یاخی بوو تۆ دەکوژن!).

(روونکردنەوە):

١- ژیاننامەی عەمماری کوڕی یاسیر لە ژمارە: (٤٧٦)دا لەم پەڕاوەدا، لەپێشەوە رابورد.

٢- لەفیقهی ئاسانا (بەرگی/٢، زنجیرە: ٣٤٠، لاپەڕە: ٩٢٠ چاپی تاران) دەڵێ: بەهیچ جۆرێ دروست نییە بۆ ئێمەی گەلی ئیسلام، کە تانەو تەشەرو رەخنە لەهاوەڵانی پێغەمبەر بدەین، وەئەم جۆرە فەرموودانە بکەین بەمەهانەو رەخنە لە موعاوییە بگرین، چونکە هاوڕێیانی پێغەمبەر، کە موعاوییە یەکێکە لەوان، هەموویان هەڤانیو دادپەروەر بوون، لەبەر ئەوە دروست نییە تانەو توانجیان لێ بدرێ، لەبەر ئەم ڕاوبۆچوونە جوانەیە کەخاوەنی کتێبی (الجَوْهرة) بەشیعر دەفەرموێ:

وَأَوِّلِ التَّشَاجُرَ الَّذِي وَرَدْ

إِنْ خُضْتَ فِيهَ، وَاجْتَنِبْ دَاءَالحَسَدْ

واتە:

گشت کێشەو بەرەو هەرای ناو یاران

پینەو پەڕۆی کە، بەپاساوی جوان

نەکەی وەك گاجووت، چەشنی ناحەزان

شەنو گێرەی کەی، وەك شیعەو نەزان

١٢٢٢- {وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {هَلْ تَدْرِي يَا اِبْنَ أُمِّ عَبْدٍ، كَيْفَ حُكْمُ اَللَّهِ فِيمَنْ بَغَى مِنْ هَذِهِ اَلْأُمَّةِ؟ "، قَالَ: اَللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: "لَا يُجْهَزُ عَلَى جَرِيحِهَا، وَلَا يُقْتَلُ أَسِيرُهَا،

وَلَا يُطْلَبُ هَارِبُهَا، وَلَا يُقْسَمُ فَيْؤُهَا} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ و اَلْحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ فَوَهِمَ" فَإِنَّ فِي إِسْنَادِهِ كَوْثَرَ بْنَ حَكِيمٍ، وَهُوَ مَتْرُوكٌ. وَصَحَّ عَنْ عَلِيٍّ مِنْ طُرُقٍ نَحْوُهُ مَوْقُوفًا. أَخْرَجَهُ اِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَالْحَاكِمُ}:

١- ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئیبنو مەسعوودی فەرموو: (ئەی کوڕی دایکی عەبد! حوکمو بڕیاری ئەوانەی کە لەنەتەوەی ئیسلامن، بەڵام لەپێشەوای موسوڵمانان یاخی دەبن چییە؟ ئیبنو مەسعوود فەرمووی: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشی دەزانن:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بڕیاریان ئەوەیە: زاماریان ناکوژرێ، دیلیان ناکوژرێ، نا نیشنە سەر هەڵهاتوویان،ماڵیشیان نابێ بەتالانی).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بەززارو حاکم گێڕاویانەتەوە، بەهەڵە حاکم بە تەندروستی داناوە، چونکە کەوثەری کوڕی حەکیم لەپیاوانی ڕشتەکەیەتی، کەوثەریش مەترووکە!!

٢- ئیمامی جەعفەر لەباوکیەوە دەفەرموێ: ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕۆژەکەی بەصرە، فەرمانی کرد بە جاڕدەران کەجاڕ بدەن: (مەنیشنە سەر شەڕکەرێ کەهەڵهاتووە، زامار ناکوژرێ، دیلیان ناکوژرێ، کەسێ دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی داخا، لەخۆی ئەمین بێ، کەسێ چەك فڕێ بدا لەخۆی ئەمین بێ، هیچ شتێ لە کەلوپەلیان نابەین).

(ئیبنو ئەبی شەیبە).

١٢٢٣- وَعَنْ عَرْفَجَةَ بْنِ شُرَيْحٍ (رضي الله عنه) سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { مَنْ أَتَاكُمْ وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ، يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ، فَاقْتُلُوهُ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٣٤ = ترقيم شيحا لصحيح مسلم: ٤٧٧٣ = مسلم: ١٨٥٢}:

عەرفەجە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (گەلێ کارەسات روو دەدەن‌و گەلێ ئاژاوەو ئاشووب بەرپا دەبن، جا ئەگەر ئەم نەتەوەی ئیسلامە، یەك پارچە بوون‌و، گێرەشێوێنێ ویستی یەکڕیزییان تێك بداو دووبەرەکیان تێ بخات ئەوە هەر کەسە بووە، گریمان پیاوچاکیش بووە، کۆی لێ مەکەنەوە، بەشمشێر دایپاچن، مادام دەبینن بەبێ مەهانەی ڕەوا، هەڵگەڕاوەتەوە لەپێشەوای موسوڵمانان). {تاج/٣، زنجيرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٩ ج/٤}.

لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئاوایە: (ئەگەر هەمووتان لەدەوری پیاوێ کۆ بوو بوونەوەو لەولاوە پیاوێکی تر پەیدا بوو، ویستی یەکێتی‌و کۆمەڵەکەتان تێك بدا بیکوژن).

(ڕوونکردنەوە):

عەرفەجەی کوڕی شورەیح لەهاوەڵانی پێغەمبەرە، لە کووفە نیشتەجێ بوو، لەپیاوان (ریجال)ی صەحیحی موسلیم‌و ئەبو داوودو نەسائییە، لە ئەبوبەکری صەدیقەوە گێڕانەوەی هەیە، مامۆستای ئەم زاتانەش بووە: زیادی کوڕی علاقەو ئەبو حازیمی ئەشجەعی‌و ئەبو یەعقووبی ئەلعەبدی‌و کەسانی تریش.

## ٧٧- باسی هەڵمەتهێن‌و پاشگەز
## بابُ: قِتَالِ الجَانِي وَقَتْلِ المُرْتَدِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٩٠٨، زنجیرە: ٣٣٧، چاپی تاران + زنجیرە: ٣٤٢، لاپەڕە: ٩٢٢ + صحيح مسلم ترقيم الشيخ خليل/شيحا/٦، ژمارە: ٤٣٤٢ هەتا ژمارە: ٤٣٤٩}.

١٢٢٤- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مِنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، ژمارە: ١٠٧٣ = ٢٤٨٠ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٨٦ = صحیح مسلم ترقیم: شیحا: ٣٥٨، ٣٥٩ + ریاض الصالحین/٣، زنجیرە: ٢٣٥، ژمارە: ٣/١٣٥٥ - ٤٠٩. مسلم: ١٤١}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێت) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (هەرکەسیٚ لەسەر ماڵی خۆی بکوژریٚ شەهیدە).

١٢٢٥- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { قَاتَلَ يُعْلَى بْنُ أُمَيَّةَ رَجُلًا، فَعَضَّ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فَمِهِ فَنَزَعَ ثَنِيَّتَهُ، فَاخْتَصَمَا إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: "أَيَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ اَلْفَحْلُ؟ لَا دِيَةَ لَهُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢١٩ = ٢٩٧٣، ١٨٤٨، ٢٢٦٩، ٤٤١٧، ٦٨٩٣ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٢٩ = شیحا ٤٣٤٦، ٤٣٤٢، ٤٣٤٣، ٤٣٤٤، ٤٣٤٥}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودا لەخۆی لەباوکی بیٚ) فەرمووی: یەعلای کوڕی ئومەییە، لەگەڵ پیاوێکا بوو بەشەڕیان، یەکێکیان دەستی ئەوی تریان دەگەزیٚ، ئەویش لە تاوانا، کە دەستی خۆی ڕادەپسکێنیٚ لەدەمی کابرای گازگر، دوو ددانی پێشینەی کابرا لەگەڵ دەستیدا دەکەون!

جا بۆ دادگایی‌و سکاڵا هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (وەك نێرە وشتر گاز لەبرای ئایینی خۆتان دەگرن، خوێنت ناکەویٚ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٢٣٣٠}.

١٢٢٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أَبُو اَلْقَاسِمِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {لَوْ أَنَّ اِمْرَأً اِطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي لَفْظٍ لِأَحْمَدَ، وَالنَّسَائِيِّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ: { فَلَا دِيَةَ لَهُ وَلَا قِصَاصَ}.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٨ = ٦٨٨٨ و ٦٩٠٢. مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٤٢٥ = شیحا: ٥٦٠٨}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێت) دەیفەرموو: (ئەگەر کەسێ بەبێ مۆڵەتو ڕێگە پێدانی خۆت، تەماشای ناومالّی تۆ بکا، تۆیش بە بەلەپیتکە چەوێکی تێ بگریت، چاوی قەلپووچ بکەیت، گوناهت ناگان!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٢٣٣٢}.

لەگفت (لەفظ) ێکا، کە ئەحمەدو نەسائی دەیگێڕنەوەو ئیبنو حیببان بەتەندروستی داناوە، دەفەرموێ: (نە خوێنی دەکەوێو نە تۆڵەسەندنی بۆ هەیە). {صحیح إرواء الغلیل للألبانی: ٢٢٢٧}.

١٢٢٧- وَعَنْ اَلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { قَضَى رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَنَّ حِفْظَ اَلْحَوَائِطِ بِالنَّهَارِ عَلَى أَهْلِهَا، وَأَنْ حِفْظَ اَلْمَاشِيَةِ بِاللَّيْلِ عَلَى أَهْلِهَا، وَأَنَّ عَلَى أَهْلِ اَلْمَاشِيَةِ مَا أَصَابَتْ مَاشِيَتُهُمْ بِاللَّيْلِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَفِي إِسْنَادِهِ اِخْتِلَافٌ.

{صحیح إرواء الغلیل للألبانی: ١٥٢٧}:

بەرائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وشترێکی چنۆکم هەبوو، جارێ چوو بووە ناو باخێكو زیان بە باخەکە دەگەیەنێ، جا ئەوەیان عەرزی خۆشەویست کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بڕیاری یاسانامە (شەرع)ی خوا لەم بارەیەوە چییە؟

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دا: کە ئاگاداری باخ بە ڕۆژ لەسەر خاوەنیەتی، وە ئاگاداری ئاژەڵ و ماڵاتیش بەشەو لەسەر خاوەنیەتی، وە هەر زیانێ کە ئاژەڵ بەشەو بیدات لەسەر خاوەنی ئاژەڵەکەیە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٣، ژمارە: ١٩٢٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٢٢٨- {وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) -فِي رَجُلٍ أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ-: {لَا أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ، قَضَاءُ اَللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَأُمِرَ بِهِ، فَقُتِلَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ}. وَفِي رِوَايَةٍ لِأَبِي دَاوُدَ: {وَكَانَ قَدْ اُسْتُتِيبَ قَبْلَ ذَلِكَ}:

١- ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولدا ئاوایە:

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو مووسای باوکم و موعاذی کوڕی جەبەل دەنێرێ بۆ وڵاتی یەمەن، هەر یەکێ لەم دوو کەسە دەکا بەسەرۆکی ناوچەیێ لەدوو ناوچەکەی سەروو خوارووی یەمەن، کەپێیان دەگوترێ (میخلاف). پێیان دەفەرموێ: (هەتا دەتوانن کار بۆ خەڵك ئاسان بکەن و باریان گران مەکەن، هەمیشە دەمتان خێربێنێ موژدەی خۆش بەمەردوم بدەن و بەهەڕشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لەخۆتان و لەئاین مەتەکێننەوە جەماوەر لەخۆتان تەرا مەکەن).

ئەنجا هەردووکیان ڕۆیشتن بەلای کاری خۆیانەوە، دەستووریشیان وادەبێ ئەگەر یەکێکیان سەری لەقەڵەمڕەوەکەی خۆی بدایێ و لەهاوڕێکەیەوە نزیك ببوایەتەوە، دەچوو بۆلای و سڵاوی لێ دەکردو هەواڵی دەپرسی. جا جارێ موعاز بەقەڵەمڕەوی خۆیدا دەسووڕێتەوە، کە لە ئەبو مووسای هاوڕێی نزیك دەبێتەوە، بەسواری هێسترێ دەچی بۆلای، دەڕوانێ وا ئەبو مووسا دانیشتووەو خەڵك دەورەیان لێ داوەو پیاوێکیش وا لەلایدا، هەردوو دەستی بەکۆت و زنجیر شەتەك دراوەو کراوەتە ملی.

موعاز دەڵێ: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس! ئەم پیاوە کۆتکراوە چییە؟ بۆ وا کۆت و زنجیر کراوە؟ دەڵێ: ئەوە لەئاینی ئیسلام پاشگەز بۆتەوەو موسوڵمان بووەو بۆتەوە بەناموسوڵمان.

موعاز دەفەرموێ: دانابەزم هەتا نەکوژرێ، دەڵێ: دە تۆ دابەزە، خۆشمان بۆ ئەوەمان هێناوە کە بیکوژین، دەڵێ: دانابەزم تا نەکوژرێ!!

جا ئەبو مووسا فەرمان دەداو پیاوەکە دەکوژرێ، ئەوجا موعاز دادەبەزێ و دەفەرموێ: ئەی عەبدوڵڵا! لەسەر چی شێوەیێ دەوری قورئان دەکەیتەوەو چۆن چۆنی قورئان دەخوێنی؟ فەرمووی: وەك وشترێ ژەم لەدوای ژەم بیدۆشیت، ئاوا بەرودوا هەرجارێ بەپێی توانا چەندەم بۆ لووا ئەوەندە دەور دەکەمەوە.

گوتی: ئەی تۆ چۆنی دەور دەکەیتەوە؟ موعاز فەرمووی: (من لەسەرەتای شەوەوە بەشی خۆم دەخەوم ئەوجا هەڵدەستم، چەندەی خودا بۆی نووسیبم ئەوەندە قورئان دەور دەکەمەوە، ئیتر بەتەمای ئەوەم کەخودا ئەو خەوتنەیشم، وەك شەونوێژو قورئان خوێندنەکەم کە لەخەو هەڵدەستم بۆی، ئەوەیشم ئاوا بە طاعەت و بەندەیی بۆ حلێب بکا). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٤٦٤٧} + {تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٠٢ = ٢٢٦١، ٣٠٣٨، ٤٣٤٣، ٤٣٤٤، ٦١٢٤، ٦٩٢٣، ٧١٤٩، ٧١٥٧، ٧١٧٢ + تەجرید/٤، ژمارە: ١٥٩٨ = ٤٣٤٢ بوخاری}.

٢- لەمەختەصەری صەحیحی موسلیما، بەرگی سێیەم ژمارە: ١٢٠٥ = شیحا: ٤٦٩٥. ئەم زیادە بەسوودەی هەیە: ئەبو مووسا لەوەڵامی موعازا دەفەرموێ: (ئەمە لەپێشا جوولەکە بووەو موسوڵمان بووەو چووەتەوە سەر ئاینە پووچەکەی خۆی و ئاینی پیرۆزی ئیسلامی گۆڕیوەو چووەتە سەر ئاینە خراپەکەی جارانی خۆی و بووەتەوە بە جوولەکە. موعاز فەرمووی: دەی کەوایە هەتا بەپێی بڕیارو حوکمی خوداو پێغەمبەری خودا، کە دایان ناوە بۆ ئەم جۆرە کەسە بێباوەڕو پاشگەزە، ئەم پیاوە نەکوژرێ دانانیشم.

ئەبو مووسا دەفەرموێ: دەتۆ دانیشە خۆشمان بۆ ئەوەمان هێناوە، ئەم قسەو گفتوگۆیە، تا سێ جار لەنێوانیانا دووبارە بۆوە، ئەوجا ئەبو مووسا فەرمان دەداو پیاوەکە دەکوژرێ.

ئەوجا لەناو خۆیانا باسی شەونوێژیان کرد، موعاز فەرمووی: (بەڵام من لەپێشا دەخەوم بەنیازی ئەوە کەبەهێز بم بۆ شەونوێژ، ئەوسا هەڵدەستم بۆ شەونوێژ، جا هەم بۆ خەوتنەکەم بەتەمای پاداشی باشی لای خودام و هەم لە شەونوێژەکەما بەتەمای پاداشی باشی لای خودای گەورەم). {تاج/٤/٨٤٦، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٤٦٤٧ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ١٤٠٧ چ/٤}.

٣- لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داوودا ئاوایە:

ئەبو مووسا لەوەوپێش چەندین جار داوای لێ کردبوو، کەپەشیمان ببێتەوە لەکافربوونەکەی و موسوڵمان ببێتەوە، بەڵام کابرای جوولەکە ئەوەی قەبووڵ نەکردبوو، وە موعازیش هەمان شتی لێ داوا کرد، دیسان قایل نەبوو کە پەشیمان ببێتەوەو سوورو مجێز بوو لەسەر جوولەکایەتی یەکەی، ئیتر هێنایان و درا لەگەردنی. {صحیح سنن أبی داود/٤٣٥٥}.

١٢٢٩- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٣٥ = ٣٠١٧، ٦٩٢٢ بوخاری}:

عیکرەمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەستەیەکی سووتاند، کە لەئیسلام وەرگەڕا بوون، کە ئەمە گەیشتەوە بەئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر من بوومایە لەشوێنی عەلی، ئەو پاشگەز بووانەم نەدەسووتاند، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەسزای تایبەتی خودا، کە بریتی یە لەسزادان بەئاگر، کەس سزا مەدەن). بەڵام ئەوانەم دەکوشت، چونکە

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ئایینی خۆی بگۆڕێ بیکوژن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٢٣٣٦ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

عیکریمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) یەکێکە لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە، شاگردو فەقێی ئیبنو عەبباس بووە، کۆیلەیشی بووە، بە ڕەگەز بەربەرە، خەڵکی مەغریبە، فەرموودەو حەدیثی لەزۆر لەهاوەڵانی پێغەمبەر وەرگرتووە، یەکێکە لەزانا گەورەکانی سەردەمی خۆی، قورئانزانێکی چاك بووە، ئەیوبو خالیدولحەذذاء فەقێی بوون، دەڵێن گوایە لەبیروباوەڕدا هەوا خوای خەواریج بووە، نافیعو کەسانی تر تۆمەتی درۆیان لێ دەدا، جێگەی متمانەی بوخارییە، بەلام موسلیم بەمەرجێ فەرموودەی عیکریمە دەگێڕێتەوە کە طاووسو سەعیدی کوڕی جوبەیری لەگەڵدا بێ، بۆرە گلەییەك لەبوخاری دەکرێ لەسەر عیکریمە کە نەدەبوو حەدیثی عیکریمە لەبوخاریدا ریوایەت بکا، واتە: عیکریمە لەپیاوانی مەرجی بوخارییە، بەلام لەپیاوانی مەرجی موسلیم نییە، بەلام بەسە بۆ فەضلی عەکرەمە کەجێگەی متمانەی ئیمامی بوخارییە، عیکریمە گەڕیدە بوو، بەوڵاتانا دەسووڕایەوە، کاتێ ئیبنو عەبباس دەمرێ عیکریمە هێشتا ئازاد نەبوو بوو، عەلی کوڕی ئیبنو عەبباس دەیفرۆشێ بەخالیدی کوڕی موعاوییە، بەچوار هەزار دینار!.

عەکرەمە پێی دەفەرموێ: (هەموو عیلمەکەی باوکتت فرۆشت بەچوار هەزار دینار!). ئەویش پەشیمان دەبێتەوەو سەوداکە هەڵدەوەشێنێتەوەو ئازادی دەکا، لەمەدینە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا مردووە (ڕەحمەتو ڕەزای خودای لێ بێ) {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٦٦ = ٧٥ بوخاری}.

١٢٣٠- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ" { أَنَّ أَعْمَى كَانَتْ لَهُ أُمُّ وَلَدَ تَشْتُمُ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَتَقَعُ فِيهِ، فَيَنْهَاهَا، فَلَا تَنْتَهِي، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ أَخَذَ اَلْمِعْوَلَ،

فَجَعَلَهُ فِي بَطْنِهَا، وَاتَّكَأَ عَلَيْهَا. فَقَتَلَهَا فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ:"أَلَا اِشْهَدُوا فَإِنَّ دَمَهَا هَدَرٌ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَرُوَاتُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح، إرواء الغليل للألباني: ٥/٩١ - ٩٢}:

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی کوێریان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ داد پرسی، تا دادگایی بکا، لەبەر ئەوەی کە کەنیزەکێکی خۆی کوشتبوو، کەمناڵیشی لێی هەبوو، کەپێی دەگوترێ: ئوممول وەلەد (دایکی مناڵ) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەڵکەکەی لەدەوری کوێرە بکوژەکە کۆکردەوەو پرسیاری لێی کرد: کابرای کوێرە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم ژنە جنێوی بەتۆ دەداو قسەی پێت دەگوت، منیش چەند جار قەدەغەم لێ کردو پیا هەڵشاخامو ئاگادارم کردەوە کەشتی وا نەکا بەڵام گوێی پێم نەداو هەر بەردەوام بوو لەسەر جنێودان بەتۆ، بۆیە منیش تیغم نایە ورگیو کوشتم.**

**فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (دەسا ئێوە بەشایەت بن کەخوێنی ئەم ژنە پووچو بەتاڵە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٢٣٤١}.**

## ١١- نامەی تۆڵەی تاوان
## كِتَابُ الحُدُودِ

**{بڕوانە: تاجول ئوصول/٣، زنجیرە: ٨١ و ٨٢ لە ژمارە: ٢٢٨٧ هەتا ژمارە: ٢٣٠٥ + فیقهی ئاسان بەرگی دووەم زنجیرە: ٣١٩ چاپی تاران + تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٨٩ لە ژمارە: ٢٠٦٥ هەتا ژمارە: ٢٠٧١ + مختصر صحيح مسلم بەرگی سێیەم لاپەڕە: ١ چاپی یەکەم، زنجیرە: ٨١٤ هەتا زنجیرە: ٨٢٧ لە ژمارە: ١٠٣٦ وە هەتا ژمارە: ١٠٥٠}.**

## ٧٨- باسی تۆڵەی داوێنپیسی
## بابُ: حَدِّ الزَّانى

(فیقهی ئاسان/٢، زنجیره: ٣٢٠)

١٢٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ اَلْجُهَنِيِّ رَضِيَ اَللَّهُ عنهما { أَنَّ رَجُلًا مِنَ اَلْأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَنْشُدُكَ بِاَللَّهِ إِلَّا قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اَللَّهِ، فَقَالَ اَلْآخَرُ - وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ - نَعَمْ. فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اَللَّهِ، وَأْذَنْ لِي، فَقَالَ: "قُلْ". قَالَ: إِنَّ اِبْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنْ عَلَى اِبْنِي اَلرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمَائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ اَلْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي: أَنَّمَا عَلَى اِبْنِي جَلْدُ مَائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَأَنَّ عَلَى اِمْرَأَةِ هَذَا اَلرَّجْمَ، فَقَالَ رَسُولُ ا للَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اَللَّهِ، اَلْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى اِبْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى اِمْرَأَةِ هَذَا، فَإِنْ اِعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، هَذَا وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژماره: ١١٣٢ = ٢٧٢٤، ٢٦٩٥، ٢٧٢٤، ٦٦٣٣، ٦٨٢٧، ٦٨٣٣، ٦٨٣٥، ٦٨٤٢، ٦٨٩٥، ٧١٩٣، ٧٢٥٨، ٧٢٦٠، ٧٢٧٨ + الحدیث ٢٧٢٥، ٢٦٤٩، ٢٦٩٦، ٦٨٢٨، ٦٨٣١، ٦٨٣٦، ٦٨٤٣، ٦٨٦٠، صحيح مسلم شيحا/١٠ ٤٤٠}:

ئەبوهورەیرەو زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پیاوێکی دەشتەکی، هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئەی ڕەوانەکراوی خودا! توبیتو خودا ئەگەر بەپێی نامەی خودا، کە قورئانە بڕیارم بۆ نەدەی!

هاوداواکەیشی، کەوا دیار بوو لەو زرنگتر بوو، گوتی: بەڵێ زۆر باشە، بەپێی نامەی خودا حوکم بکە لەنێوانمانداو دادگایمان بۆ بکە، وە ڕێگەیشم پێ بدە تا من لەپێشا قسە بکەمو شتەکە روون بکەمەوە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ داو فەرمووی: (ئادەی بڵێ). گوتی: کوڕێکی من لەلای ئەمە ڕەنجبەر بوو، ژنەکەی خراپ کردووە، داوێنپیسی لەگەڵدا کردووە، بەمنیان گوت: گوایە کوڕەکەم دەبێ بەردباران بکرێ تا دەمرێ، جا من لەتۆڵەی کوڕەکەمدا سەد سەر مەڕم پێ دا لەگەڵ کەنیزەکێکا، کەلەپاشا کاتێ لە زانایانی شەرعم پرسی، فەرموویان: کە کوڕەکەی من سەد داری حەددی لێ دەدرێو ساڵێ دوور دەخرێتەوە، وەژنەکەی ئەمیش بەردباران دەکرێ، تا دەمرێ.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، بەپێی فەرمانی نامەی خوداو یاسانامەی خودا بڕیار دەدەم لەنێوانتانا، کەنیزەكو سەد سەر مەڕەکە دەدرێتەوە بەتۆ، کوڕەکەت سەد داری حەددی لێ دەدرێو ساڵێ دوور دەخرێتەوەو ڕەهەند دەکرێ، ئەی ئونەیس! تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆلای ژنەکەی ئەم پیاوە ئەگەر هاتوو چووە ژێریو دانی بەتاوانەکەیدا نا، ئەوە بەردبارانی بکە، جا ئونەیس چوو بۆلای ژنەکە، ژنەکە پێی لێ نا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دا، ژنەکەیان سەنگەسار کرد!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٣٥٤ ج/٤}.

١٢٣٢- وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ اَلصَّامِتِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، فَقَدْ جَعَلَ اَللّٰهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، اَلْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ، وَنَفْيُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ، وَالرَّجْمُ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٣٦ = ٤٣٩٢، ٤٣٩٠ = صحيح مسلم: ١٦٩٠}:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کە سرووش (وەحی = نیگا)ی بۆ دەهات، سەخڵەت دەبوو، ڕەنگی دەبڕسکاو دەگۆڕا. فەرمووی: ڕۆژێ سرووشی بۆ هات، تووشی هەمان سەخڵەتیو ڕەنگبڕسکان بوو، کە ئەو بارودۆخی

سرووش بۆ هاتنـه بـەریدا، فـەرمووی: (بڕیارەکانی ئاییـنی پیرۆز لـەخۆم وەربگـرن، بڕیارەکانی ئاییـنی پیرۆز لـەخۆم وەربگـرن، ئاماژە بـەو ئایەتـەی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ:

{فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّـهُ لَهُـنَّ سَبِيلاً – النساء/٤/١٥}:

واتـە: ئـەو ژنانـە کەلـەم ئایەتـەدا باسـکراون کـەخودا لـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ: (ئـەو ژنانـەی کەداوێنپیـسی ئـەنجام دەدەنو بـە بەڵگـەو شـایەت دەچەسپێ لەسـەریان، لەماڵەکانی خۆیانـا زینـدانیان بکـەن، هـەتا دەمـرن، یـا خودا لەبارەیانەوە بڕیاری شەرعتان بۆ روون دەکاتەوە).

پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئاماژە بـەم ئایەتـە فـەرمووی: (ئەو ژنانە کەلـەم ئایەتـەدا باسکراون خـودا لەبارەیانـەوە ئـەم بڕیـارەی داوە: کچو کوڕ یەکی سەد داریان لێ دەدرێو تاماوەی ساڵێکیش شاربەدەر دەکـرێنو رەهەنـە دەکـرێن، ژنو پیـاویش یـەکی سـەرو سـەد داریـان لێ دەدرێو ئـەوجا بەردەبارانیش دەکرێن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٥}.

١٢٣٣– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { أَتَى رَجُلٌ مِنْ اَلْمُـسْلِمِينَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) –وَهُوَ فِي اَلْمَـسْجِدِ– فَنَـادَاهُ فَقَـالَ: يَـا رَسُـولَ اَللَّهِ! إِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَتَنَحَّى تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، حَتَّى ثَنَّى ذَلِـكَ عَلَيْـهِ أَرْبَـعَ مَـرَّاتٍ، فَلَمَّـا شَـهِدَ عَلَـى. نَفْـسِهِ أَرْبَـعَ شَهَادَاتٍ. دَعَاهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ "أَبِـكَ جُنُـونٌ؟" قَـالَ. لَـا. قَالَ: "فَهَلْ أَحْصَنْتَ؟". قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "اِذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخـــاری/مـــەناقیب/٣٦٣٥، ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٣٨ = ٤٤٠٠ ء ٤٤٠١ ترقيم الـشيخ خليل مأمون شيحا. صحيح مسلم: ١٦٩١}:

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: مـاعیزی ئەسـلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتـە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزیکرد: کـە داوێنپیـسی کـردووە، لەوکاتـەدا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەمزگەوت بوو، بـەڵام وەڵامـی پیاوەکـەی نەدایـەوە، بـەڵکوو ڕووی کـرد بـەولاوە، سـا بـەڵکوو واز لـەو قـسانە بهێنـێ، بـەڵام ئـەو لـەولاوە چـووە بەردەمی‌و عەرزیکردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! داوێنپیسم کـردووە، دیـسان پێغەمبـــەر (دروودی خـــودای لەســـەر بـــێ) وەڵامـــی نەدایـــەوەو ڕوووی لێ وەرگێڕایەوە، بەڵام ماعیز دیسانەوە ڕۆیشتەوە بەردەمی‌و عەرزیکردەوە: کەوا داوێنپیسی کردووە، جا هەتا چوار جار ئەم پێلێنانەی دووبارە کردەوەو چوار جار شایەتی لەخۆی دا، کە شەروالپیسی کـردووە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) بانگی کردو پێی فەرموو: (ئایا تۆ شێتیت؟) ماعیز (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: (نەخـەیر، شـێت نـیم) پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (ئایا ژنـت هێنـاوە؟) مـاعیز (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: (بەڵێ ژنم هێناوە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی بیبـەن بەردەبارانی بکەن) ئەوانیش بردیان بـەردەبارانیان کـرد هـەتا مـرد. {تـاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٧ چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

ماعیز کوڕی مالیکی ئەسلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) دائەنرێ بەهاوەڵی پێغەمبـەر، چیرۆکی بـەردەبارانکردنی لەصـەحیحی بوخـاری‌و لـە صـەحیحی موسـلیمدا هەیـە، دائـەنری بەمەدینـەیی، لـەپاش ئـەوەی کـە داوێنپیـسی لێـی

روویدا، تەوبەیەکی جوانی کردو پەشیمان بۆوەو هاتە خزمەتی پێغەمبەرو پێی لەتاوانی خۆی ناو وازی نەهێنا، هەتا بەردەباران کرا، لە فەرموودەیەکا دەفەرموێ: بۆ ئەوەی کە ماعیز پەشیمان ببێتەوە، پێغەمبەر پێی فەرموو: رەنگە هەر ماچت کردبێ؟ گوتی: نەء، تاپێی فەرموو: بەشێوەیێ کە دەق بێ لەسەر داوێنپیسیو هیچ لێکدانەویەکی تر هەڵنەگرێ، پێی فەرموو: {هَلْ نِكْتَهَا؟} : ئایا گاوتە؟ گوتی: بەڵێ گاومە. لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش سەنگەسار کردنەکەی فەرمووی: (ئەمە تەوبەیەکی وەهای کرد، ئەگەر بێتو دابەش بکرێ بەسەر نەتەوەیەکی گەورەدا، بەشی هەموویان دەکا).

لە فەتحولباریدا لەم شوێنەدا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێستا ماعیز لەرووبارەکانی بەهەشت خۆی دەشۆرێ!!).

جا لەم روانگەوە زاناکان (رەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموون:

١- بەهیچ شێوەیێ دروست نییە جنێو بەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بدرێو لەپاش مەرگیان تانەو تەشەریان لێ بدرێ، با گوناهی گەورەشیان لێ قەومابێ چونکە صوحبە، خەڵاتێکی خوداییە.

٢- گێڕانەوەی ئەم جۆرە فەرموودانە بۆ موسوڵمانانو باسکردنیان لەناو وتارو پەڕاوو شتی وادا دروستەو ناباشیی تیادا نییە، وە دانانرێ بەغەیبەتو بوختانو پاشملەگۆیی، چونکە مەبەست لەباسکردنی ئەم جۆرە داستانانە کە لەصەحابەو هەندێ پیاوباشانی نەتەوەی ئیسلام قەوماون،مەبەست سووکیو بێ رێزیو تانەو تەشەر نییە لەوان، بەڵکوو مەبەست پەند وەرگرتنە لەم جۆرە باسو خواسەو لە پلەی یەکەما، مەبەست زانینو فێربوونی بڕیارە شەرعییەکانە لێیان.

١٢٣٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { لَمَّا أَتَى مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهُ: "لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ، أَوْ غَمَزْتَ، أَوْ نَظَرْتَ؟" قَالَ: لَا يَا رَسُولَ اَللَّهِ}. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بوخاری: ٦٨٢٤}:

**لەتاجدا ئاوایە:**

**کاتێ ماعیزی کوڕی مالیك هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە دانی نا بەوەدا، کە داوێنپیسی کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی مەهانەی پەشیمان بوونەوەی بۆ بسازێنێ فەرمووی پێی: (ڕەنگ بێ هەر ماچت کردبێ، یان نوقورچت لێ گرتبێ، یان بەس تەماشات کردبێو بزانی کە ئەم جۆرە شتە ئەو داوێنپیسیەیە، کە مسۆگەری حەددە؟).**

**ماعیز فەرمووی: نا، ئەی پێغەمبەری خودا! تا پێی فەرموو: { هَلْ نِكْتَهَا؟ قَال: نَعَمْ} واتە پێی فەرموو: (ئایا گاوتە؟ گوتی: بەڵێ). فەرمووی پێی: (ژنت هێناوەو بووی بەموحصەن؟) گوتی: بەڵێ ژنم هێناوە جا ئەوسا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد: ماعیزیان سەنگەسار کرد. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٧}.**

١٢٣٥- وَعَنْ عُمَرَ بْنِ اَلْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّهُ خَطَبَ فَقَالَ: إِنَّ اَللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ اَلْكِتَابَ، فَكَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اَللَّهُ عَلَيْهِ آيَةُ اَلرَّجْمِ. قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ اَلرَّجْمَ فِي كِتَابِ اَللَّهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اَللَّهُ، وَإِنَّ اَلرَّجْمَ حَقٌّ فِي كِتَابِ اَللَّهِ عَلَى مَنْ زَنَى، إِذَا أُحْصِنَ مِنْ اَلرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتْ اَلْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ اَلْحَبَلُ، أَوْ اَلِاعْتِرَافُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢١٢٢ = ٧٣٢٣ + تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٣٧٣ = ٣٤٤٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٣٧ = شیحا ٤٣٩٤}:

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم بیست (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەر دوانگە (واتە: لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بێگومان کەخودای گەورە، موحەممەدی ناردووە لەگەڵ ئایینی ڕاستو دروستداو، قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆی، ئایەتی بەردەبارانکردنی داوێنپیسان، جاران ئایەتێ بوو لە قورئان، کە ئەمە دەقەکەیەتی {الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُهُمَا أَلْبَتَّةِ}. واتە: پیاوی سەرەو ژنی سەرە، کاتێ داوێنپیسیان کرد، بەبێ چەندوچوون سەنگەساریان بکەن، تا دەمرن.

ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە بەخودی خۆمان ئەو ئایەتی ڕەجمەمان خوێندووەو لە مەبەستەکەی تێ گەیشتووین، هەرچەندە ئەم ئایەتە لە تیلاوەتدا نەسخ بۆتەوەو لەخوێندنەوەدا سڕاوەتەوەو لەقورئانا نانووسرێ، بەڵام دەگەرو کاریگەریو بڕشتی هەرماوەو هێشتا حوکمی پێ دەکرێ، بۆیە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی خۆیدا، کاری پێ دەکردو داوێنپیسانی بەردەباران دەکرد، ئەوەتانێ ئێمەی یارانو جێنشینانی ئەویش، لەپاش خۆی، داوێنپیسیان بەردەباران (ڕەجم) دەکەین، بەڵام دەترسم کە موسوڵمانان بکەونە سەردەمو ڕۆژگارێکەوە، کەسێ پەیدا ببێ بڵێ: لەنامەی خودادا، ئایەتی بەردەباران کردنی تیادا نییە، ئەوسا بەنەکردنی ئەرکێ، کەخودا لە قورئانا دایناوە لەسەریان، تاوانبار دەبنو لەڕێگەی ڕاستی یاسانامەی خودا دەردەچن!.

دڵنیابن کە بەردەباران کردنی داوێنپیسان فەرمانی نامەی خودایەو ڕاستو دروستو هەقە، وە ئەم فەرمانە (واتە: ئەم حوکمە) بۆ ئەو پیاوو ژنانەیە، کە لەوەوپێش ژنیان هێنابێو بەدەستیان گرتبێ، یاخود شوویان کردبێو مێرد چووبێتە لایانو بەدەستی گرتبن، واتە: موحصەن بن.

بەڵام لەهەلو مەرجێکا کە بەڵگە هەبێ، کەبریتییە لەچوار شایەتی نێرینەی دادپەروەر، یان سك دیاری بداو سکەکە هیچ ئەگەرێکی تری نەبێ، کە لە داوێنپیسییە ژنەکە هیچ مەهانەیەکی شەرعی نەبێ، یا پێلێنانو چوونە ژێرو ددان نان بەتاوانا لەئارادا هەبێ!. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٦ — ش/د/ت/ن}.

١٢٣٦– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { "إِذَا زَنَتْ أَمَةُ أَحَدِكُمْ، فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا، فَلْيَجْلِدْهَا اَلْحَدَّ، وَلَا يُثَرِّبْ عَلَيْهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَلْيَجْلِدْهَا اَلْحَدَّ، وَلَا يُثَرِّبْ عَلَيْهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتِ اَلثَّالِثَةَ، فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا، فَلْيَبِعْهَا وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ.

{تەجرید/٢، ژمارە: ٩٧٣ = ٢١٥٢، ٢١٥٣، ٢٢٣٣، ٢٢٣٤، ٢٥٥٥، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤١ = شیحا ٤٤٢٢ = مسلم ١٧٠٣}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی کەنیزەکەوە، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ ئەمەتە، کە کۆیلەیە لەڕەگەزی مێ، پرسیاری لێ کرا: ئەگەر کەنیزەك داوێنپیسی کردو لەسەری چەسپاو لەهەمان کاتدا موحصەن بوو، واتە: درابوو بەشوو، وەگوێزرا بۆوە، ئایا لەکاتی وادا حەددی شەرعی لەسەرە یا نا؟

فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) (ئەگەر کەنیزەك داوێنپیسی کرد، داری حەددی لێ بدەن، ئەگەر دووبارە داوێنپیسی کردەوە، دووبارە داری

حەددی لێ بدەن، ئەگەر بۆ جاری سێیەم داوێنپیسی کردەوە دیسانەوە داری حەددی لێ بدەنەوە، ئیتر ئەگەر خاوەنەکەی تاڵان فرۆشی کردەوەو فرۆشتوویەتی بەپەتێکی موو، با بیفرۆشێت!).

ئیبنو شەهاب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نازانم لەپاش جاری سێیەم، یان لەپاش جاری چوارەم، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئیتر با بیفرۆشێت!). {تاج/٣، زنجیره: ٩٢، ژماره: ٢٣٥٩ ج/٤}.

١٢٣٧- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { أَقِيمُوا اَلْحُدُودَ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{ضعيف الجامع: ١٠٨٤} + {مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٠٤٢ شیحا/٤٤٢٥}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ داوێنپیسی لە کۆیلەکانتان رووىدا، چی ڕەگەزی مێیان، وەچی ڕەگەزی نێریان، حەددی شەرعیان لێ بدەن، کەبرێتییە لەنیوەی ئەو حەددە شەرعییە، کە دەدرێ لەکەسێکی ئازادی داوێنپیس). {تاجول ئوصول/٣، ژماره: ٢٣٦٠، زنجیره: ٩٣}.

دانەر پێشەوا عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەوە دەفەرموێ: {وَهُوَ فِي مُسْلِمٍ مَوْقُوفٌ}. واتە: ئەم فەرموودەیە لەصەحیحی موسلیمدا مەوقووفە لەسەر ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) کە ئەمە دەقەکەیەتی {مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٠٤٢ شیحا ٤٤٢٥}.

ئەبو عەبدوڕەحمانی سەلەمی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) وتارێکی دا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! داری حەددی شەرعی بدەن لەبەندەو کەنیزەکەکانتان، چی ژن یان پیاو بن، چی کوڕ یان کچ بن، واتە: چی ژیانی هاوسەریان دیبێ، وەچی نەیان دیبێ، چونکە جارێکیان کەنیزەکێکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

داوێنپیسی کردبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم، کەداری حەددی لێ بدەم، کەرِوانیم وا تازە منالّی بووەو هێشتا زەیستانە، ترسم هەبوو، ئەگەر داری حەددی لێ بدەم، لەوانەیە کە لەژێرداری حەددەکەدا بیکوژم، لەبەر ئەوە جێبەجێ کردنی حەددەکەم دواخست، جا کە ئەمەم عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی: (ئافەریم چاکت کرد!). لەگێڕانەوەی ژمارە: (٤٤٢٦ - شیحا)دا: فەرمووی: (باشت کردووە وازی لێ بهێنە هەتا چاك دەبێتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٢٣٨- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حَصِينٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) { أَنَّ اِمْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتْ نَبِيَّ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) -وَهِيَ حُبْلَى مِنْ اَلزِّنَا-فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اَللّٰهِ! أَصَبْتُ حَدًّا، فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، فَدَعَا نَبِيُّ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَلِيَّهَا. فَقَالَ: "أَحْسِنْ إِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ فَائْتِنِي بِهَا" فَفَعَلَ. فَأَمَرَ بِهَا فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا، فَقَالَ عُمَرُ: أَتُصَلِّي عَلَيْهَا يَا نَبِيَّ اَللّٰهِ وَقَدْ زَنَتْ؟ فَقَالَ: "لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِّمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ اَلْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدَتْ أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا لِلّٰهِ؟ } ". رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٣٩ = شیحا: ٤٤٠٧، ٤٤٠٨ = صحيح مسلم/١٦٩٦}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

بورەیدە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مالیکی کوڕی مالیکی ئەسلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆر ستەمم لەخودی خۆم کردووە، داوێنپیسیم کردووە، دەمەوێ کەتۆ پاکم بکەیتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوجارە ڕەتی کردەوە، جا بۆ سبەینێ هاتەوە خزمەتی، گوتیەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووە، پاکم بکەرەوە، بۆ جاری دووەم پێغەمبەر ڕەتی کردەوە، وەلامی نارد بۆ هۆزەکەی

فەرمووی: (ئایا کەموکوڕی لەئەقڵو هۆشیدا گومان دەبەن؟ یان نەنگێکی تری تیادا گومان دەبەن؟). گوتیان: ئەوەی کە ئێمە ئاگامان لێیەتی هۆشی تەواوە، بەپێی بۆچوونی ئێمە لەپیاوچاکانی ئێمەیە، جا بۆ جاری سێیەم هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردیەوە بۆلای هۆزەکەی، پرسیاری لەبارەی حاڵی ماعیزەوە لێ کردنەوە، دیسان گوتیانەوە: هیچ گومان نابەین، نە لەخۆیا، نەلەئەقڵیدا، جا بۆ جاری چوارەم کەماعیز هاتەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە بەردەباران بکرێ، چاڵێکی بۆ هەڵکەندرا، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەردەبارانیان کرد.

فەرمووی: ژنێکیش لەهۆزی غامید هات، عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووە، بەجێبەجێ کردنی حەددی شەرعی پاکم بکەرەوە، پێغەمبەریش گەڕاندیەوەو حەددی بەسەردا جێبەجێ نەکرد، جا بۆ سبەینێ ژنەکە هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی دەمگەڕێنیتەوە رەنگ بێ وەك چۆن ماعیزت گەڕاندەوە منیش بگەڕێنیتەوە، سوێندم بەخودا، سکم پڕە لەکرداری داوێنپیسی.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی کەهەر واز ناهێنیتو ناتەوێ نهێنی خۆت بپۆشیت، دە ئێستا بڕۆ هەتا مناڵەکەت دەبێ).

فەرمووی: جا ژنەکە مناڵەکەی بوو، لەپارچەیێ پەڕۆدا مناڵەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو گوتی: ئەمە مناڵەکەمە بوومە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دە ئێستە بڕۆ شیری پێ بدە، هەتا لەشیر دەبڕێتەوە).

جا کاتێ ژنەکە مناڵەکەی گەورە کرد، هەتا لەشیر بڕییەوە، مناڵەکەی هێنایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەتێ نانی بەدەستەوە بوو دەیخوارد گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە مناڵەکەمە، ئەوەتا بڕیومەتەوە لەمەمكو

ئـەوەتا نـان‌و ئـاو دەخـوات، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) منالّەکـەی دایـە دەسـت پیـاوێ لەموسـوڵمانان، کەسەرپەرشـتی بکـا، ئـەوجا فەرمانی کرد، چاڵێکیان بۆ ژنەکە هەڵکەند، قوڵیەکەی هەتا سەر سینگی بوو، وەفـەرمانی کـرد بەخەڵکەکـە بـەردەبارانیان کـرد، لەوکاتـەدا خالیـدی کـوڕی وەلید بەردێکی هێنا کێشای بەسەری ژنەکەدا، خوێنەکـە فیـچقەی کـرد، چـوو بەدەموچاوی خالیددا، لەسـەر ئـەوە خالیـد جمێنـی بـە ژنەکـە دا، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) جمێنەکـەی خالیـدی بیـست کـەدای بەژنەکـە، فەرمووی: (هێواش ئـەی خالیـد! بەوکەسـە کـەگیانی منـی بەدەسـە، ئـەم ژنـە تەوبەیـەکی جوانی وەهـای کـرد، ئەگـەر بـاجگرو گومرگخـۆریش تەوبـەی وا جوان بکەن، خودا لێیان خۆش دەبێ‌و تەوبەکەیان قەبووڵ دەکا).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو، تەرمی ژنەکەیان ئامادە کرد، وەك شۆردن‌و کفن کـردن، ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی فـەرموو، تـەرمی ژنەکـەیان هێنـا، خـۆی نوێـژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، ئەوجا لەگۆڕستانی موسوڵمانان تەرمەکـەیان ناشت. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦١ چ/٤}.

لێرەدا، واتە: لە (بلوغ المرام)دا ئەم گێڕانەوەیە کەوا لەدواوە:

عیمرانــی کــوڕی حوصــەین (رەزای خــودا لــەخۆی‌و لــەباوکی بێــت) فەرمووی: ژنێکی جوهەینەیی زۆڵێکی لەسکدا بـوو، هاتـە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی رابـەری خـودا! شـایانی حـەددەم حـەددم لێ بـدە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەقـداری ژنەکـەی بانگ کردو پێی فەرموو: (بـاش بـە بـۆی‌و چـاك بـە لەگەڵیـدا کاتـێ سـکەکەی دانا، ژنەکەم بۆ بهێنە، ئەویش ئاوای کردو فەرمایشتەکەی پێغەمبەری بەجێ هێنـا، ئینجـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی فـەرموو ژنەکەیان بەجلەکانی خۆیـەوە شـەتەکدا، هـەتا لـەکاتی سەنگەسارکردنەکەدا،

لەشی دەرنەکەوێ، ئینجا فەرمانی کرد ژنەکەیان بەردەبارانکرد، لەپاشا پێغەمبەر خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد. عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە داوێن پیسی کردووە، کەچی تۆ نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی دەکەی!؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەی عومەر! بەڕاستی ئەمە تەوبەیەکی وەهای کردووە ئەگەر بێتو دابەش بکرێت بەسەر حەفتا کەس، لەخەڵکی مەدینەدا، بەشی هەموویان دەکا، تەوبە لەوە باشتر دەبێ چی بێت کەگیانی خۆی بەخشی لەبەر ڕەزامەندی خودای گەورە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦١ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بڕوانە: (مختصر صحیح مسلم/٣، لاپەڕە: ٣٠٤، ژمارە: ١٢٤٩). ڕوونکردنەوە.

٢- زاناکان دەفەرموون: (الحُدُودُ جَوَابِرُ) واتە: حەددی شەرعی بریتی گوناە دەکەوێ، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکی تەندروستدا دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ تووشی تاوانی شیرك، یان دزین، یان تاوانی داوێنپیسی، یا کوشتن بوو، یا هەر تاوانێکی تر، وە تەوبەی لێ کرد، وەتۆڵەی شەرعی ئەوەی لەجیهاندا لێ سەندرا، ئەوە ئەو تۆڵەو حەددە دەبێ بەکەفارەت بۆی‌و تاوانەکەی دەسڕێتەوە). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٢٤٠٠}.

٣- بڕوانە ژمارە: (١٢٣٣ - ڕوونکردنەوە)و ژمارە: (١٢٢١ - ڕوونکردنەوە) کە لەپێشەوە ڕۆیشتن، هەروا بڕوانە: موختەصەری صەحیحی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٤٩ لەگەڵ ڕوونکردنەوەکەیدا.

٤- کاتێ ماعیز لەسەر راوێژی هەززال، هات بۆلای پێغەمبەرو داوای لە پێغەمبەر کرد، کە بەحەددی شەرعی، کە بەردەباران بوو بۆ ماعیز، لەتاوانی

داوێنپیسی پاکی بکاتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەماعیزی فەرموو: {وَيْحَكَ! ارْجِعْ فَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ وَتُبْ إِلَيْهِ – صحيح مسلم رقم/٤٤٠٦ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا}.

واتە: پێی فەرموو: (هاوار لەخۆت چۆن قسەی وا دەکەیت بڕۆ، داوای لێخۆشبوون لەخودا بکەو تەوبەی لێ بکەو پەشیمان بەرەوە ئەوەت باشترە!). هەروا بەژنە غامیدییەکەشی وا فەرموو: {وَيْحَكِ! ارْجِعِي فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ – صحيح مسلم ترقيم شيحا: ٤٤٠٦}.

وە بەهەززالی فەرموو: کە بەماعیزی گوتبوو: کەبچێ بۆلای پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو لەسەر خۆی ببێ بەشایەتو داوای خۆپاك کردنەوە لە پێغەمبەر بکاو ددان بنێ بەتاوانەکەیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم هەززالەی فەرموو: {يَاهَزَّالُ! لَوْ سَتَرْتَهُ بِرِدَائِكَ لَكَانَ خَيْراً لَكَ!} (المنتقى شرح الموَطَّأ – مبحث ماجاء في الرجم + المسند الجامع لأبي الفضل).

واتە: باشتر وابوو، کە فەرمانت پێ بکردایە کە تەوبە بکاو پەردە لەسەر نهێنی خۆی هەڵنەداتەوەو نهێنی خۆی بپۆشێ، تەنانەت بۆ ئەوەی کە کەسێ چاوی لەتاوانەکەی نەبێو نەبێ بەشایەت لەسەری، تەنانەت لەحاڵی وادا، لەکاتی ئەنجامدانی زیناکردنەکەدا، بەعاباو جلەکانی خۆت، ماعیزو ژنەکەت داپۆشیبایە هەتا کەس بەم کارەیان نەزانێو نەبێ بەشایەت لەسەریان، ئەوەت زۆر باشتر بوو لەمەی کە کردتو ماعیزت تووشی بەردەباران کرد!!. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٢٣٩٥}.

آ- کەواتە: بوون بەشایەت بۆ داوێنپیسی کارێ باش نییە، وەبەپێی توانا شایەتی شتی وا، شایەتییەکەی نەداو بەخراپە باسی ئەو کەسە نەکا، مەگەر لەکاتی ڕاوێژ پێ کردندا، ئەویش بەمەرجێ شایەتییەکە بۆ خودا بێ، وەك کەسێ بڵێ: من کچ دەدەم بەو پیاوە تۆ دەڵێی چی؟

ب- مـەلاو مامۆسـتای ئـایینیو کەسـانی تـر، ئەگـەر کەسـێ لـەم ڕووەوە پرسیاری لێ کردن، بـا پێـی بڵێن: پـەردەی خـودای گـەورەو میهرەبـان لەسـەر خۆت هەڵ مەدەرەوەو بڕۆ تەوبەی لێ بکـەو داوای لێخۆشـبوون لـەخودا بکـەو تەواو.

ج- ئەمـەیش واتـای وا نییـە، کـە ئیـسلام ڕێگـە لـە داوێنپیـسی نـاگرێو بەری بـۆ بـەرەڵا دەکـا، بـەڵکوو بەپێـچەوانەوە، ئیـسلام لەهـەموو ڕوویەکـەوە، بەهەموو هۆکارێکی ڕەوا، ڕێگە بەمونکـەرو کـاری ناشایشـستە نـادا، لەماڵـەوە، لەمزگەوت، لەهۆکاری ڕاگەیاندنەکان، بەدەستو بەزمانو بەهەموو هۆکارێکی ڕەوا، پێشگیری لەکاری ناشایستە دەکاو، هەوڵ دەدا کە کۆمەڵگایەکی نموونـەی پاكو خاوێن گەشە پێ بدا.

١٢٣٩- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَـالَ: { رَجَـمَ رَسُـولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَجُلًا مَنْ أَسْـلَمَ، وَرَجُلًـا مِـنْ اَلْيَهُـودِ، وَاِمْـرَأَةً } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{صحيح مسلم، ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا/٤٤١٧ = مسلم/١٧٠١}:

جابیری کوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سـێ کەسـی لەسـەر داوێنپیـسی بـەردەباران کـرد هەتا مردن، کە ئەم سیانە بوون:

یەکەم: پیاوێ لەهۆزی ئەسلەم.

دووەم: پیاوێکی جوولەکە.

سێیەم: ژنێ.

(ڕوونکردنەوە):

سێیەم لەصەحیحی موسلیمدا/شیحا ژمارە: ٤٤١٧ ئاوەهایە:

{رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ، وَرَجُلاً مِنْ اليَهُودِ، وَامْرَأَتِهِ}. نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: {أَيْ صَاحِبَتَهُ الَّتِي زَنَابِهَا وَلَمْ يُرِدْ زَوْجَتَهُ وَفِي رِوَايَةٍ: وَامْرَأَةً}.

واتە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو ئەم سێ کەسە بەردەباران کران:

١- پیاوێ لەهۆزی ئەسلەم.

٢- پیاوێکی جوولەکە.

٣- ئەو ژنەی کە لەگەڵ پیاوە جوولەکەکەدا شەروالپیسیان کردبوو.

١٢٤٠– وَقِصَّةُ رَجْمِ اَلْيَهُودِيَّيْنِ فِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عُمَرَ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٤٤٦ = ٣٦٣٥، ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣ + تەجرید ژمارە: ١٣٣٧ = ٣٣٢٩ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٠ = شیحا ٤٤١٢. مسلم/١٦٩٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی جوولەکەو ژنێکی جوولەکە، شەروالپیسیان کردبوو، هێنایانن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای جوولەکەکان فەرمووی پێیان: (ئەگەر کەسێ داوێنپیسی بکا، بەپێی تەوراتی ئێوەی ملەتی جوولەکە، چی لەو کەسە دەکەن؟).

گوتیان: ڕووی هەردوولایان ڕەش دەکەینو بەروپشت سواری دوو ولاخیان دەکەینو، دەیانگێڕین بەناو دێدا، هەتا ببن بەپەندی پساتو ڕووزەردو ریسوا ببن!

فەرمووی: (ئەگەر ڕاست دەکەن تەوراتەکە بهێنن). جا تەوراتەکەیان هێناو دەستیان کرد بەخوێندنەوەی، هەتا گەیشتە سەر ئایەتی ڕەجم کردن، ئەو لاوەی کە دەیخوێندەوە ئەو ئایەتەی کرد بەژێر دەستییەوەو پەڕاندیو

نەیخوێنـدەوە، بـەڵکوو ئایەتـەکانی پـێش‌و پاشـی ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە. عەبدوڵڵای کوڕی سـەلام، کەزانایەیـەکی گـەورەی جوولەکـە بـوو، ئیـسلام بـوو بوو، کە ئەوکاتە لەخزمەتی پێغەمبەردا بـوو، عەبـدوڵڵا عـەرزی پێغەمبـەری کرد: ئەی پێغەمبەری خـودا! بـەم لاوە بفـەرموو کـە دەسـتی هـەڵبڕێ، جـا کـە دەستی هەڵبڕی ئایەتەکە لەژێر دەستیدا بوو.

ئینجا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی فـەرموو: ژن‌و پیـاوە جوولەکەکـەیان سەنگەسـار کـرد. ئیبنـو عومـەر دەفـەرموێ: مـن خـۆم یـەکێك بـووم لـەو کەسـانە کـە بـەردەبارانیان کـردن، سـەرەنجم دا کەپیاوەکـە خۆی دەدایـە بـەر بـەردەکان هـەتا بەرژنەکـە نەکـەون!. {تـاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٥٥٨ چ/٤}.

ئەمە دەقی ئەو فەرموودەیە کە دانەر لەم ژمارەیەدا ئاماژەی بۆ دەکا.

١٢٤١- وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عِبَادَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { كَانَ بَيْنَ أَبْيَاتِنَا رُوَيْجِلٌ ضَعِيفٌ، فَخَبَثَ بِأَمَةٍ مِنْ إِمَائِهِمْ، فَذَكَرَ ذَلِكَ سَعْدٌ لِرَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: "اِضْرِبُوهُ حَدَّهُ". فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّهُ أَضْعَفُ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: "خُذُوا عِثْكَالًا فِيهِ مِائَةُ شِمْرَاخٍ، ثُمَّ اِضْرِبُوهُ بِهِ ضَرْبَةً وَاحِدَةً". فَفَعَلُوا } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ . لَكِنْ اخْتُلِفَ فِي وَصْلِهِ وَإِرْسَالِهِ.

{صحيح ابن ماجة/٢٠٨٧. أحمد/٥/٢٢٢ رقم: ٢١٩٨٥. نسائي/الكبرى رقم: ٧٣٠٩. ابن ماجة/٢٥٧٤}:

سەعیدی کوڕی سەعدی کـوڕی عوبـادە (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی بێ) فەرمووی: لەناو ماڵەکانماندا، پیاوێکی ئیفلیج هـەبوو، لەگـەڵ کـەنیزەکێ لـە کەنیزەکـەکانیان داوێنپیـسی کردبـوو، سـەعدی بـاوکم ئەمـەی باسـکرد بـۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (داری حـەددی داوێنپیـسی لێ بدەن کە سەد دارە).

عـەرزی پێغەمبـەریان کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەوەنـدە لاوازو لازەبوونــە بەرگــەی شــتی وا نــاگرێ؟! فــەرمووی: (کەواتــە: داری هێــشوو خورمایەك بهێنن کە سەد وردە لقی پێوە بێت، ئـەوجا ئـەو داری هێشووەی یەکجار پیا بکێشن، لەباتی حەددی داوێنپیسییەکەی، ئەوانیش وایان کرد).

(ڕوونکردنەوە):

١- سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دلیمی کوڕی حاریثـە، خـەزرەجیـە، کاتێ پێغەمبەرو هاوەڵانی کۆچو بارو ڕەویـان کـرد، لەمەککەی پـیرۆزەوە، بـۆ مەدینەی نازدار، مەدینە دوو هۆزی گەورەی تیادا بوو، ناویان: هۆزی ئـەوس‌و هۆزی خەزرەج بوو، بەو کەسانەی کە لەهۆزی ئەوس بوون دەگوترێ: ئەوسی، وە بەوانـەی کـە لـەهۆزی خـەزرەج بـوون دەگـوترێ: خـەزرەجی، وە هـەردوو هۆزەکەیش بەشێکن لە ئەنصار، کە ئەنصار برێتی بوون لە موسوڵمانانی ئـەو کاتەی مەدینە.

سەعد ئەنصارییە، کەسناو (کونیە)ی (أبو ثابیت = بـاوکی ثابیـت) بـوو، نەقیبی بەرەبابی ساعیدییە بوو، واتە: سەرگەورەو دەمڕاستیان بـوو، هەنـدێ دەفـەرموون: فریــای غــەزای بــەدر کــەوتووە، گــەورە پیــاوێکی بەخــشندەو بەخشەر بـوو، لەگشت جـەنگ‌و غـەزاو نەبەردەکانـدا، ئـاڵای ئەنـصارەکان لای ئـەو بـوو، پیـاوێکی هێـژای ڕێـزداری قـورس‌و گـران بـوو، لـەناو یاریـدەدەران (ئەنصار)دا، هەم سەرۆك بوو، هەم فەرماندە، هۆزەکەی بەوە ناسیبوویان.

هـەموو ڕۆژێ قەرەوانەیـەکی گـەورەی پـڕ لەمەرگـەو تریـت دەبـرد بـۆ خزمــەتی پێغەمبــەرو یــارانی، پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) تەشریفی لەکوێ بوایە، ئەو سینیە ڕازاوەی دەبرد بۆ ئەوێ، دەڵێن: گیا لەسەر بنجی خـۆی دەڕوێتـەوە، جـا لـەم لایەنـەوە: منـاڵ‌و خزمەکانیـشی وەك خـۆی بەخشندەو بەخشەر بوون، بەتایبەتی قەیسی کوڕی.

جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆ سەردانی سەعد کە لەماڵەوە دەبێ، لەبەردەرگا دەوەستێو دەیەوێ بەم شێوەیە داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوە بکاتو دەفەرموێ:

{السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّه = سلاوو رەحمەتی خوداتان لەسەر بێت}

سەعدیش بەپەنامەکی وەلامی سلاوەکەی دەداتەوە، قەیسی کوڕیشی لە مەبەستەکەی باوکی تێ ناگاتو لەبەر ئەوە پێی دەڵێ: ئەوە بۆچی وەلامی سلاوەکەی پێغەمبەر نادەیتەوە؟

باوکیشی پێی دەڵێ: (وازبێنە با سلاوی زۆرمان لێ بکاو سلاوکردنەوەکەی دووبارەو سێبارە بکاتەوە!).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پاش ئەوە چەندجارێ سلاو دەکاو گوێی لەوەلام نابێ دەگەڕێتەوە. سەعد شوێنی دەکەوێ شتەکەی بۆ روون دەکاتەوەو عەرزی دەکات: ئەی پێغەمبەری خودا! گوێمان لەسلاوەکانت بوو، بە پەنامەکی سلاومان دەدایەوە، هەتا سلاوی زۆرمان لێ بکەیتو لەپیتو فەڕی سلاوەکانت زیاتر بەهرەدارو پیرۆز ببین.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵیدا گەڕایەوە، لەماڵی سەعد، سەعد ئاوی بۆ ئامادە کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی شۆرد، سەعد بالاپۆشێکی دا پێی، کە بەزەعفەران رەنگ کرابوو، لەبەری کرد، ئەوجا هەردوو دەستی بەرزەوە کردو ئەم نزایەی کرد بۆیان:

(خوایە! سۆزو میهرەبانیو رەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر خانەوادەو بنەماڵەی سەعدی کوڕی عوبادەدا).

ئالاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی ڕزگار کردنی مەککەدا، لەلای سەعد بوو، بەلام کەسەعد لەلای ئەبو سوفیان هەڕەشەی لەهۆزی قوڕەیشو سەردارانی مەککە کردو بەئەبو سوفیانی گوت: ئەی ئەبو

سوفیان! ئەمڕۆ ڕۆژی کوشت و کوشتارە، ئەمڕۆ قڕ دەخەینە ناو ناموسوڵمانەکانی مەککەوە! بەتایبەتی سەرۆکەکانیان!

کاتێ ئەبو سوفیان بەخزمەتی پێغەمبەر گەیشت، قسەکەی سەعدی گێڕایەوە بۆی و پەرۆشی خۆی بۆ خەڵکی مەککە دەربڕی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەعد درۆ دەکات، لەخۆیەوە قسەی وا دەکات، بەڵکوو بەپێچەوانەوە ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە، کەخودا قەدرو ڕێزی کەعبەی تیادەگرێ و ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە کەعبە پۆشتەو پەرداخ دەکرێتەوە!).

ئەوجا فەرمانی کرد، ئاڵاکەیان لەسەعد سەندەوەو ئاڵاکەیان دا بەقەیسی کوڕی سەعد. {بڕوانە: تەجرید/٤، ژمارە: ١٥٨٥}.

سەعد کوڕێکی ناوی سەعید بوو، کوڕێکی تری ناوی قەیس بوو، کوڕێکی تری ناوی ثابیت بوو، سەعدو سەعیدی کوڕی و قەیسی کوڕی، هەرسێکیان شانازی هاوەڵێتی پێغەمبەریان پێ بڕابوو، هەرسێکیان هاوەڵ و هاوڕێی پێغەمبەر بوون. کاتێ لەسەقیفەی بەنی ساعیدەدا، پەیمانی جێنشینی درا بە ئەبو بەکر، سەعد پەیمانی نە بەئەبو بەکرو نەبە عومەر دا، وەکۆچ و ڕەوی کرد بۆ شام، وە لەوێ لەگوندێ، لەناوچەی غوطەی دیمەشق، کە گوندەکە ناوی (المنیحة)یە، لەساڵی یازدە، یان چواردە، یان پازدەی کۆچی مردووە، وەگۆڕەکەی وا لەوێ، گۆڕەکەی ناسراوە موسوڵمانان سەردانی شەرعی گۆڕەکەی دەکەن.

١٢٤٢- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: { مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا اَلْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ، وَمَنْ وَجَدْتُمُوهُ وَقَعَ عَلَى بَهِيمَةٍ، فَاقْتُلُوهُ وَاقْتُلُوا اَلْبَهِيمَةَ }". رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالْأَرْبَعَةُ، وَرِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ، إِلَّا أَنَّ فِيهِ اِخْتِلَافًا.

{صحيح، إرواء الغليل/٢٣٥٠}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بینیتان یەکێ پیشەکەی هۆزی لووط دەکات، واتە: هەتیو بازەو بەپاش سواری یەکێ بووە، ئەوە بکەرو بەدەر هەردووکیان بکوژن، هەروەها ئەگەر دینیتان کەسێ چووەتە لای چوارپا (بەهیمە)و کردەی جووتبوونی لەگەڵ ئاژەڵێکا ئەنجام داوە، ئەوە هەم خۆیو هەم ئاژەڵەکە بکوژن). {فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٨٨١، زنجیرە: ٣٢٣}.

لە تاجا ئەمەی پترە: دەڵێ: گوتم بەئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) چوارپاکە بۆچیو لەبەر چی دەکوژرێت؟

فەرمووی: وادەزانم بۆیە پێغەمبەر وایفەرموو: چونکە حەزی نەدەکرد کە گۆشتی شتی وا بخورێ، لەگەڵ کردنی ئەو ئیشە ناشیرینە لەگەڵیدا. (ئیمامی ئەبو داوودو ئیمامی تەرمەزی، خودایان لێ ڕازی بێ ئەم فەرموودەیان جارێ بەمەرفووعی – واتە: بە بەرزەوەکراوی تاسەر پێغەمبەر خۆی – وجارێ بە مەوقووفی – واتە: بە بەرزەوەکراوی تاسەر ئیبنو عەبباسو گوتراوە: ئیبنو عەبباس خۆی دەفەرموێ: (ئەگەر دینیتان کەسێ چووەتەلای ئاژەڵێ.........تاد) نەوەك پێغەمبەر وابفەرموێ؟. ئەم دوو ئیمامە، ئەم فەرموودەیان بەم دوو شێوەیە گێڕاوەتەوە. جا لەبەر ئەوە بەلاوازو زەعیف دائەنرێ. وە کەس لەچوار مەزهەبەکان ڕەفتو کاریان بەم فەرموودەیە نەکردووە، نە ئاژەڵەکە دەکوژرێو نەجووتبوو لەگەڵ ئاژەڵەکەدا دەکوژرێ، ئەوەندە هەیە فەرمانڕەوا چی بەباش دەزانێ بەوە بکەرەکە تەمێو سەرکۆنە دەکا، کە بەشتی وا لەیاسانامەدا دەگوترێ: تەعزیز. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٢٣٦٢، ٢٣٦٤}.

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەحمەدو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، بەلام ڕاجیایی زۆر لەجێبەجێ کردنیدا هەیە.

١٢٤٣- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ضَرَبَ وَغَرَّبَ وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ ضَرَبَ وَغَرَّبَ. } رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، إِلَّا أَنَّهُ اخْتُلِفَ فِي رَفْعِهِ، وَوَقْفِهِ.

{صحيح الإرواء: ٢٣٤٤}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەتاوانباری زیناکار، داری حەددی لێ دەدا، ئەوجا شاربەدەری دەکرد، هەروا ئەبوبەکر داری حەددی لێ دەداو شاربەدەری دەکرد، هەروا عومەر داری حەددی لێ دەداو شاربەدەری دەکرد).

دیسان دەفەرموێ: تەرمەزی گێڕاویەتەوە، پیاوانی ڕشتەکەی متمانەدارن، بەڵام ڕاجیایی لەوەدا هەیە کەئایا مەرفووعە، یا مەوقووفە.

١٢٤٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْمُخَنَّثِينَ مِنْ اَلرِّجَالِ، وَالْمُتَرَجِّلَاتِ مِنْ اَلنِّسَاءِ، وَقَالَ: { أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ}. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريد البخارى/٥، ژمارە: ١٩٠٣ = ٥٨٨٦، ٥٨٨٥، ٦٨٣٤ بوخارى}:

لەتەجریدا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرەتی کردووە لە پیاوی سەرژنانیو لەژنی کوڕانی، وە فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەم جۆرە کەسانە مەهێڵن بێنە ماڵتان، ئەگەر هاتنە ماڵیشتان دەریانکەن). گوتی: وە پێغەمبەر خۆی فیسارە کەسی وەدەرنا، وە عومەریش فیسارە ژنی وەدەرنا). {ریاض/٤، لاپەڕە: ٧٧، زنجیرە: ٢٩٢، ژمارە: ١٦٣١ + تاج/٤، لاپەڕە: ١٥٠، زنجیرە: ٤٧، لاپەڕە: ١٥٠، ژمارە: ١ چاپی یەکەم = تاج/٣، زنجیرە: ٤٧، لاپەڕە: ٢٩٨، ژمارە: ٢٨٩١ + تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٢٣٨١ ج/٤ = چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٥٧}.

لەتاجول ئوصولیشدا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەعنەتو نەفرینی کردووە لەپیاوی ژنانیو لەژنی کوڕانی، وە دەیفەرموو: (مەهێڵن کە ئەم جۆرە کەسانە بێنە ماڵتان). پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) فیسار (واتە: ئەنجەشە)ی شاربەدەر کرد، چونکە سـەرژنانی بـوو، عومـەریش لەسـەر هـەمان شـت مـاتیعی ڕەهەنـە کـرد. {ب/د/ت/ن – تاج/٣، ژمارە: ٢٣٨١}.

١٢٤٥– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اِدْفَعُوا اَلْحُـدُودَ، مَـا وَجَـدْتُمْ لَهَـا مَـدْفَعًا } أَخْرَجَـهُ اِبْـنُ مَاجَـهْ، وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ.

{ضعيف ابن ماجة/٥٥٤}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهەر مەهانەو بیانوویەك دەست بدا، حەددی شەرعی لەسەر تاوانبار لابەرن).

١٢٤٦– وَأَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ: مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) بِلَفْظِ {اِدْرَأُوا اَلْحُدُودَ عَنْ اَلْمُسْلِمِينَ مَا اِسْتَطَعْتُمْ}" وَهُوَ ضَعِيفٌ أَيْضًا.

{ضعيف الجَامِعِ: ٢٥٩}:

لەتاجا ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: (هەتا بۆتان دەکرێ حەدد لـەکۆڵ موسـوڵمانان دووربخەنـەوە، ئەگـەر چاری دەکـرا بـە کۆلکـە بەهانـەیێ، حەددەکـە لەسـەر موسـوڵمانەکە لابەرنو وازی لێ بهێـنن، چـونکە پێـشەوا بەهەڵـە لەکەسـێ خـۆش ببـێ، ئـەوە باشترە لەوە کە بەهەڵە تۆڵە لەکەسێ بستێنێ!). {ترمـذی/حـاکم/ بەیهـەقی. سەنەدی حاکمو بەیهەقی تەندروستە}. {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٢٣٩٧}.

١٢٤٧- وَرَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ: عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) (مِنْ) قَوْلِهِ بِلَفْظِ: { ادْرَأُوا اَلْحُدُودَ بِالشُّبُهَاتِ}.

{ضعيف إرواء الغليل/٢٣١٦}:

**بەیهەقیش ئەم فەرموودەیەی بە مەوقووف لەسەر عەلی ریوایەت کردووە، کە عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر بەبۆرە گومانێکیش بووە پاڵ بە حەددە شەرعییەکانەوە بنێن و لەکۆڵیان بکەنەوە).**

١٢٤٨- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { اِجْتَنِبُوا هَذِهِ اَلْقَاذُورَاتِ اَلَّتِي نَهَى اَللَّهُ تَعَالَى عَنْهَا، فَمَنْ أَلَمَّ بِهَا فَلْيَسْتَتِرْ بِسِتْرِ اَللَّهِ تَعَالَى، وَلِيَتُبْ إِلَى اَللَّهِ تَعَالَى، فَإِنَّهُ مَنْ يَبْدِ لَنَا صَفْحَتَهُ نُقِمْ عَلَيْهِ كِتَابَ اَللَّهِ ﷻ} رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ، وَهُوَ فِي "اَلْمُوَطَّإِ" مِنْ مَرَاسِيلِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ.

{صحيح الجَامِعِ: ١٤٩}:

**ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆتان بپارێزن لەو کارو گوتە چەپەڵ و قیزەونانەی کە خودای گەورە جڵەوگیریی لێیان کردووە، جا ئەگەر کەسێ قەرەی شتی وا کەوت، با پەردەی خودا لەسەرخۆی هەڵنەداتەوەو لەسەر خۆی نەبێ بەشایەت، بەڵکوو بەزوویی تەوبەی لێ بکات و لێی پەشیمان ببێتەوە، دەنا ئەگەر کەسێ لەلای ئێمە پێ لەتاوانی خۆی بنێ، ئێمەیش بەپێی قورئانی پیرۆز کە نامەی خودای گەورەیە، شایانی چی بێ ئەوەی بەسەردا جێبەجێ دەکەین!).**

**ئەم فەرموودەیە لە (الموطأ)دا ئاوایە، لە مورسەلی زەیدی کوڕی ئەسلەمە (صحیح الجامع: ١٤٩):**

**زەیدی کوڕی ئەسلەم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا، پیاوێ لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرخۆی**

دەبێ بەشایەتو دەڵێ کە داوێنپیسیم کردووە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای قەمچی دەکا، هەتا داری حەددی لێ بدا، چونکە کابرا مُحْصَن نابێ، قەمچییەکی شکاوی بۆ دەهێنن، دەفەرموێ: (با لەمە باشتربێ، ئەمە ئێشی کەمە). جا قەمچییەکی تازەی بۆ دەهێنن، کە نووکەکەی نەکرابوو بەریشوو، فەرمووی: (نەوەك یەکەم شکاوو نەوەك دووەم رەقو خۆشە نەکراو!!).

ئەوجا قەمچییەکی بەکارهێنراویان بۆیهێنا، کە لەکاتی سواری وڵاخدا بەکارهاتبوو، کلکەی نەرم بوو بوو.

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەو قەمچییە سەد قەمچییان لێدا. ئەوجا فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! کاتی ئەوە هاتووە کە خۆتان بپارێزن لەو تاوانانەی کەدەبن بەهۆی حەددێ لەحەددەکانی خودا، دەنا ئەگەر کەسێ لەلای ئێمە پێی لەتاوانی خۆی نا، ئێمەیش بەپێی یاسانامەی خودای گەورە شایستەی چی تۆڵەیێ بێ، ئەوەی بەسەردا جێبەجێ دەکەین).

## ٧٩- باسی تۆڵە (حەدد)ی بوختیان
## بَابُ: حَدِّ الْقَذْفِ

{بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٩٥، لەژمارە: ٢٣٦٨وە هەتا ژمارە: ٢٣٧٢ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٢٧ و ٣٢٨ = لاپەڕە: ٨٨٧ - ٨٨٩}.

١٢٤٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: { لَمَّا نَزَلَ عُذْرِي، قَامَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عَلَى اَلْمِنْبَرِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ وَتَلَا اَلْقُرْآنَ، فَلَمَّا نَزَلَ أَمَرَ بِرَجُلَيْنِ وَامْرَأَةٍ فَضُرِبُوا اَلْحَدَّ } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَالْأَرْبَعَةُ.

{حسن صحيح الترمذي: ٢٥٤٢}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ لە قورئانا، لەسوورەتی (نـور - ١١/٢٤ - ٢٠)دا، ئـەو ئایەتانـە هاتنـە خـوارەوە بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـەدەبن بـە بەڵگـەو شـایەتی داوێنپـاکی مـن‌و بوختانچییەکان بـەدرۆ دەخەنـەوە، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕۆیشت بۆ مزگەوت‌و تەشریفی چووە سـەر دوانگـە (مینبـەر)و باسـی پـاکی‌و بێتاوانی منی کردو ئەو هەژدە ئایەتەی قورئانی بۆ ئامادەبوان خوێندەوە، کە دەسـت پـێ دەکـەن لـە {إِنَّ الَّـذِينَ جَـاؤُوا بِالْإِفْـكِ عُـصْبَةٌ مِّـنكُمْ} هـەتا هـەژدە ئایەتەکە تەواو دەبن. کاتێ لەدوانگەکە دابەزی، فـەرمانی کـرد: داری حـەددی بوختیانیان لەدوو پیاوو لەژنێ دا.

پیاوەکـان حەسـسانی کـوڕی ثابیـت‌و میـسطەحـی کـوڕی سـەلما بـوون‌و ژنەکـەیش حەمنـەی کـچی جـەحش بـوو. {بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری/٤، ژمـارە: ١١٢١ = ٢٦٦١ بوخـاری + ١١٠٧ = ٢٥٩٣، ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٠،م ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥}.

١٢٥٠- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { أَوَّلَ لِعَانٍ كَانَ فِي اَلْإِسْلَامِ أَنَّ شَرِيكَ بْنُ سَمْحَاءَ قَذَفَهُ هِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ بِامْرَأَتِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "اَلْبَيِّنَةَ وَإِلَّا فَحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ "} اَلْحَدِيثَ أَخْرَجَهُ أَبُو يَعْلَي، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح، سنن النسائي: ٣٤٦٩}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: یەکـەم جـار کـە کـردەی شـەڕە نـەفرین، لەسـەردەمی ئیسلامدا ڕوویدا، ئـەوەبوو: کـە هـیلالی کوڕی ئومەییە هاتەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەریکی کوڕی سەحمای نـا بـەقنگی ژنەکـەی خۆیـەوەو گـوتی: شـەریکم بەسـەر ژنەکەمـەوە گرتووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (شـتی وا بەقـسەی

رووتـی بـێ بەڵگـە ناچەسـپێ، یـا بەڵگـەو شـایەت راسـت دەکەیتـەوە، یـا داری حەددی بوختیان کـە هەشـتا دارە لەپـشتت دەدرێ!). {تەجریـدی بوخـاری/٤، ژمارە: ١٦٧٦ = ٤٧٤٧ بوخاری}.

١٢٥١- {وَفِي البخاری نَحْوُهُ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ عَبَّاسٍ}.

{البخاری: ٤٧٤٧}:

ئـەم فەرموودەیـە لـە تەجریـدی بوخاریـدا درێـژە، لـە ژمـارە (١٢٥٠)دا مەبەست لێی رابورد، لە بوخاریدا لەئیبنو عەبباسـەوەیە، دەفـەرموێ: هـیلالی کـوڕی ئومەییـە هاتـە لای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) شـەریکی کـوڕی سـەحمای نـا بـەقنگی ژنەکـەی خۆیـەوەو گـوتی: شـەریکم بەسـەر ژنەکەمەوە گرتووە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شتی وا بەقـسەی رووتـی بـێ بەڵگـەو شـایەت ناچەسـپێ، یـا بەڵگـەو شـایەت راسـت دەکەیتـەوە لەسـەر داواکـەت، یـا داری حـەددی بوختیـان لەپـشتت دەدرێ... تاکۆتایی فەرموودەکـە). {بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری/٤، ژمـارە: ١٦٧٦ = ٤٧٤٧ بوخاری}.

لەدوا ئەم ژمارەیەوە لەزۆر لـە سەرچاوەکاندا، ئـەم فـەرموودەی تـریش هەیە، کە لەئەصڵە موعتەمەدەکەی ئەم تەرجەمەیەدا نییە:

وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: { لَقَدْ أَدْرَكْتُ أَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمْ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ، فَلَمْ أَرَهُمْ يَضْرِبُونَ اَلْمَمْلُوكَ فِي اَلْقَذْفِ إِلَّا أَرْبَعِينَ} رَوَاهُ مَالِكٌ، وَالثَّوْرِيُّ فِي "جَامِعِهِ".

{سنن البیهقی الکبری: ١٦٩١٧}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی عـامیری کـوڕی رەبیعـە (رەحمـەتی خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: مـن بەسـەردەمی ئەبوبـەکرو عومـەرو عوسمـانو کەسـانی دوا ئەوانیشدا گەیشتووم کاتێ داری حەددی بوختانیان لەکەسێ دەدا، کـە کۆیلـە بێ، چی نێرینە بێ، وەچی مێینە بێ، تەنیا چل داریان لێ دەداو بەس).

**(ڕوونكردنەوە):**

**١- بۆ ژیاننامەی عامیری كوڕی ڕەبیعە، بڕوانە: ژمارە (٢٥٥) كە لەپێشەوە لەم پەڕاوە پیرۆزەدا ڕابورد.**

**٢- عەبدوڵڵای كوڕی عامیری كوڕی ڕەبیعەی یەحصەبی، ئیمامی خەڵكی شام بوو لەزانستی قیرائەتدا، ناسراو بوو بە (أبو عمران) یەكێكە لەحەوت قورئانخوێنە گەورەكان، كە ناسراون بە (القُرَّاءُ السَّبْعَة).**

**لەئەبو دەردائی هاوەڵی پێغەمبەرەوە، قیرائەتی قورئانی وەرگرتووە، قازی دیمەشق بوو، لەساڵی (١١٨)ەی كۆچی‌دا مەرگ بوو بەمیوانی.**

**١٢٥٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { مِنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ يُقَامُ عَلَيْهِ اَلْحَدُّ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.**

**{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٣ = ٦٨٥٨ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٠٣ = شیحا ٤٢٨٧ = صحيح مسلم/١٦٦٠}:**

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (كەسێ بوختیان بكا بۆ كۆیلەی خۆی، كۆیلەكە نێربێ، یا مێ، بەڵام كۆیلەكە بێ تاوان بێ‌و پاك بێ‌و دووربێ لەو قسەو بوختیانە، ئەوە ئەو كەسە بوختیانكەرە، لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر كردنی ئەو بوختیانە داری حەددی لێ دەدرێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ٢٣٧٠}.**

## ٨٠- باسى تۆڵە (حەدد)ى دزى

## بَابُ: حَدِّ السَّرِقَة

{بڕوانە: فیقهى ئاسان:٢، زنجیرە: ٣٣٣}.

١٢٥٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا تُقْطَعُ يَدُ سَارِقٍ إِلَّا فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. وَلَفْظُ اَلْبُخَارِيِّ: "تُقْطَعُ يَدَهُ السَّارِقِ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا "

{تەجریدى بوخارى/٥، ژمارە: ٢٠٦٩ = ٦٧٨٩، ٦٧٩٠، ٦٧٩١ بوخارى. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٣ = شيحا ٤٣٧٨ = مسلم/١٦٨٤}:

لەموسلیما ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: خۆشەویست (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) دەفەرموىٚ: (دەستى دز بەپێى شەرع، کاتىٚ دەبڕرىٚ، کە دزەکە بایى چارەکىٚ دینارى زێڕ بدزىٚ، یا بایى زیاتر بدزىٚ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٢٣٤٣، چ/٤ = چاپى چوارەم}.

لەتەجریدى بوخاریشدا ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خوداى لىٚ بىٚ) دەفەرموىٚ: خۆشەویست (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) دەفەرموىٚ: (دەستى دز بەپێى شەرع کاتىٚ دەبڕرىٚ کە بایى چارەکىٚ دینارى زێڕ بدزىٚ، یا بایى زیاتر بدزىٚ).

وَفِي رِوَايَةٍ لِأَحْمَدَ "اِقْطَعُوا فِي رُبُعِ دِينَارٍ، وَلَا تَقْطَعُوا فِيمَا هُوَ أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ"

{صحيح الجامع/١١٨١}:

لەگێڕانەوەیەکى ئیمامى ئەحمەددا:

پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) دەفەرموىٚ: (کاتىٚ دز بایى چارەکىٚ دینارى زێڕى دزى دەستى ببڕن، بەڵام ئەگەر لەوە کەمترى دزى بوو دەستى مەبڕن).

١٢٥٤- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): { أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَطَعَ فِي مِجَنٍ، ثَمَنُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥ ژمارە: ٢٠٧١ = ٦٧٩٥، ٦٧٩٦، ٦٧٩٧، ٦٧٩٨ بوخاری. مختصر صحیح موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٤٤ = شیحا ٤٣٨٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی دزێکی بڕی، لەسەر دزینی قەڵخانێ کە بایی سێ درەم بوو!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٢٣٤٤، ج/٤}.

١٢٥٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَعَنَ اَللَّهُ السَّارِقَ " يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ ، فَتُقْطَعُ يَدُهُ ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ ، فَتُقْطَعُ يَدُهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ أَيْضًا.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٦٨ = ٦٧٨٣ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٥ = شیحا ٤٣٨٤ = مسلم/١٦٨٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەفرەتو لەعنەتی خودا لەدز، کە ئەوەندە نەفسی سووکە، لەسەر دزینی هێلکەیێ، یا بەهۆی دزینی گوریسێکەوە، بەپێی شەرع دەستی دەبڕن). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٢٣٤٢ ج/٤}.

١٢٥٦- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) " أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَتَشْفَعُ فِي حَدٍ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ؟ " .ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ ، فَقَالَ: " أَيُّهَا النَّاسُ ! إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ . . .} الْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. وَلَهُ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ: عَنْ عَائِشَةَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ ، وَتَجْحَدُهُ ، فَأَمَرَ الْنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِقَطْعِ يَدِهَا.

{تەجریـــدی بوخـــاری/٤، ژمـــارە: ١٤٧٠ = ٣٧٣٣، ٢٦٤٨، ٣٤٧٥، ٣٧٣٢، ٣٧٣٣، ٤٣٠٤، ٦٧٨٧، ٦٧٨٨، ٦٨٠٠. مختـــصر صـــحيح مـــسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٦ = شیحا ٤٣٨٧ = مسلم/ ١٦٨٨}:

دەقــی فــەرموودە (متفــق علیــە)ی‌یەکەلــە (مختــصر صــحیح مــسلم)دا، ئاوەهایە:

عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (درووودی خـودا لـە پێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەهـەموو هاوسـەرە پاکیزەکانی) فـەرمووی: ژنێکـی مـەخزوومی دزیـی کردبـوو، قـورەیش زۆر بـە تەنگیـەوە بـوون، دەیانویـست کـە دەسـتی نـەبڕێ لەسـەر ئـەو دزی‌یـە، ئەمـەیش لەسـەردەمی پێغەمبـەر خـۆی‌دا بـوو، لـەکاتی غەزای ئازادکردنی مەککەدا بوو، گوتیان: بەکێ بڵێین کە لەم بارەیەوە لەگەڵ پێغەمبەردا قسە بکا؟ گوتیـان: کـێ پڕکێـشی ئـەوە دەکـا، لـە ئوسـامەی کـوڕی زەید بەولاوە، کە خۆشەویستی پێغەمبەرە (درووودی خودای لەسەر بێ).

جـا کەژنەکـەیان بـرد بـۆلای پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) ئوسامە لەبارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد.

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندە قسەکەی ئوسـامەی پـێ نـاخۆش بـوو، کـە لـەبارەی ئـەو ژنـە مەخزوومییـەوە کـردی، ڕەنگـی گـۆڕاو فـەرمووی: (ئـەوە چـۆن هەڵـەی وا دەکـەی، دەچـی تکـا دەکـەی بـۆ جێ‌بـەجێ نەکردنی حەددێ لە حەددە شەرعی‌یەکان، کە خودای گەورە خۆی دایناوە؟).

جـا ئوسـامە لـە هەڵەکـەی خـۆی پەشـیمان بـۆوەو عـەرزیکرد: ئـەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوونم لـەخودا بـۆ بکـە، کـە لـەم هەڵەیـە لـێم خۆش ببێ!

جا سەر لەئێوارێ، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) هەڵسایەوە وتارێکی دا، لەپێشا سوپاس‌و ستایـشێکی جوانی خـودای کـرد، بەشـێوەیێ کە هەرشایانی ئەوبێ، ئەوجا فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ):

(پاش سوپاس‌و ستایشی خودای گەورە، ئەی خەڵکینە! دەزانن کە بۆچی نەتەوەکانی پێش ئێوە لەناوچوون‌و بەفەتارەت چوون؟ چونکە کاتێ کەسێکی خانەدان لەناویانا دزی بکردایە، وازیان لێ دەهێنا، بەڵام ئەگەر لازەبوون‌و بێ نەواکانیان دزییان بکردایە، حەددیان لێ دەدان، جوولەکەکان وابوون، حەددیان لەئاغاو بەگەکانیان نەدەدا، بەڵام هەژارێکیان دزی بکردایە، دەستیان دەبڕی. جا سوێندم بەیەزدانی پاك من ناهەقی قەبووڵ ناکەم، گریمان ئەگەر فاطیمەی کچی خۆشم دزی بکا، بەپێی یاسانامەی خودا دەستی دەبڕم!).

عائیشە فەرمووی: ئەنجا فەرمانی کرد دەستی ژنە دزەکەیان بڕی، لەوەدوا ژنەکە تەوبەیەکی جوانی کرد، وە شووی کرد، وە گەلێ جار دەهات بۆلای من‌و هاموشۆی منی دەکرد، جا ئەگەر کارێ، داخوازییەکی ببوایە، بەمنی دەگوت، منیش عەرزی پێغەمبەرم دەکرد، ئەویش داخوازییەکەی ئەوی جێبەجێ دەکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٢٣٩٨، چ/٤ — ش/د/ت/ن}.

لەگێڕانەوەیەکی تری صەحیحی موسلیمدا، ژمارە (٤٣٨٨) بەپێی تەرقیمی شێخ خەلیل مەئمون شیحا، عائیشە دەفەرموێ: ژنێکی مەخزوومی دەچوو شمەکی لەم‌و لەو دەخواست‌و دوایی حاشای لێ دەکردو نەیدەدایەوە بەخاوەنەکەی، جا کە مەسەلەکەی گەیشت بە پێغەمبەرو چەسپا لەسەری کە بەوشێوەیە شت لەخەڵك دەدزێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە دەستی بەپێی شەرع ببڕن، جا کەسوکاری ژنەکە چوون بۆلای ئوسامەی کوڕی زەیدو لەم بارەیەوە قسەیان لەگەڵ کرد، سا بەشکوو تکا لە پێغەمبەر بکا، هەتا حەددەکە جێبەجێ نەکرێ، ئوسامەیش سەبارەت بە بابەتەکە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد،

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەئێوارێ هەڵسایەوەو وتارێکی دا... هەتا کۆتایی فەرموودەکەی گێڕانەوەی یەکەم... تاد).

١٢٥٧- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ وَلَا مُنْتَهِبٍ ، ولَا مُخْتَلِسٍ ، قَطْعٌ } رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ التِّرْمِذِيُّ ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع/ ٥٤٠٢. الصحيح المسند: ٨٩٥}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێت) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەستی گەنەکارو تاڵانکەرو ماڵفڕێن نابڕرێ). {تاج/٣، زنجیره: ٩١، ژماره: ٢٣٤٩}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست لە گەنەکار (خائن) ئەو کەسانەیە، کە بەفێڵو فەرەج ماڵی خەڵك بەناهەق دەخۆن، وەك ئەوە کابرای کلیلدار دەچێ فێڵ لەخاوەن ماڵ دەکاو هەندێ لەپارەکەی، یا لەماڵەکەی دەدزێو دەیبا بۆ خۆی، یا سەرپرشتیاری پڕۆژەیەکە، دەچێ بەرتیل وەردەگرێ، یا هەندێ لەپارەی پڕۆژەکە بۆ خۆی بەفڕو فێڵ دەخواو پسووڵەو قەواڵەی درۆو ساختەی بۆ دروست دەکا، ئەم جۆرە گەنەکارانە گەرچی دەستیان نابڕدرێ، بەڵام شایانی سزای ترن، کە قازی دەیسەپێنێ بەسەریاندا.

٢- تاڵانکەر ئەوەیە کەکەسێ، یا لەشکرێ، یا کۆمەڵێ چەتەو ڕێگرو خاوەن دەستەڵات، بە ئاشکرا، لەبەر چاوی خاوەنەکەیو لەبەرچاوی خەڵکی تر، ماڵی کەسێ تاڵان دەکەنو دەیبەن بۆ خۆیان.

٣- ماڵفڕێنیش ئەوەیە، کە کابرایێ لەناکاودا پەلاماری شتێ دەداو دەیفڕێنێو ڕادەکا، جا ئەگەر خاوەنەکەی فریای کەوت ئەوا لێی دەسێنێتەوە دەنا دەیبا بۆ خۆیو دەیخوات. لەوڵاتی خۆماندا دوو کەس هەبوو ماینیان دەفڕاند، ماینو ئەسپ کەپێوەند دەکرانو دەکرانە لا ماڵان، یا دەکرانە کەژو

پاكژەكان، بۆ لەوەڕان، هەندێ كەس هەبوو، یەك توورەكە كلیلی جیاجیای پێوەندی پێ بوو، دەچوو بەدزییەوە لەو كەژە پێوەندی ماینێكی نایابی دەكردەوە بەیەكێ لەو كلیلانەو ئەوجا سواری پشتی دەبوو، بەغار دەیفڕاند، گەلێجار دەنیشتنە سەری ماینەكەیان لێ دەسەندەوە. دوو كەس هەبوون بەم ناوەوە ناویان دەركردبوو، پێیان دەگوتن: حەمە ماین فڕێن‌و حەمە غەریب ماین فڕێن، یەكێكیان بەردەكەڕی بوو، خودا لەهەردوو لایان خۆش بێت، ئومێد دەكەم كە تەوبەیان قەبوول بوو بێت.

١٢٥٨- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ، قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ} رَوَاهُ اَلْمَذْكُورُونَ، وَصَحَّحَهُ أَيْضًا اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّان.

{صحيح الجَامِع: ٧٥٤٥}:

رافیعی كوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەسەر دزینی بەروبوومی دارو درەخت‌و باخ دەست نابڕرێ، هەروا لەسەر دزینی كورۆكی دار خورما دەست نابڕرێ).

(ڕوونكردنەوە):

١- (كەثەر) بە عەرەبی پێشی دەگوترێ جوومماری نەخل، یان شەحمی نەخل، گەلێ جار لەلاقەدی دارخورما دایكانەكەوە بەچكەیێ دەردەچێ، كاتێ ئەو بەچكەیە، لەقەدی خورماكە دەكەنەوە، لای خوارەوەی پاك دەكەن كورۆكێكی واتیادا، وەك نێركی ڕێواسی پاككراو، بەڵام ئەم مەیلەو سپییە، بەوە دەگوترێ (جوممار) ئەوە دەخورێ تامێكی مەیلەو شیرینی هەیە.

٢- دانەر عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: كۆمەڵەی پێشوو كە فەرموودەی ژمارە (١٢٥٧)یان گێڕاوەتەوە ئەم فەرموودەی ژمارە

(١٢٥٨) شـيان گێڕاوەتـەوە، تەرمـەزیو ئیبنـو حیببـان بـە فەرموودەیـەکی تەندروستیان داناوە.

١٢٥٩– وَعَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الْمَخْزُومِيِّ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: { أُتِـيَ النَّبِـيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) بِلِصّ قَدِ اعْتَرَفَ اعْتِرَافًا، وَلَمْ يُوجَـدْ مَعَـهُ مَتَـاعٌ، فَقَـالَ لَـه رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) "مَا إِخَالَـكَ سَـرَقْتَ". قَـالَ: بَلَـى، فَأَعَـادَ عَلَيْـهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، فَأَمَرَ بِهِ فَقُطِعَ. وَجِيءَ بِهِ، فَقَالَ: "اسْـتَغْفِرِ اللَّـهَ وَتُـبْ إِلَيْـهِ"، فَقَـالَ: أَسْتَغْفِرُ اللّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: "اللّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ" ثَلَاثًا } أَخْرَجَهُ أَبُـو دَاوُدَ وَاللّفْـظُ لَهُ، وَأَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{ضعيف أَبِي داود: ٩٤٣}:

ئەبو ئومەییەی مەخزوومی (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: دزێکیـان هێنـا بـۆلای پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) بەتـەواوی پێـی نـابوو لەدزیکردن، بەڵام شمەکی وەهای پێ نـەبوو، کـە گومـانی ئـەوەی لێ بکـرێ کـە دزیبێتـی. پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) بۆئـەوەی کـە ددان نـەنێ بەدزینەکـەدا، پێـشی کـەوتو پێـی فـەرموو: (مـن باوەڕناکـەم کـەتۆ دزیـت کردبێ؟). گـوتی: بـا، دزیـم کـردووە، دووجـار یـا سـێ جـار، پێغەمبـەر هـەمان فەرموودەی لێ دووبارە کردەوە، ئەو هەر دەیگوت: با، دزیم کردووە.

جـا پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمانی کـرد، دەسـتیان بڕیو هێنایـان بـۆلای پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) پێـی فـەرموو: (بڵێ: داوای لێخۆش بوون لەخودا دەکەمو پەشیمانم لەلای خودا، پیاوەکـەیش گوتی: أَسْتَغْفِرُ اللّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ: داوای لێخۆشبوون لەخودا دەکەمو لەگوناهـەکانم پەشیمانم لەسەر دەستی خودادا).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی خودایە! پەشیمانی لێ گیرا بفەرموو، تەوبەی قەبووڵ بکە) سێ جار ئەم نزایەی کرد بۆی).

عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو داوودو ئەحمەدو نەسائی گێڕاویانەتەوە، ئەمە دەقی گێڕانەوەی ئەبو داوودە، پیاوانی رشتەکەی متمانەدارن.

(روونکردنەوە):

ئەبو ئومەییەی ئەلمەخزوومی (رەزای خودای لێ بێ) نازانرێ ناوی چییە، بە خەڵکی حیجاز دەژمێررێ.

١٢٦٠- وَأَخْرَجَهُ الْحَاكِمُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَسَاقَهُ بِمَعْنَاهُ، وَقَالَ فِيهِ: {اذْهَبُوا بِهِ، فَاقْطَعُوهُ، ثُمَّ احْسِمُوهُ} . وَأَخْرَجَهُ الْبَزَّارُ أَيْضًا، وَقَالَ: لَا بَأْسَ بِإِسْنَادِهِ.

{ضعيف، الإرواء: ٢٤٣١}:

حاکم لە ئەبو هورەیرەوە، ئەم فەرموودەیەی بەم واتایە گێڕاوەتەوە، لەوێدا دەفەرموێ: (دەی بیبەن دەستی ببڕن، لەپاشا بەئاگر، بەڕۆنی داخ برینەکەی داخ بکەن، هەتا خوێنی دەستی بنیشێتەوە، نەبادا خوێنی دەستی بەربێ و بیکوژێ بەززاریش دەریهێناوە، وە دەفەرموێ: (رشتەکەی بێ نەنگە).

١٢٦١- وَعَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ" أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَا يَغْرَمُ السَّارِقُ إِذَا أُقِيمَ عَلَيْهِ الْحَدُّ } رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَبَيَّنَ أَنَّهُ مُنْقَطِعٌ. وَقَالَ أَبُو حَاتِمٍ: هُوَ مُنْكَرٌ.

{ضعيف، سُنَنُ النَّسَائِي: ٤٩٨٤}:

عەبدورەحمانی کوڕی عەوف (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ حەددی دەستبڕین لەسەر دز جێبەجێ دەکرێ، ئیتر ئەو ماڵەی کە دزیویەتی پێی نابژێررێ!).

نەسائی گێڕاویەتـەوە، وە روونیکردۆتـەوە کـە فەرموودەیـەکی مونقـەطیعـە، رشـتەکەی پـچڕانی واتیـادا، هەنـدێ لـە بگێـڕەوە (راویـیـە)کان کرتـاون ئـەبو حاتەمیش دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە مونکەرە.

١٢٦٢- وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَـنْ رَسُـولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " { أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ التَّمْرِ الْمُعَلَّقِ؟ فَقَالَ: "مَنْ أَصَابَ بِفِيهِ مِنْ ذِي حَاجَةٍ، غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً، فَلَا شَـيْءَ عَلَيْـهِ، وَمَـنْ خَـرَجَ بِـشَيْءٍ مِنْـهُ، فَعَلَيْـهِ الْغَرَامَةُ وَالْعُقُوبَةُ، وَمَنْ خَرَجَ بِشَيْءٍ مِنْهُ بَعْدَ أَنْ يُؤْوِيَهُ الْجَـرِينُ، فَبَلَـغَ ثَمَـنَ الْمِجَـنِّ فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ الْحَاكِمُ.

{حسن، إرواء الغليل/٢٥١٩. أبو داود رقم: ٤٣٩٠. ترمذی. رقـم: ١٢٨٩. نسائی. رقم: ٨/٨٥. ابن ماجة/٢٥٩٦. أحمد/٢/٢٢٤. حاكم/٤/٤٢٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لـەباوکی بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسـیارکرا: لـەبارەی خورمای هێشوو بەدارەوە، ئایا بڕیاری چیـیە، بۆ کەسێ کەلێی بخوات، یـا لێـی ببات، یا لێـی بـدزێت، لـەم بارەیـەوە فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (کەسـێ بـەپێی پێویـست لەبـەری داری بـەریو بـەری ڕەزو بـاخ بخـوات، وە داوێنو باخەڵو جەوالی لێ پڕنەکا، ئەوە هیچی لەسەر نییـەو گونـاهی ناگـات، بەڵام ئەگەر کەسێ شـتێکی لێ ببـات، ئـەوە هـەم پێـی دەبـڕێررێو هـەم سـزای لەسەرە، کە سزاکە قـازی دیـاری دەکـات، بـەڵام ئەگـەر بـەروبووم بـرا بـۆ جـێ خەرمانو جـێ موشـتـاخو لـەوێ دانـرا، وەکەسـێ لـەوێ لێـی بـرد بـۆ خـۆی، وە ئەوەی کە لێی برد، بایی بەهای قەڵخانێ دەبوو، ئەوە دەستبڕینی لەسەرە).

١٢٦٣- وَعَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ لَهُ لَمَّا أَمَرَ بِقَطْعِ اَلَّذِي سَرَقَ رِدَاءَهُ، فَشَفَعَ فِيهِ: { هَلَّا كَانَ ذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ؟ } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةَ. وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْجَارُودِ، وَالْحَاكِمُ.

{صــــحيح ابـــن ماجـــة: ٢١٠٣. أحمـــد/٦/٤٦٥. أبـــو داود/٤٣٩٤. نسائی/٨/٦٩. ابن ماجة/٢٥٩٥. حاكم/٤/٤٢٢}:

صەفوانی کوڕی ئومەییە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ لە بەطحاء، یا فەرمووی: لە مەسجیدولحەرام، یا فەرمووی: لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، ڕاکشابووم، پەشتەماڵ (ڕیدائە)کەمم لەباتی سەرین لەژێر سەرما دانابوو، خەوتبووم، پیاوێ هات و پەشتە ماڵەکەی ژێر سەرمی لەو خەوەدا دزی منیش گرتمەو بردم بۆ دادگایی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە لەسەرئەوە دەستی ببڕێ، منیش عەرزی پێغەمبەرم کرد: من لێی خۆش دەبم و چاوپۆشی لێ دەکەم و تکای بۆ دەکەم کە دەستی نەبڕێ؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەبوو بەرلەوە بیهێنی بۆلای من ئەوەت بکردایە).

ئیتر دەستی کابرایان بڕی.

١٢٦٤- وَعَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: جِيءَ بِسَارِقٍ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَقَالَ: { "اُقْتُلُوهُ". فَقَالُوا يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّمَا سَرَقَ يا رسول الله. قَالَ: "اِقْطَعُوهُ" فَقَطَعَ، ثُمَّ جِيءَ بِهِ اَلثَّانِيَةِ، فَقَالَ "اُقْتُلُوهُ" فَذَكَرَ مِثْلَهُ، ثُمَّ جِيءَ بِهِ اَلرَّابِعَةِ كَذَلِكَ، ثُمَّ جِيءَ بِهِ اَلْخَامِسَةِ فَقَالَ: "اُقْتُلُوهُ"} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَاسْتَنْكَرَهُ.

{قَــوَّاهُ الألبـــانِي، إرواء الغليـــل/ جلـــد/٨، ص٨٦. أبـــو داود/٤٤١٠. نسائی/٨/٨٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: جارێ کابرایەکی دزیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بیکوژن!) گوتیان: قوربان! چۆن بیکوژین، ئەمە هەر دزی کردووەو بەس؟ فەرمووی: (دەی دەستی ببڕن) ئەوانیش دەستیان بڕی،

لەپاشا دووبارە هێنایانەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان فەرمووی: (بیکوژن) ئەوانیش گوتیانەوە: قوربان! چۆن بیکوژین، ئەمە هەر دزی کردووەو بەس؟ فەرمووی: (دەی دەستی ببڕن). ئیتر چەند جارێ تریش هەروەها، لەجاری چوارەما هەر چوار پەلی بڕا، لەجارێ پێنجەما کەهێنایان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بیکوژن!).

جابیر فەرمووی: ئیتر بەکێشمان کردو کوشتمان تەرمەکەیمان راکێشاو فڕێماندایە ناو بیرێکەوەو بەبەرد دامانپۆشی. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٣٣، لاپەڕە: ٨٩٧}.

١٢٦٥- وَأَخْرَجَ مِنْ حَدِيثِ اَلْحَارِثِ بْنِ حَاطِبٍ نَحْوَهُ. وَذَكَرَ اَلشَّافِعِيُّ أَنَّ اَلْقَتْلَ فِي اَلْخَامِسَةِ مَنْسُوخٌ.

{المستدرك: ٨١٥٣، وقال الذهبي: بل منكر}:

نەسائی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەڕێگەی حاریثی کوڕی حاطیبەوە، وێنەی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، پێشەوا شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەبێ راجیایی: ئەوەی کەدز لەجاری پێنجەما دەکوژێ، ئەمە بەبێ راجیایی لەنێوانی زانایاندا پووچ کراوەتەوەو کاری پێ ناکرێ.

(ڕوونکردنەوە):

١- دزی خوویەکی بەدی پیسە، هەر کۆمەڵگایێ، دزیو فزی تیادا بڵاوبۆوە، هەموو خوویەکی خراپی تریشی تیادا بڵاودەبێتەوە، بۆ بەرگری لەدیاردەی دزی، یاسانامەی خودای گەورە ڕێسای دەستبڕینی دزی دامەزراندووە.

٢- هەروا لە حەددی دزیشدا واباشە، دادوەر بەبڕو بیانوو، بە کولکە گومان تۆڵەی دەستبڕین لە کۆڵ دز بکاتەوە، وە دزو خاوەن ماڵ بۆیان هەیە لەناو خۆیاندا، بەسەرپەرشتی مامۆستایێ کێشەکە چارەسەر بکەنو نەیگەیەننە دادگا. کاتێ دەستی دز دەبڕرێ کە رەسیدەو ئاقڵو هۆشیار بێو

سەرپشك بێو لەبەر برسێتیو ناچاری نەبووبێ. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٣٤}.

## ٨١- باسی تۆڵەی مەینۆشو ڕوونکردنەوەی سەرخۆشکەر
## بَابُ: حَدِّ الشَّارِبِ وَبيانِ المُسكِرِ

{بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٩٦ لەژمارە: ٢٣٧٣وە هەتا ژمارە: ٢٣٨٢ + مختصر صحيح مسلم/٣، زنجیرە: ٨٢٥، لەژمارە: ١٠٤٧ — ١٠٤٨ = شیحا/٤٤٣٢ — ٤٤٣٣ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٣٠}.

١٢٦٦– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَتَى بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ اَلْخَمْرَ، فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ نَحْوَ أَرْبَعِينَ. قَالَ: وَفَعَلَهُ أَبُو بَكْرٍ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ اِسْتَشَارَ اَلنَّاسَ، فَقَالَ عَبْدُ اَلرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَخَفَّ اَلْحُدُودِ ثَمَانُونَ، فَأَمَرَ بِهِ عُمَرُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخاری/٦٧٧٣. مسلم/ شیحا: ٤٤٢٧}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئارەقی خواردبۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد، بەدوو پەلکە خورما دەوری چل داریان لێ دا. فەرمووی: ئەبوبەکریش لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، فەرمانی دەکرد بە پەلکە خورما نزیکەی چل داریان لەمەینۆش دەدا، بەڵام کاتێ عومەر بوو بەجێنشین، لەم بارەیەوە ڕاوێژی بە خەڵکەکە کرد، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: سووکترین تۆڵە هەشتا جەڵدەیە، جا عومەریش حەددی بادە نۆشی کرد بە هەشتا جەڵدە.

(ڕوونکردنەوە):

ئەوەی کە دەڵێ: (بەدوو پەلکە خورما، دەوری چل داریان لێی دا، مەبەست ئەوەیە: کە ژمارەی دارەکان چل داربووە، بە پەلکە خورمایێ

ژمارەیەکیان لێ داوە، بە پەلکە خورمایێ تریش ژمارەیەکیان لێ داوە، کە هەردوو ژمارەکە کردوویانەتە چل جەڵدە، مەبەست ئەوە نییە کە بەدوو پەلکە خورما چل جەڵدەیان لێ دابێ).

١٢٦٧- وَلِمُسْلِمٍ: عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) -فِي قِصَّةِ اَلْوَلِيدِ بْنِ عَقَبَةَ- {جَلَدَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَرْبَعِينَ، وَأَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ، وَعُمَرُ ثَمَانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ، وَهَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ}. وَفِي هَذَا اَلْحَدِيثِ: { أَنَّ رَجُلًا شَهِدَ عَلَيْهِ أَنَّهُ رَآهُ يَتَقَيَّأُ اَلْخَمْرَ، فَقَالَ عُثْمَانُ: إِنَّهُ لَمْ يَتَقَيَّأْهَا حَتَّى شَرِبَهَا}.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٧}:

لەموختەصەری صەحیحی موسلیمدا (بەرگی سێیەم، ژمارە: ١٠٤٧ = شیحا/٤٤٣٢ — صحيح مسلم/١٧٠٧) ئاوەهایە:

ئەبو ساسان، کەناوی حوصەینی کوڕی مونزیر بوو، فەرمووی: لەخزمەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا بووم، کاتێ وەلیدی دایك برای عوسمانیان، بۆ دادگایی هێنا بۆلای عوسمان، کە بەسەرخۆشی بەرنوێژیی نوێژی بەیانی کردبوو، کەدوو رکاتەکە دەکا دەڵێ: ئایا دەتانەوێ کە زیادی بکەم بۆتان؟ وەك ئەوە نوێژی بەیانی بکا بەسێ رکات یا زیاتر.

دوو پیاویش شایەتییان دا لیێ: یەکێکیان کە حومرانی کوڕی ئەوبان بوو، کە ئازادکراوی حەزرەتی عوسمان بوو، فەرمووی: ئارەقی خواردبۆوە، ئەوی تریشیان گوتی: منیش دیم کە دەڕشایەوە، عوسمانی برایشی فەرمووی: بۆیە رشاوەتەوە چونکە خواردوویەتەوە، تا نەخواتەوە نارشێتەوە.

ئینجا عوسمان فەرمووی: ئەی عەلی! هەڵسە دارکاریی بکە (واتە: جەڵدەی ئارەقخواردنەوەی لێ بدە).

عەلیش بە حەسەنی کوڕی فەرموو: ئەی حەسەن! هەڵسە دارکاریی بکە، حەسەن فەرمووی: کێ خۆشییەکەی دەنۆشێ، با هەرئەویش تاڵییەکەی بچێژێ! وەك بڵێی حەسەن لەدڵەوە حەزی لەوەلید نەبێو رقی لێ گرتبێ

لەبەر ئەم خووە پیسەی. جا عەلی فەرمووی بە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر! ئادەی تۆ هەڵسە دارکاریی بکە. جا عەبدوڵڵا دارەکانی لە وەلید دەداو عەلی دەیژماردن، هەتا بوون بەچل دار.

عەلی فەرمووی: ئیتر بەسە، ئینجا فەرمووی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) چل داری لەبادەنۆش دەدا، ئەبوبەکریش هەروەها چل داری لێ دەدا، بەڵام عومەر لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا هەشتا داری لێ دەدا (بڕوانە: ژمارەی پێشوو ١٢٦٦). عەلی فەرمووی: ئەمانە هەموویان هەر سوننەتن و ڕێگەی شەرعن، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم چلەکەم پێ باشترە، لەبەرئەوە کە ئەمەیان کەچل قەمچی لەمەینۆش بدرێ، سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٢٣٧٦}.

(ڕوونکردنەوە):

وەلیدی کوڕی عوقبە، خۆی و عامارەی برای لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەسەرکاری زەکاتی هۆزی بەنی موستەلیق، عوقبەی باوکی لەغەزای بەدردا کوژرا، یەکێ بوو لەسەرکردەی بێباوەڕان، لەپاش کوشتنی باوکی، وەلید لەپەنای عوسمانی دایك برایدا گەورە بوو، وەلید شاعیر بوو، ئازا بوو، سەخی بوو.

١٢٦٨- وَعَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّهُ قَالَ فِي شَارِبِ اَلْخَمْرِ: { إِذَا شَرِبَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِذَا شَرِبَ اَلثَّانِيَةَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِذَا شَرِبَ اَلثَّالِثَةِ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِذَا شَرِبَ اَلرَّابِعَةِ فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَهَذَا لَفْظُهُ، وَالْأَرْبَعَةُ. وَذَكَرَ اَلتِّرْمِذِيُّ مَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ مَنْسُوخٌ، وَأَخْرَجَ ذَلِكَ أَبُو دَاوُدَ صَرِيحًا عَنْ اَلزُّهْرِيِّ.

موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ لەبارەی ئارەقخۆرەوە: (کەسێ بۆیەکەمجار بادەی خواردەوە چل قەمچی لێ بدەن ئەگەر بۆ جاری دووەم مەیی خواردەوە دیسان چل قەمچی تریان لێ بدەن، ئەگەر بۆ جاری سێیەم ئارەقی خواردەوە دیسانەوە چل قەمچی تری لێ بدەن، جا ئەگەر بۆ جاری چوارەم ئارەقی خواردەوە ئیتر بدەن لەگەردنی). {صحيح الجامع/٦٢٩، الصحيح ألمسند/١١١٩} .

دانەر مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: تەرمەزی شتێ باس دەکا، کە بەڵگەی ئەوەیە کە کوشتنی ئارەقخۆر نەسخ کرابێتەوە، ئەمە ئەو فەرموودەی تەرمەزییە:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ ئارەقی خواردەوە، لەجاری یەکەمو دووەمو سێیەمدا چل قەمچی (دار = جلدە) لێ بدەن، جا ئەگەر بۆ چوارەم جار دووبارەی کردەوە بیکوژن). فەرمووی: بەڵام لەوەدوا، کابرایەکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆجاری چوارەم ئارەقی خواردبۆوە، کەچی نەیکوشت، بەڵکوو چل داری حەددی لێ داو بەس... تاکۆتایی فەرموودەکە.

هەروا دانەر مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: هەروا ئەبو داوود فەرموودەیێ لەزوهرییەوە دەردەهێنێ کە بەئاشکرا بەڵگەی ئەوەیە کە کوشتنی ئارەقخۆر پووچو نەسخ بۆتەوە، کە ئەمە ئەو فەرموودەیە کە عەسقەلانی ئاماژەی بۆ دەکا.

زوهری لە قوبەیصەی کوڕی زوئەیبەوە، لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): (کەسێ مەیی نۆشی دارکاری بکەنو چل قەمچی لێ بدەن، ئەگەر دووبارەی کردەوە دیسان چل داری تری لێ بدەن، ئەگەر

سێبارەی کردەوە دیسان چل قەمچی لێ بدەن، جا ئەگەر چوار بارەی کردەوە ئەوا بیکوژن).

جا لەوەدوا، پیاوێکیان هێنا بۆ خزمەتی، ئارەقی خواردبۆوە، فەرمانی کرد، قەمچیکاریی کرا، دووبارە هێنایانەوە هەروا، سێبارە هێنایانەوە هەروا، چواربارە هێنایانەوە ئارەقی خواردبۆوە هەروا چل قەمچی لێ دا، وە نەیکوشت. دیاربوو کە کوشتنی ئارەقخۆر لابرابوو، وە ئەمەبوو بە مۆڵەتو هۆ بۆ نەکوشتنی ئارەقخۆر.

(ڕوونکردنەوە):

١- قوبەیصەی کوڕی زوئەیبی کوڕی حەلحەلە، لەهۆزی خوزاعەیە، کەسناوی (کونیە)ی ئەبو سەعیدە، یەکەم ساڵی کۆچی لەدایك بووە، چەند حەدیسێکی مورسەلی لە پێغەمبەرەوە هەیە، دەڵێن: خۆی فەرموودەی لە پێغەمبەر نەبیستووە، دەڵێن: هێناویانە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نزای باشی بۆ کردووە.

گێڕانەوەی لەم زاتانەوە هەیە: لە ئەبو هورەیرەو ئەبو دەرداءو زەیدی کوڕی ثابیتو کەسانی تریش لە هاوەڵانی پێغەمبەرە، زوهریو ڕەجائی کوڕی حەیونو مەکحولو کەسانی تریش گێڕانەوەی لێوە ئەنجام دەدەن!

یەکێ بوو لەزانا گەورەکانی ئەم نەتەوەی ئیسلامە. لەساڵی (٨٦) هەشتاو شەشی کۆچی مەرگ بوو بەمیوانی.

٢- زوئەیبی باوکی قوبەیصە، هاوەڵی پێغەمبەرە، ئامادەی جەنگی ئازادکردنی مەککە بووە، لەگەڵ سوپاکەی پێغەمبەردا، لە قەدید نیشتەجێ بوو، خانوویەکی لەمەدینە هەبوو، هەتا سەردەمی موعاویە ژیاوە.

١٢٦٩– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَّقِ اَلْوَجْهَ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٩٣ = بوخاری/٢٥٥٩. مختصر صحیح مسلم/٥، زنجیره: ١٣٨٩، ژمارە: ١٨١٨}:

**ئەمە گێڕانەوەی تەجریدە:**

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەکاتی شەڕو شۆڕدا خۆتان لە لێدانی روخساری لێدراوەکە بپارێزن، بەتایبەتی ئەگەر بۆ تەمێ و شتی تری وابوو، وەك ئەوە لەنۆکەرو منداڵ و خوار دەستی خۆتان دا، بۆ تەمێ و ئامۆژگاری و شتی وا).**

**لە (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایە:**

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی شەڕو شۆڕو ناکۆکی و تەمێ کردن و شتی تری لەم بابەتە، کە گەلێ جار لەنێوانی ئێوەو برای ئایینی خۆتاندا روودەدا، خۆتان بپارێزن لەلێدانی روخساری لێدراوەکە، بەتایبەتی ئەگەر بۆ تەمێ و تەسکین و شتی تری وا، لە نۆکەرو منداڵ و خواردەستی خۆتان دا).**

**{تاج/٢، زنجیره: ٢١، لاپەڕە: ٤٥٧، ژمارە: ٢٠٣٢ + تاج/٣، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٢٣٨٣ ج/٤}.**

**١٢٧٠- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " لَا تُقَامُ اَلْحُدُودُ فِي اَلْمَسَاجِدِ"} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ.**

{حسن، صحيح الجامع/٧٣٨١}:

**ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولدا ئاوایە، دەیکەین بە روونکردنەوە بۆ گێڕانەوەی ئێرە:**

**حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدەدا کە لەناو مزگەوتا، بکوژ بکوژرێتەوە، یا هۆنراوەی تیادا دەوربکرێتەوەو هەڵبەستی تیادا بخوێنرێتەوەو شەڕە شیعری**

تیادا بکرێ، یا داری حەدد بدرێ لەکەسێ، یا حەددی تیا جێبەجێ بکرێ).
{تاج/٣، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٢٣٨٤، ٢٣٨٨، چ/٤}.

١٢٧١- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَقَدْ أَنْزَلَ اَللَّهُ تَحْرِيمَ اَلْخَمْرِ، وَمَا بِالْمَدِينَةِ شَرَابٌ يَشْرَبُ إِلَّا مِنْ تَمْرٍ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.
{مسلم. تخريج شيحا/ ٥١١٠ = مسلم/١٩٨٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو سەردەمەی کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئارەقی قەدەغە کرد، لەشاری مەدینەدا، تەنیا جۆرە ئارەقێ هەبوو، لەخورما دروسمت دەکرا، کە خەڵکەکە دەیانخواردەوە).

١٢٧٢- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { نَزَلَ تَحْرِيمُ اَلْخَمْرِ، وَهِيَ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنْ اَلْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ. وَالْخَمْرُ: مَا خَامَرَ اَلْعَقْلَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٥٧م = ٤٦١٧، ٢٤٦٤، ٤٦٢٠، ٥٥٨٠، ٥٥٨٢، ٥٥٨٣، ٥٥٨٤، ٥٦٠٠، ٥٦٢٢، ٧٢٥٣. مختصر صحيح مسلم/٣ = ١٢٦٩ = ترقيم شيحا/ ٧٤٧٥}:

ئەم فەرموودە لە (مختصر صحيح مسلم)دا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) لەمەدینە، لەسەر دوانگەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی دا، سوپاسی خودای کردو وەسپێکی جوانی خودای کرد، لەپاشا فەرمووی: لەپاش سوپاس‌و ستایشی خوا، بزانن: کەمەی لە قورئانا نادروست کراوە، ئەو سەردەمەی کە نادروستبوونی مەی‌و بادە دابەزی لەقورئانا، مەی‌و بادە، کە پێیان دەگوترێ: ئارەق، لەم پێنج شتە دروست دەکرا: لە گەنم‌و لەجۆ لە خورماو لەمێوژو ولەهەنگوین، وە ئارەق

(خەمر)یش ئەوەیە کە هۆش داپۆشێ. واتە: هەرشتێ لەم پێنج شتە دروست بکرێ، یا لەهەرشتێکی تر دروست بکرێ، بەمەرجێ هۆش لابەرێ، دادەنرێ بە مەیو نادروستە.

عومەر فەرمووشی: ئەی خەڵکینە! سێ شتی تریش هەن، حەزم دەکرد، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرلەوەی کە مەرگ ببێ بەمیوانی، ئەم سێ شتەی بۆمان روون بکردایەتەوە:

یەکەم: بەشە کەلەپووری باپیرە.

دووەم: باسی کەلالە، کەجۆرە مردوویەکە، لە قورئاندا باسی کراوە.

سێیەم: چەند بابەتێ هەیە لەسوود، وەك (رِبَا الفضل) کە بڕیارەکەی چییەو چی نییە. {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٣٧ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٢٧٣- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { " كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ" } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٦٤، ١٢٦٥ = شيحا/٥١٨٥، ٥١٧١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو سەرخۆشکەرێ ئارەقە، وە هەموو سەرخۆشکەرێ ناڕەوایە، وە هەرکەسێ لەجیهاندا ئارەق بخواتەوەو فێری ببێو تادەمرێ تەرکی نەکاو تەوبەی لێ نەکا، ئەوە لەبەهەشتا چەشکەی ناکات). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣٦، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٧٤٨ — ش/د/ت/ن = بوخاریو موسلیمو تەرمەزیو نەسائی}.

١٢٧٤- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { " مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ، فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ" } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ. وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٥٥٣٠، الصحيح المسند/٣١٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرشتێ زۆرەکەی خەڵك سەرخۆش بکا، ئەوە کەمەکەیشی حەرامە، وەك زۆرەکەی). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤٥}.

١٢٧٥- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُنْبَذُ لَهُ اَلزَّبِيبُ فِي اَلسِّقَاءِ، فَيَشْرَبُهُ يَوْمَهُ، وَالْغَدَ، وَبَعْدَ اَلْغَدِ، فَإِذَا كَانَ مَسَاءُ اَلثَّالِثَةِ شَرِبَهُ وَسَقَاهُ، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ أَهْرَاقَهُ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٧٦ = شيحا/٥١٩٤ = مسلم/٢٠٠٤}:

ئەم گێڕانەوەی تری ئیمامی موسلیم داگرترە، کەوا لە (مختصر صحيح مسلم)دا، کە دەفەرموێ:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران مێوژیان دەخووساند بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیانکرد بەخۆشاو بۆی، هەتا ماوەی سێ ڕۆژ هەر لێی دەخواردەوە، ئیتر فەرمانی دەکرد ئەوەی کەمابوو یان دەیانخواردەوە، یان دەیانڕژاند).

{ئەمە گێڕانەوەی تاجە، بەرگی: ٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٧٦٠}

لێرەدا، واتە لە موختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:

(جاران لەسەرەتای شەوەوە خۆشاویان بۆ پێغەمبەر دەخووساند، بۆ بەیانی لێی دەخواردەوە، ئەو ڕۆژەیش هەتا ئێوارێ لێی دەخواردەوە شەوی دواییش هەر لێی دەخواردەوە، بۆ سبەینێیش هەر لێی دەخواردەوە، بۆ دوو سبەی شەویش هەر لێی دەخواردەوە بۆ سێ سبەییش هەتا عەصر لێی دەخواردەوە. ئیتر ئەگەر شتێ بمایەتەوە لەوەدوا، یا دەرخواردی نۆکەرو کارەکەرەکەی دەدا، یا فەرمانی دەکرد دەیانڕژاند). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٧٦٠ ج/٤}

١٢٧٦– وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { " إِنَّ اَللَّهَ لَمْ يَجْعَلْ شِفَاءَكُمْ فِيمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ" } أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{ضعيف الجامع: ١٦٣٧}:

ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرگیز خودای گەروە دەرمان‌و چارەسەری نەخۆشینەکانی ئێوەی، نەخستۆتە ئەوشتانەوە، کە حەرامی کردوون لێتان).

١٢٧٧– وَعَنْ وَائِلٍ اَلْحَضْرَمِيِّ" أَنَّ طَارِقَ بْنَ سُوَيْدٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) { سَأَلَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلْخَمْرِ يَصْنَعُهَا لِلدَّوَاءِ؟ فَقَالَ:" إِنَّهَا لَيْسَتْ بِدَوَاءٍ، وَلَكِنَّهَا دَاءٌ" } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ. وَأَبُو دَاوُدَ وَغَيْرُهُمَ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٧٩ = شيحا/٥١١٢}:

وائیلی ئەلحەضرەمی دەفەرموێ: طاریقی کوڕی سووەیدی ئەلجەعەفی (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی حەزرەتی کرد: من ئارەق دروست دەکەم، ئەویش ڕێگەی ئەوەی پێ نەدا، یا طاریق فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی ناخۆش بوو کەشتی وا بکەم. منیش عەرزیم کرد: خۆ من بۆ دەرمانی دروست دەکەم، نەوەك بۆ خواردنەوە؟ فەرمووی: (ئارەق دەرمان نییە، بەڵکوو دەردە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، لاپەڕە: ٢٣٤، ژمارە: ٢٧٤٣ چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

طاریقی کوڕی سووەیدی ئەلجوعەفی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، ئەم فەرموودەیەی لە موسلیم‌و ئەبو داوودو تەرمەزی‌و ئیبنو

ماجەو دارەمی دا هەیە، راجیایی هەیە لەناوەکەیدا: کە ئایا ناوی طاریقی کوڕی سووەیدە، یا ناوی (سووەیدی کوڕی طاریق)ە. بەڵام قسەی راستتر ئەوەیە کەناوی طاریقی کوڕی سووەیدە.

**(پوختەی بڕیارەکانی ئەم باسە)**

١- حەددی مەینۆش، بەدوو شایەت دەچەسپێ، یا بەپێڵێنانی مەینۆشەکە خۆی کە بڵێ بادەم نۆشیوە.

٢- ژمارەی دارو قەمچییەکان چل دارن.

٣- ئەوەی کە لەهەندێ فەرموودەدا هاتووە کە لەجاری چوارەم یا پێنجەمدا مەینۆش دەکوژرێ، بەکۆی دەنگ زانایان دەفەرموون: (ئەم بڕیارە هەڵگیراوەو پووچ کراوەتەوەو نەماوەو کاری پێ ناکرێ).

٤- لەکاتی لێدانی کەسێکا، بەحەق و بەناهەق، واباشە لەدەموچاوی نەدرێ، بەتایبەتی ئەگەر لێدانەکە بۆ تەمێ و تەسکین بوو.

٥- حەدد لەمزگەوتا جێبەجێ ناکرێ، هەروا هەر شتێ تر کە لەگەڵ ریزی تایبەتی مزگەوتا نەگونجێ.

٦- هەرچی مرۆڤ سەرخۆش بکا حەرامو نادروستە، ئیتر کەم بێ یا زۆر، وشك بێ یا تەڕ، لەمێوە دروست کرابێ وەك ترێ و خورما، یا لەشتێ تر وەك جۆو هەنگوین، وە بەهەر ناوێکەوە بێ جیاوازی نییە، مادام زۆرەکەی سەرخۆشکەرە، کەمو زۆری نادروسمتو قەدەغەو حەرامە.

٧- کۆمەڵێ شتی حەڵاڵو رەوا، کە پێغەمبەر خۆی لێی خواردوونەتەوە، وەك: ئاوو شەربەتی هەنگوینو شیراوو شیرو دۆو ماستاوو ئاوی زەمزەمو خۆشاوی ترێو خورماو ئاوی شەوی کوندەو ئاوی بیرو ئاوی بارانو ئاوی کوندەو ئاوی مەتارەو دەمی ناوە بە ئاوی جۆگەوەو لێی خواردۆتەوە، بەسواری و جاروبار بەپێوە ئاوی خواردۆتەوە.

٨- ناوهێنـانی خـودا لەسـەرەتای هـەموو خواردنەوەیـەکی دروسـتەوەو سوپاسکردنی خودا لەسەری لەدوا نۆشینی.

٩- لەم کاتانەدا نابێ بیسمیللا بکرێ، یا ناوی خودا بهێنرێ:

آ- لەکاتی خواردنو خواردنەوەی شتی نادروستو حەرامدا، وەك ئەوە کەدەست دەکا بە ئارەقخواردنەوە (بسم الله) بکا، شتی وا ئەگەر سووکی بەئایین بێ، پێی کافر دەبێ، یا وەك ئەوە کە دەست دەکا بەخواردنی گۆشتی بەراز، یا بۆ خواردنی شتی دزراو (بسم الله) بکا، ئەمیش هەروەها، ئەگەر بۆ سووکی بەئایین بێ، پێی ناموسوڵمان دەبێ، جا خوا نەخواستە، پێویستە لەسەر کەسێ کەشتی وا هەڵەو نادروست ئەنجام دەدا، بەبێ دواخستن تەوبە بکاو لەو تاوانە پەشیمان ببێتەوەو نەگەڕێتەوە بۆ سەری.

ب- لەکاتێکا کەشتی نادروست ئەنجام بدا، وەك: دزیو داوێنپیسیو گەندەڵی، تەنانەت حەرامە بۆ کەسێ کە لەکاتی بێنوێژیو سووڕی مانگانەدا بچێتە لای ژنی خۆی (بسم الله) بکا، یا ناوی خودا بهێنێ، یا کاتێ بەناڕەوا رۆژووەکەی بشکێنێ دروست نییە بیسمیللای لێ بکا.

١٠- هەروا نادروستو ناڕەواو تاوانە، کە لەدوا خواردنەوەو خواردنی نادروست حەمدو سوپاسی خودای لەسەربکا، یا لەپاش ئەنجامدانی کارێکی ناڕەوا حەمدو سوپاسی خودا بکا، وەك ئەوە لەپاش ئەنجامدانی دزیو حیزیو خواردنی پیسیو کردنی درۆ، سوپاسی خودا بکا لەسەری، وەك ئەوە بڵێ: (سوپاس بۆ خودا لەسەر ئەم گزییە!).

## ٨٢- باسی تەمێكردن (تەعزیر - سووكی پێكردن)و بڕیاری هەڵمەتهێنو پەلاماردەر (الصَّائِل)

## باب: التعزير وَحُكْمِ الصَّائِلِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٣٧، ٣٣٨، لاپەڕە: ٩٠٨ چاپی تاران + تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، لەژمارە: ٢٣٧٧وە هەتا ژمارە: ٢٣٨٢}.

١٢٧٨- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { " لَا يُجْلَدُ فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ، إِلَّا فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اَللَّهِ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٧٢ = بوخاری/٦٨٤٩، ٦٨٥٠. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٩ = مسلم ترقيم شيحا/٤٤٢٦}:

ئەبو بوردەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەگەر بۆ حەددی شەرعی، ئەگینا لەسەر هیچ سەرپێچییەكی تر، لەدە دار (جەڵدە) زیاتر لەكەس نادرێ).

{تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٢٣٧٧ ج/٤}.

(ڕوونكردنەوە):

ئەبو بوردەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە ناوی (هانی كوڕی نیار)ە، خاڵی بەرائی كوڕی عازیبە، ئامادەی جەنگی بەدرو نەبەردەكانی پاش بەدر بووە، هەروا ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بووە.

فەرموودەی لە بوخاریو موسلیم دا هەیە، واتە: لە ڕیجالی صەحیحەینە، شتی وایش بۆ ڕاوی گەورەترین بەهرەو پێناسەو بەڵگەی سەروەریو شانازییە، لە بوخاریدا هەر ئەم فەرموودەیەی هەیە، ئەبو بوردە بێ وەچە بووە. منداڵو منداڵەزای لەپاش بەجێ نەماوە.

لەلایەنگیرانی پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو طالیب بوو، لەهەموو نەبەردەكانیدا، دەڵێن: لەدەوروبەری ساڵی چلو یەك، یا چلو دوو، یا چلو

پێنجی کۆچیدا مـردووەو مـەرگ بووە بـەمیوانیو بـەمردنی خـودا مـردووە. (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

١٢٧٩- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـالَ: { " أَقِيلُـوا ذَوِي اَلْهَيْئَـاتِ عَثَـرَاتِهِمْ إِلَّـا اَلْحُـدُودَ"} رَوَاهُ احمـدو أَبُـو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ والبيهقي. وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { مَا كُنْـتُ لِـأُقِيمَ عَلَـى أَحَـدٍ حَدًّا، فَيَمُوتُ، فَأَجِدُ فِي نَفْسِي، إِلَّا شَارِبَ الْخَمْرِ" فَإِنَّهُ لَوْ مَـاتَ وَدَيْتُـهُ } أَخْرَجَـهُ اَلْبُخَارِيّ.

لەتاجول ئوصولدا ئاوایە:

١- عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو رەزای خـودا لەهـەموو هاوسـەرو هاوەڵـەکانی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەددی شـەرعی لێ دەرچێ، لـە وردە هەڵـەی گـەورە پیـاوان، چاوپۆشـی بکـەن). لەگێڕانـەوەیـەکدا: (لـەناو خۆتانـا لەحـەددی شـەرعی خـۆش بـبنو بەرلـەوەی کـە داواکـە بگاتـە لای مـن، کـار بۆیەکتری ئاسان بکەنو، کێشەو گرفتەکان لەناو خۆتانا چارەسەر بکەن، بەڵام هەر حەددێ گەیشتە لای من (واتە: گەیشتە لای قازیو دادگا) ئـیتر پێویـستە جێبـەجێ بکـرێ!). {صـحیح الجـامع: ١١٨٥} + {تـاج/٣، زنجیـرە: ١٠٠، ژمـارە: ٢٣٩٦ ج/٤}.

٢- ئـەم بەشـی دووەمـەی ئـەم ژمارەیـە لەتەجریـدی بوخاریـدا ئاوایـە: {بەرگی پێنجەم، تەجریدی بوخاری، ژمارە: ٢٠٦٦ = بوخاری: ٦٧٧٨ + مختـصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤٨ = تەرقیم شیحا: ٤٤٣٣}.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: داری حەددی شەرعی، لەهەرکەسێ بـدەم، لـەو کەسانەی کـەداری حـەددیان بـەپێی شەرع لێ دەدرێ، وەك بوختیانکەرو داوێنپیس، ئەگەر بەو داری حەددەی منە

بشمرێ دەربەستی نیمو خەمو خەفەتی پێ ناخۆم، چونکە ئەو جۆرە حەددانە، پێغەمبەر خۆی دیاری کردوونو دایناون، بەڵام ئەگەر گریمان داری حەددی مەینۆشی لەکەسێ بدەمو بەو داری حەددەی منە بمرێ، ئەوە پەستم دەکا، وەخوێنی ئەو کابرایەیش دەدەم کە لەکاتی وادا، لەژێر داری حەددی مەینۆشیدا بمرێ، چونکە حەددی بادەنۆشی (مەینۆشی = ئارەقخۆری) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەدیاری کردووەو نە دایناوە، لەسەر ئەم شێوەیەی ئێستا، کەهەشتا داری لێ دەدرێ!. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٢٣٧٤ چ/٤}.

١٢٨٠- وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " مِنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ" } رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح ابن ماجة: ٢٠٩٣. تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٧٣ = بوخاری/٢٤٨٠. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٨٦ = شيحا: ٣٥٨، ٣٥٩. رياض/٣، زنجيرە: ٢٣٥، ژمارە: ١٣٥٧}:

سەعیدی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ ئەوە شەهیدە).

١٢٨١- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ قَالَ: سَمِعْتَ أَبِي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { " تَكُونُ فِتَنٌ، فَكُنْ فِيهَا عَبْدَ اَللَّهِ اَلْمَقْتُولَ، وَلَا تَكُنْ اَلْقَاتِلَ" } أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي خَيْثَمَةَ. وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ.

{صحيح، إرواء الغليل/٢٤٥١}:

عەبدوڵڵای کوڕی خەبباب (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هۆشیار بن ئاژاوەگەلو فەرتەنەگەلێ بەرپادەبنو دەقەومێن،

دەی تۆ ئەی موسوڵمان! ئەگەر تووشت بوو بەتووشی ئەو جۆرە ئاژاوەگەلە خوێناوییەوە، ئەگەر کوژراویت کەس مەکوژرە).

ئەمەیش گێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیە:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاژاوەو ئاشووبو فەرتەنەگەلێ دەقەومێن، هەتا لێیان دووربیو دووریان لێ بگریو خۆتیان لێ بپارێزی هێشتا هەر کەمە، ئەوەی بچێت بە پیریانەوە دێن بەپیریەوەو بەرۆکی پێ دەگرن!

دەی هەرکەسێ لەو سەردەمو کاتانەدا پەناو پاسارێکی دەست کەوت، با خۆی تیا حەشار بداو لەوێ خۆی قایم بکا، هەتا ڕزگاری ببێ لەدەستی ئەو ئاژاوە گەلە). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٧، لاپەڕە: ٥٢٥، ژمارە: ٥٤٨٦. تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٩٧ = بوخاری/مناقب/٣٦٠١، ٧٠٨٢. مسلم. فتن: ٧١٧٦، ٧١٧٨}.

لە (سبل السلام)ی ڕاڤەنامەی (بلوغ المرام)دا، دەفەرموێ: هۆکاری ئەم فەرموودەیە ئەم چیرۆکەیە:

کۆمەڵێ لەخەواریجەکان دەچنە گوندێ، عەبدوڵڵای کوڕی خەبباب بەشڵەژاوی دەردەپەڕێ، باڵاپۆشەکەی بەکێش دەکا، پێیان دەڵێ: سوێندم بەخودا منتان تۆقاند. دووجار وا دەفەرموێ پێی دەڵێن: تۆ عەبدوڵڵای کوڕی خەببابی، کە خەبباب هاوەڵی پێغەمبەر بوو؟ دەفەرموێ: بەڵێ ئەوم. دەڵێن: ئایا شتێکت لەباوکت بیستووە، کەباوکت ئەو شتەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستبێت، کە بۆ ئێمەی باس بکەیت؟

عەبدوڵڵا دەفەرموێ: بیستم لەباوکم دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئاژاوەیەکی دەفەرموو، فەرمووی: (ئاژاوەیێ بەرپا دەبێ، هەتا لێی دوور بیت کەمە، دانیشتوو تیادا باشترە لەڕاوەستاو، ڕاوەستاو تیادا باشترە لەپیادەڕۆ، پیادەڕۆ تیادا باشترە لەغارکردن، جا ئەگەر فریای ئەو

سەردەمە کەوتیت ئەی پیاوی موسوڵمان! با بەندەی خودای کوژراو بیت، نەوەك مرۆی بکوژ).

١٢٨٢- وَأَخْرَجَ أَحْمَدُ نَحْوَهُ: عَنْ خَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

{صحيح الجامع: ٣٦١٦}:

لە (سبل السلام)دا، کە ڕاڤەنامەی ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە دەفەرموێ: {وَلَفْظُهُ عَنْ خَالِدِ بْنِ عُرْفُطَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم): (سَتَكُونُ فِتْنَةٌ بَعْدِي وَأَحْدَاثٌ وَاخْتِلاَفٌ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ عَبْدَ اللهِ المقتولَ لاَ القَاتِلَ فَافْعَلْ)}:

خالیدی کوڕی عورفوطە، کە خالید هاوەڵی پێغەمبەرە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش من، ئاژاوەیەکی گەورەی خوێناوی ڕوو دەدات، وەهەروەها کۆمەڵێ دووبەرەکیو ڕووداوی گەورە گەورە بەرپادەبن، دەی ئەی مرۆی موسوڵمان، هەرکێ هەیتو لەهەرکوێ هەیت، ئەمە بکە بەدروشمی خۆت: بەندەی کوژراوی خودا بم، نەوەك بەندەی بکوژی خودا). واتە: با دەستی خەڵك، لەکاتی وادا، بەخوێنی تۆ سوور ببێ نەوەك دەستی تۆ، بەخوێنی موسوڵمان سوور ببێ، کەواتە بەهیچ شێوەیێ لەو جۆرە ئاژاوانەدا بەشداری مەکە.

(ڕوونکردنەوە):

١- خەبابی کوڕی ئەرەتت (ڕەزای خودای لێ بێ) لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئازارو ئەشکەنجەی زۆری چەشتووە لەپێناوی ئیسلامەتیدا، لەزۆربەی شەڕو شەڕگاکانی ئیسلامدا بەشداری کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی خەبابو جەبری کوڕی عەتیکدا، سیو دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری پێنجیانی گێڕاوتەوە، لەسەردەمی نەزانیدا ئاسنگەر بوو، شمشێری دروست دەکرد، خەبباب دەیفەرموو: جارێ لەسەردمی ئیسلامەتیدا، ئاگرێکیان کردەوە بۆم، ئەوجا

ڕایان کێشام بەسەریدا، بەرەبەرە چەوریو بەزی پشتم ئاگرەکەی کوژاندەوە!
پشتی بەهۆی ئەم کارەساتەوە تەواو سووتا بوو، چاڵو چوێل بوو بوو!!

خەبباب لەکووفە نیشتەجێ بوو، لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا، لەکووفە لە (٣٧) سییو حەوتی کۆچیدا بەمەرگی خودا مرد، پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد!.

٢- خالیدی کوڕی عورفوطە (هاوەڵی پێغەمبەرە) بەخەڵکی کووفە دائەنرێ، ئەبو عوثمانی نەهەدیو عەبدوڵڵای کوڕی یەسارو موسلیمی مەولای فەقێی بوونو گێڕانەوەیان لەوەوە ئەنجام داوە، سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص، لەڕۆژەکەی کوشتاری قادسیەدا ئەوی کردە سەرلەشکری ئەو جەنگە، لەساڵی (٦٠) شەستی کۆچی لە کووفە، بەمەرگی خودا، لەجیهان دەرچوو، وە مەرگ بوو بەمیوانی!.

## زنجیرە/٨٥

## ١٢- نامەی خەباتو غەزاو تێکۆشان لەڕێگەی سەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا

## كِتَابُ الجِهَادِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول/٤، زنجیرە: ١١، لاپەڕە: ٦٤٣ لە ژمارە: ٤٢٩٧ ەوە هەتا ٤٦٤٩ + تەجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ٢٧٩ چ/١، زنجیرە: ٦٠، لە ژمارە: ١١٤٦ هەتا ژمارە: ١٢٨٦ + مختصر صحیح مسلم/٣، لاپەڕە: ٣٠، چاپی یەکەم لە ژمارە: ١٠٦٨ هەتا ژمارە: ١١١١}

١٢٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { " مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِهِ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٠٧٣ = ٤٩٠٨ = صحيح مسلم/١٩١٠}:

**ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی بمرێو غەزای نەکردبێو لەدڵیشەوە لەژیانیدا بەتەمای غەزاکردن نەبووبێ، ئەوە کە دەمرێ ڕەگێکی ناپاکیو دووروویيو مونافیقی واتیادا). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٢١١ ج/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ٣٩٥/١٣٤١/٥٧ ج/٤}.**

١٢٨٤- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {" جَاهِدُوا اَلْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ، وَأَنْفُسِكُمْ، وَأَلْسِنَتِكُمْ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع: ٣٠٩٠}:

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەماڵتان، بەسەروگیانتانو بەزمانو گوتارتان، خەبات بگێڕن لەگەڵ فرەخواکان، کە هاوەڵ دادەنێن بۆ خودای گەورە).**

١٢٨٥- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: { قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! عَلَى اَلنِّسَاءِ جِهَادٌ؟ قَالَ: "نَعَمْ. جِهَادٌ لَا قِتَالَ فِيهِ، اَلْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ" } . رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَه. وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{صحيح الجامع: ٣٠٩٠. ابن ماجة: ٢٩٠١. بوخاری: ٢٨٧٥}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا خەباتو غەزا کردن، لەسەر ژنان پێویستە وەك لەسەر پیاوان پێویستە، بەپێی مەرجی خۆی؟**

فـەرمووی: (بـەڵێ، بـەڵام خـەباتو غـەزاکردنی ئێـوەی ژنـان بریتییـە لەحەجو عەمرە، کەشتی وایش شەڕوشۆڕی تیادا نییە).

دانەر دەفەرموێ: بنەما (ئەصڵ)ی ئەم فەرموودەیە لەبوخاریـدا هەیـە، بەم دوو بێژەیە لەبوخاریدا هاتووە:

١- عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: داوای مۆڵـەتم کـرد لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کەرێگـەی خـەباتو غـەزام پـێ بـدا، فەرمووی: (خەباتو غەزای ئێوەی ژنان حەجە).

٢- عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبابەتی غەزای ژنانەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد، فەرمووی: (بەڵێ خەباتو غەزای ژنان حەجە).

١٢٨٦- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَسْتَأْذِنُهُ فِي اَلْجِهَادِ. فَقَالَ: " أَحَـيٌّ وَالِـدَاكَ؟" ، قَـالَ: نَعَمْ: قَالَ: " فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ" } . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری: مختصر صـحیح البخـاری/٣، ژمـارە: ١٢٢٩ = ٣٠٠٤، ٥٩٧٢. پوختەی موسلیم: مختصر صحیح مسلم/٥، ژمـارە: ١٧٥٦ = شیحا: ٦٤٥٤ = صحیح مسلم/٢٥٤٩}:

لە پوختەی موسلیمدا ئاوا کراوە بەکوردی:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عـاص (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ لـە یەمەنـەوە هـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خـودا! دەمـەوێ پـەیمانت پـێ بدەم لەسـەر ئـەوەی کـە کـۆچ بکـەم بـۆلای تـۆ، بـۆ مەدینـەو ئـەوجا خـەباتو تێکۆشـانو غـەزا ئـەنجام دەدەم، مەبەستیـشم لـەم کـۆچو خەباتگێڕانـە، تـەنیا ڕەزای خـودای گەورەیــەو بــەس. پێغەمبــەر (درودی خــودای لەســەر بــێ) فـەرمووی پێـی: (ئایـا دایـكو باوکـت کەسـیان لـەژیانا مـاون؟). گـوتی: بـەڵێ،

هەردووكيان ماون، فەرمووی: (مەبەستيشت پاداشی باشی لای خودای گەورەو سەروەرە، لەم كۆچو بارە؟). گوتی: بەڵێ، فەرمووی: (دە بڕۆرەوە بۆلای دايكو باوكت لەجياتی كۆچو چوون بۆ غەزاو خەباتگێڕان لەپێناوی ئايينی خودادا، بەجوانی هاوڕێتی ئەوان بكەو دڵيان ڕابگرەو باشبە بۆيانو غەزای تۆ ئەوەيە كە خزمەتی ئەوان بكەيت). {تاج/٤، زنجيرە: ٢٠، ژمارە: ٤٣٦٤. أبوداود. جهاد: ٢٥٢٩. ترمذی. جهاد: ١٦٧١. نسائی. جهاد: ٣١٠٣. تحفة الأشراف: ٨٦٣٤}.

(ڕوونكردنەوە):

بەشێوەی گشتی، بەپێی ئەم فەرموودەيە، لەكاتی ئاسايیدا، خاوەنی مەهانەی ڕەوا، ئەگەر نەشچێ بۆ غەزا قەيناكا.

١٢٨٧- وَلِأَحْمَدَ، وَأَبِي دَاوُدَ: مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ نَحْوُهُ، وَزَادَ: { "اِرْجِعْ فَاسْتَأْذِنْهُمَا، فَإِنْ أَذِنَا لَكَ" وَإِلَّا فَبِرَّهُمَا" }.

{المسند (٣/٧٥ – ١١٧٤٤). أبوداود: ٢٥٣٠}:

ئيمامی ئەحمەدو ئيمامی ئەبو داوود (ڕەحمەتی خودايان لێ بێ) دەگێڕنەوە، لە ئەبو سەعيدی خودريەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) كە ئەم زيادەيەی هەيە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (دە بچۆرەوە بۆلای باوكو دايكت، داوای مۆڵەتيان لێ بكە، كەڕێگەت بدەن بچيت بۆ غەزاو خەباتگێڕان، جا ئەگەر مۆڵەتيان دايت ئەوا باشە، دەنا سەرقاڵی چاكەكردن بە لەگەڵ ئەوان!).

١٢٨٨- وَعَنْ جَرِيرٍ الْبَجَلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ اَلْمُشْرِكِينَ" } رَوَاهُ اَلثَّلَاثَةُ وَإِسْنَادُهُ صَحِيحٌ، وَرَجَّحَ اَلْبُخَارِيُّ إِرْسَالَهُ.

{أبوداود: ٢٦٤٥. ترمذی: ١٦٠٤. نسائی (٨/٣٦) مرسلاً. طبرانی (٢/٣٠٣ رقم: ٢٢٦٤). بيهقی (٨/١٣١ رقم: ١٦٢٤٨)}:

جەریری ئەل – بەجەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر موسوڵمانێ، بەبێ مەهانەیەکی ڕەوا، کۆچ نەکا بۆلای منو لەناو وڵاتی ناموسوڵمانانا، بمێنێتەوەو نیشتەجێ بێ، ئەوە فڕی بەسەر منەوە نییەو من لەو بەریم!).

(ڕوونکردنەوە):

١- لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەپێش ئازادکردنی مەککەدا، کۆچو هیجرەت، لەخانەی بێباوەڕییەوە، کەناسراوە بەدارول کوفر، فەرزو پێویست بووە لەسەر کەسێ، کەئیسلامی وەرگرتبێ، کە دەبێ کۆچو بار بکا بۆ خانەی ئیسلام کەناسراوە بە (دارالإسلام).

بەڵام ئەم بڕیارە لەپاش گرتنی مەککەو ئازادکردنی، ئەو دەگەرەی نەماوە، وە پەیوەندی موسوڵمان بەوڵاتی ناموسوڵمانەوە، لەچەند یاسایەکا ڕکخراوە. هەر لەم ڕوانگەوەیە کەئێستا لەهەموو جیهاندا، کەمایەتی ئیسلامی هەیە، وەمزگەوتیان هەیە، وەپەیوەندیان لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا زۆر باشە، وەدێن بۆ حەجو هاموشۆی گەرمی وڵاتە ئیسلامییەکان دەکەنو..........تاد.

٢- جەریری کوڕی عەبدوڵلای ئەل – بەجەلی، هاوڕێی مەزنی پێغەمبەر، لەئاخرو ئۆخری تەمەنی پێغەمبەردا موسوڵمان بووە، سەد فەرموودەی لەپەڕاوەکانی فەرموودەدا هەیە، لەبوخاریدا نۆی هەیە، لەموسلیمدا چواردەی هەیە، هەشتیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو پیری موسلیمن، لەکووفە نیشتەجێ بووە، لەپاشا لە قەرقیسیا، هەرلەوێش لەساڵی (٥١) پەنجاو یەکی کۆچیدا، بەدەردی خودا مردووە، لەبەر جوانی پێیان دەگوت: یوسفی ئەم نەتەوەی ئیسلامە.

لە ئاژاوەو شەڕو شۆڕەکەی ناو موسوڵماناندا، کەنارگیرو بێ لایەن بوو. (ڕەزاو رەحمەتی خودا لەخۆیو لەهەموو هاوەڵو پەیڕەوانی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار بێت!).

١٢٨٩- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " لَا هِجْرَةَ بَعْدَ اَلْفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٤٣ = ١٨٣٤ بوخاری. صحیح مسلم شیحا: ٣٢٨٩}:

**لەتاجول ئوصولدا ئاوایە:**

**ئیبنـو عـەبباس (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی ڕزگـارکردنی شاری مەککە، کە ناوبانگی دەرکردووە بە فەتحی مەککە، لەپاش گرتنی شاری مەککەو ئیسلام بـوونی دانیـشتووەکانی، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـیتر کـۆچ کـردن لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە نـەما، چـونکە مەککەیش وەك مەدینە بوو بەخاكو وڵاتی ئیسلامو لەژێر ڕکێفی بێباوەڕان دەرچوو، بەڵام کۆششو تێکۆشانو جیهادو غەزاو نیازی پاك هەر ماونو هەر دەمێـننو هـەتا هەتایـە دەبـن بـەهۆی سـەربەرزی هـەردوو جیهـانو مایـەی رووسووری لەلای خودای گەورە، جا هەرکاتێ داواتان لێ کرا، کە بچن بـۆ غـەزا دەرچنو بڕۆن بۆی!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٤٣٥٧ – ش/د/ت/ن – ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

١٢٩٠- وَعَنْ أَبِي مُوسَى اَلْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اَللَّهِ هِيَ اَلْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اَللَّهِ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريد البخاری/٣، رقم: ١١٦٠ = ٢٨١٠، ٤٥٨٠. مسلم: ١٩٠٤ = مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٨٨ = شیحا: ٤٨٩٦. أبوداود. جهاد: ٢٥١٧. ترمذی. جهاد: ١٦٤٦. نسائی. جهاد: ٣١٣٦. تحفة الأشراف: ٨٩٩٩}:

**ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ لـە عەرەبە دەشـت نـشینەکان، هاتـە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزیکرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! پـێم بفـەرموو: پیـاوی وا**

هەیە، بۆ تالآنو دەستکەوت شەڕ دەکا، پیاوی وایش هەیە بۆ ناو وشۆرەت شەڕ دەکا، پیاوی وایش هەیە دەجەنگێ هەتا شوێنی دیار بێو بڵێن: ئازایە، ئەمانە کامەیان لەبەر رەزای خودایە؟! فەرمووی: (هەرکەسێ بجەنگێ هەتا یاسانامەی خودای گەورە سەربکەوێ، ئەوە لەبەر رەزای خودایە). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٤٣٥٠ ج/٤}.

١٢٩١- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ اَلسَّعْدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " لَا تَنْقَطِعُ اَلْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ اَلْعَدُوُّ" } رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٥٢١٨. نسائى (١٤٦/٧ - ١٤٧). ابن حبان: ١٨٠}:

عەبدوڵلای کوڕی ئەل - سەعدی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەتا شەڕو شۆڕ لەگەڵ دوژمنی بێباوەڕدا بمێنێ کۆچ کردن (هیجرەت)یش دەمێنێ!).

(روونکردنەوە):

عەبدوڵلای کوڕی ئەل - سەعدی (رەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، کەسناو (کونیە)ی ئەبو موحەممەدە، لەگەڵ هۆزەکەیدا هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم عەبدوڵلایە لەهەموویان بەتەمەن گچکەتر بوو، ساڵی (٥٧) پەنجاو حەوتی کۆچی لەشام مردووە (رەزای خودای لێ بێ).

١٢٩٢- وَعَنْ نَافِعٍ قَالَ: { أَغَارَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى بَنِيَّ اَلْمُصْطَلِقِ، وَهُمْ غَارُّونَ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ، وَسَبَى ذَرَارِيَّهُمْ. حَدَّثَنِي بِذَلِكَ عَبْدُ اَللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنهُمَا) } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِيهِ: (وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَّةَ).

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٨٩ = ٢٥٤١ بوخاری پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٢٠ = شیحا: ٤٩٣٩ = مسلم/١٧٣٠. أبوداود. جهاد: ٢٦٣٣}:

لەتەجریددا ئەم فەرموودەیە ئاوا کراوە بە کوردی (ژمارە: ١٠٨٩):

ئیبنو عەون (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نامەیەکم بۆ نافیع نووسی، لەبارەی بانگەوازی پێش دەستپێکردنی جەنگەوە پرسیارم لێ کرد، کە ئایا مەرجە دوژمن لە پێشدا ئاگادار بکرێ یان نا؟

ئەویش نامەی بۆمن نووسییەوە: کە ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە وابوو، هەتا بانگیان نەکردنایە بۆسەر ئیسلامو، لەپاش مل نەدانو رەددی قەبوولی ئایینی ئیسلام، ئاگاداریان نەکردنایەتەوە، کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕ، پەلاماریان نەدەدان، بەلاّم لەوەپاش پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) پەلاماری تیرەی بەنی موصطەلەقی داو، ئاگاشیان لەخۆیان نەبوو، لەوکاتەدا ئاژەڵەکانیان لەسەر ئاوبوو، خەریکبوون ئاویان ددەدان!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو جەنگەدا پیاوە جەنگاوەرەکانی کوشتنو خێزانەکانی بەتالاّنی بردن، وەهەر لەو رۆژەدا بوو کە جووەیرییەی کچی حاریثی سەرکۆماری ئەو خێڵەی دەستکەوتو مارەی کرد بۆ خۆیو جووەیرییە بوو بەیەکێ لە (أُمَّهَاتُ المُؤمنين)ەکان). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤٤٦٢ چ/٤}.

**(روونکردنەوە):**

جووەیرییەی کچی حاریث هاوسەری پێغەمبەرە، یەکێکە لەدایکانی باوەڕداران، کە ناسراون بە ئوممەهاتول موئمنین، لەهۆزی بەنی موصطەلیقە، لەپێشا ناوی (بەررە) بوو، کە بەواتا (باش = چاك = خاس) بوو، وەك چۆن لەکوردیدا دەگوترێ: برا خاس، دادە خاسە، کاکە باشە. کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مارەیکرد بۆ خۆی، ناوەکەی گۆڕیو ناوی نا جووەیرییە، واتە: کچۆڵە، چونکە پێی ناخۆش بوو کە بگوترێ: (خَرَجَ مِنْ عِنْدِ بَـرَّةَ) چونکە ئەوە بۆنی ئەوەی لێ دێ، کە پێغەمبەر لەچاکە دوور

کەوتبێتەوە. حاریثی باوکی ئاغای هۆزی بەنی موصطەلیق بوو، جووەیرییە کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە، لە بوخاریو موسلیمدا، لەچەند شوێنێکا، لەچەند بۆنەیەکا ناوی هاتووە، لەسەر فەرمایشتی شێخی عەینی، لە عومدەتولقاریئدا، ژنێکی سەلارو سەنگینی یادکاری زمانپاراو بەزیکرو یادی خودا بووە، زۆر جاران کە نوێژی بەیانی دەکرد، لەسەر جێگە نوێژەکەی دادەنیشت، کۆمەڵێ ناوکە خورما، یا چەوو بەردە وردەی لەبەردەمی خۆیدا دادەنا، وەك تەزبێحی ئەمڕۆ، بەو ناوکە خورماو بەردو چەوانە، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ، لەباتی تەزبیح، ویردو یادو تەسبیحاتی پێ دەژماردن، لەتەمەنی شەستو پێنج ساڵیدا، لەمانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی پەنجاو شەشی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩١٦، لاپەڕە: ٢٩٨ چ/١ = چاپی یەکەم. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٠٣ - روونکردنەوە}.

بۆ زانیاری زیاتر، سەبارەت بەم بابەتە بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

١- تاجول ئوصول/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٣٠ کەخاتوو جووەیرییە خەریکی تەسبیحات بووە، لە عەرەبییەکەدا ص٢١٧.

٢- تاج/٣، زنجیرە: ٣٥، ئایەتەکان لەسەرەتای زنجیرەکەوە، کەباسی قەدرو ڕێزی دایکانی موسوڵمانان دەکەن ئەم زنجیرەیە لەچاپی چوارەمی تاجدا دەکەوێتە لاپەڕە: ٦٦٩، کە لەپێش ژمارە: ٣٤٢٥ دایە.

٣- تاج/٤، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٤٦١٧ = تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٧ — باسی غەزای بەنی موصطەلیق.

٤- تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٣، ٤٩٧٤ — باسی ژماردنی تەسبیحاتو ویردو سەرچاوەی تەزبیح. چ/٤.

٥- عومدەتولقاری/ شێخی عەینی، بەرگی/١١ ص١٠٦ + ص٢٨٧ + عینی/١٧ ص٣٠٤ + ٣١٤ + عینی/١٣ ص٩٥.

٦- فەتحولباری/ شێخی عسقلانی، بەرگی/٤ ص٢٣٢، فەرموودەی ژمارە: ١٩٨٤ = ٩١٦ تەجریدی بوخاری.

٧- الإصَابة في تمييز الصَّحَابَة، المجلد/٤ ص٢٥٦ (جويرية) تسلسل/٢٥١ من أسمَاءِ النِّسَاء.

٨- الإستيعاب في معرفة الأصحاب، لابن عبد البَرّ، مُجَلَد/٤ اسم (جويريّة) من أسماء النساء، ص٢٥٨.

٩- تاج/١ ص٢١٧ + تاج/٢ ص٢٠٢ + ص٢٧٢ + تاج/٥ ص١٠١.

١٠- صحيح مسلم بشَرْحِ الإمام النووي، المجلد/١٧ ص٤٤ + شرح صحيح مسلم/١٠ ص١٤٠ هەتا ص١٤٥.

١١- لەسەر فەرمایشتی ئیصابە، مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەریش، لەپێشدا ناوی (بەررە) بووە، پێغەمبەر کە مارەی دەکا، ناوی دەنێ: (مەیموونە = پیرۆز = پێبەخێر).

هەروا لەسەر فەرمایشتی ئیصابە، زەینەبی کچی جەحشیش لەپێشا ناوی (بەررە) بووە، پێغەمبەر کە مارەی دەکا، دەیگۆڕێ بەزەینەب.

١٢- لیستی ناوی هاوسەرەکانی پێغەمبەرو شوێنی ژیاننامەیان لە تەجریدی بوخاریو موختەصەری صەحیحی موسلیمدا:

١- عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق. پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم، بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٧٨، ژمارە: ٤١ = شیحا/٥١٧.

تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣ + تەجرید/٢، ژمارە: ٩٢٧، ٩٢٨، ٩٢٦، ١٧٤٨. تاج/٤، لاپەڕە: ١٥٢ هەروەها = تاج/٢، لاپەڕە: ، ژمارە: ٣١٤٧ چ/٤. بڕوانە: پوختەی موسلیم/٢ لیستی ناوی هاوەڵان، لاپەڕە: ٣٩٥، ژمارە: ٣٢، فەرموودەی/٤١.

بلوغ المرام بەکوردی/١، ژمارە: ٣٠ + تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٠ چ/٤

٢- خەدیجەی کچی خووەیلید. پوختـەی موسـلیم/١، لاپـەڕە: ١١٢، ژمـارە: ٧٣. لیـستی یەکـەم لەبـەرگی دووەم دا، لاپـەڕە: ٣٩٦، ژمـارە: ٤٠، ژمـارەی فـەرمووده/٧٣، چ/١ = چـاپی یەکـەم + تەجریـدی بوخـاری ژمـارە: ١٥٠٠، ١٤٩٩، ١٤٦٢، ٩١٦ هـەروا بڕوانـە: تـاج/٥، لاپـەڕە: ١٤٩، زنجیـرە: ٣٦: ٥/٤/٣/٢/١ = تـاج/٣، ژمارە: ٣٤٢٥ هەتا ٣٤٢٩ + تاج/٤، لاپەڕە:٢٩١ چاپی یەکەم.

٣- مەیموونـەی کـچی حاریـث. پوختـەی موسـلیم/١، ژمـارە: ١١٧ لیـستی یەکەم ژمارە: ٤٨، دووبارە ژمارەی فـەرمووده ١١٧، ب/١ + تەجریـدی بوخـاری = پوختـــەی بوخـــاری/١، ژمـــارە: ١٥٤ + (بلـــوغ المـــرام) بـــەکوردی/١، ژمـــارەی فەرمووده/٢٣.

٤- حەفصەی کچی ئیمامی عومەر. مختصر صحیح مسلم/١، ژمـارە: ٣٥٨. لیستی/١، ژمارە: ٩٧، ژمارەی فەرمووده/٣٥٨ ب/١ + (بلوغ المرام، بەرگی یەکـەم، ژمارە: ٣٧٥ چ/١ + تاج/٣، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٤٤، چ/٤ + ژمارە: ٣٦٨٥ + مختـصر صحیح البخاری/١، لاپەڕە: ٣٧٦ چ/٢، ژمارە: ٣٥٩.

٥- ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەر، واتە: ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان. بڕوانە: پوختەی موسلیم/١، لاپەڕە: ٤٤٠، ژمارە: ٣٧٠ چاپی یەکـەم. تەجریـدی بوخاری/٢، لاپەڕە: ٤، ژمارە: ٦١٤ + تاج/٣، لاپەڕە: ٧٨ چ/١ = تاج/٢، لاپەڕە: ٤٨٨ ژمـارە: ٢٠٩٤، زنجیـرە: ٣٣ چ/٤ + تـاج/٣، زنجیـرە: ٣٩، ژمـارە: ٤٤٤٢ چ/٤ + بلـوغ المرام بەکوردی ژمارە: ٢٦٤.

٦- ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر. پوختەی موسلیم/٢، ژمـارە: ٥٧٥، لاپـــەڕە: ٨٢، چ/١ = چـــاپی یەکـــەم. پوختـــەی بوخـــاری = مختـــصر صـــحیح البخاری/١، لاپەڕە: ١٢٧، ژمارە: ٩٤. تاج/٣، لاپـەڕە: ٦٧٣، زنجیـرە: ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١ + تـاج/١، لاپـەڕە: ٤٩٤، زنجیرە: ١٨١، ژمـارە: ٩٧٢ چ/٤ + تـاج/٥، لاپـەڕە: ١٥٨ + تاج/٣، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٣٤٤٢ + بلوغ المرام بەکوردی بەرگی یەکەم ژمارە: ١٩.

٧- صەفیەی کچی حویەی (هاوسەری پێغەمبەر). پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٠٦. تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩٣١. تاج/٣، زنجیرە: ٤١، لاپەڕە: ٦٨٢، ژمارە: ٣٤٤٤، چ/٤.

٨- زەینەبی کچی جەحش، هاوسەری پێغەمبەر. پوختەی موسلیم/٢، لاپەڕە: ٣٢٣، ژمارە: ٨٢٤. تەجریدی بوخاری بەکوردی بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٢٠٩، ژمارە: ١١٢١ + پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٨٧، لاپەڕە: ٢٩٢ چاپی یەکەم تاج/٣، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٤٤٣.

٩- سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری پێغەمبەر. تاج/٣، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٣٤٤١ + تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٤، ٢١٧٥.

١٢٩٣- وَعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنه) قَالَت: { كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْصَاهُ فِي خاصَّتِهِ بِتقْوَى اَللَّهِ، وَبِمَنْ مَعَهُ مِنَ اَلْمُسْلِمِينَ خَيْراً، ثُمَّ قَالَ: "اُغْزُوا بِسْمِ اَللَّهِ، فِي سَبِيلِ اَللَّهِ، قَاتِلُوا مِنْ كَفَرَ بِاَللَّهِ، اُغْزُوا، وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَغْدُرُوا، وَلَا تُمَثِّلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيداً، وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ اَلْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ، فَأَيَّتُهُنَّ أَجَابُوكَ إِلَيْهَا، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ: اُدْعُهُمْ إِلَى اَلْإِسْلَامِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ.

ثُمَّ اُدْعُهُمْ إِلَى اَلتَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ اَلْمُهَاجِرِينَ، فَإِنْ أَبَوْا فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ اَلْمُسْلِمِينَ، وَلَا يَكُونُ لَهُمْ. فِي اَلْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ اَلْمُسْلِمِينَ. فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْأَلْهُمُ اَلْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، فَإِنْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ تعالى وَقَاتِلْهُمْ. وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اَللَّهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ، فَلَا تَفْعَلْ، وَلَكِنْ اِجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ" فَإِنَّكُمْ إِنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ. أَهْوَنُ مِنْ أَنَّ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اَللَّهِ، وَإِذَا أَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اَللَّهِ، فَلَا

تَفْعَلْ، بَلْ عَلَى حُكْمِكَ" فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَتُصِيبُ فِيهِمْ حُكْمَ اَللَّهِ أَمْ لَا" } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١١١١ = صحیح مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا/٤٤٩٧ = صحیح مسلم، ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی/١٧٣١}:

ئەم فەرموودەیە، کەمێ هەڵەی واتیادا، لەبەرئەوە وەك خۆی لە (مختصر صحیح مسلم)ەوە، ڕاگوێزی دەکەین، ئەوەی کە لێرەدا دەڵێ: سولەیمان لەباوکیەوە، لە عائیشەوە ئەوە هەڵەیە، بەڵکوو ئاوایە:

سولەیمانی کوڕی بورەیدە (ڕەحمەتو ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ پیاوێکی دەکرد بە فەرماندەی سوپایێ، یا دەیکرد بە سەر پەلو سەر لەشکرو سەر لق، یا دەیکرد بە سەرکردەی سوپایێ، لەپێشا بەتایبەتی ئامۆژگاری خێری دەکردو رایدەسپارد، کە تەقوای خودای گەورەو باڵا دەست بکاتو هەمیشەو هەمە دەم ترسی خودای هەبێ، هەروا ئامۆژگاری دەکرد کە باش بێ بۆ ئەو موسوڵمانانەی کەوان لەگەڵیداو کەخۆی بەرپرسیاریانە، ئەوجا دەیفەرموو:

(بەناوی خودا دەست بکەن بە غەزاو بجەنگێن لەڕێگەی خودادا، شەڕبکەن لەگەڵ کەسانێ کە بێباوەڕنو باوەڕیان بەخودا نییە، غەزا بکەنو خەبات بگێڕن لەم پێناوەداو گزیو دزیو فزی لەتاڵانیو دەستکەوتی جەنگی مەکەن، بێ وادەو بێ پەیمان مەبنو پەیمان بەرنە سەرو نامەردی مەکەن، لاشەی کوژراوەکان ئەتك مەکەنو بەکوژراوی مەیانشێوێنن، مناڵ مەکوژن، ئەی فەرماندەی سوپای ئیسلام! کاتێ خۆتو سوپاکەت ڕووبەڕووی دوژمنی خۆتان بوونەوە، لەفرە خواکانو لە هاوەڵپەیداکاران بۆ خودای گەورە، ئەم یاسایە پیادەبکەن: داوایان لێ بکەن کە یەکێ لەم سێ ڕەوشە قەبووڵ بکەن،

هەرکامـەیێ لـەم سـێ شـتەیان قـەبوولکرد تـۆیش قـەبوولی بکـەو شـەڕیان لەگەڵدا مەکە:

یەکەم: لەپێشا داوایان لێ بکە کە ئیسلام بـبن‌و ئـایینی ئیـسلام قـەبووڵ بکـەن، جـا ئەگـەر ئەمـەیان قـەبوولکرد، تـۆیش لێیـان قـەبووڵ بکـەو واز لەشەڕکردن لەگەڵیاندا بهێنە، کاتێ ئیسلامیان قەبوولکرد داوایـان لێ بکـە کـە لەولاتی خۆیانەوە باربکەن‌و بگوێزنـەوە بـۆ مەدینـە، کـە ڕەوگـەو هەوارگـەی موسـوڵمانانەو ناسـراوە بـە (دارالهجـرە - هـەواری کـۆچ) وەپێیـان بڵـێ: ئەگـەر ئەوەیان کردو کۆچیان کـرد بـۆ مەدینـە، ئـەوا حاڵیـان وەك حـاڵی کۆچـکاران (موهاجیرین) وایە بەبێ زیادو کـەم، ئـەو مافـەی بـۆ موسـوڵمانە کۆچـکارەکان هەیـە، هـەمان مـاف بـۆ ئـەوانیش هەیـە، وە ئـەو ئـەرك‌و مافـەی لەسـەر موسوڵمانە کۆچکارەکان هەیـە، هەمان ئـەرك‌و مـاف لەسـەر ئـەوانیش هەیـە، بـەڵام ئەگـەر حـەزیان لەکۆچـکردن نـەبوو، وەمانـەوە لەشـوێنی خۆیـان، ئـەوا حاڵیان وەك حاڵی موسوڵمانە سارانـشینەکان وایـەو بـە موسـوڵمان دادەنـرێن‌و ئەو بڕیارو شەرعی خودایەی کە ئیمانداران دەگرێتەوە ئەوانیش دەگرێتـەوە، دەبێ پابەندبن بە فەرمانەکانی ئیسلام، بەڵام لەدەسکەوتی جـەنگ‌و لەمفتـە مـاڵ (فَیْـأ) بەشـیان ناکـەوێ‌و پـشکیان بـۆ دانـانرێ، مەگـەر ئـەوانیش لەگـەڵ موسوڵمانانی تردا بچن بۆ غەزاو خەباتگێڕان.

دووەم: جـا ئەگـەر ڕازی نـەبوون کـە موسـوڵمان بـبن، داوای سـەرانە (جزیە)یـان لێ بکـە، ئەگـەر ڕازی بـوون کەسـەرانە بـدەن ئـەوا سـەرانەینان لێ وەربگرەو شەڕیان لەگەڵ مەکە.

سێیەم: بەڵام ئەگەر نە موسوڵمان بوون‌و نـە سـەرانەیان دا، ئـەوا داوای یارمەتی‌و کۆمەکی لەخودا بکەو بەپشتی یاریدەی خودا بجەنگە لەگەڵیاندا.

لـەکاتی قـەومان‌و بـەرپابوونی شـەڕدا، کاتـێ دەوری قـەڵایێ دەگریـت‌و گەمارۆی دەدەیت، ئەگـەر خـەڵکی نـاو قەڵاکە داوایـان لێ کردیـت کـە بەرابـەر

بەوە کەخۆیان بدەن بەدەستەوە، پەیمانی خوداو پێغەمبەری خودایان پێ بدەیت، شتی وامەکە، مەگەر خۆت شتی وا بەباش بزانیت، بەلاّم بەناوی خۆتو هاوڕێکانتەوە پەیمانیان پێ بدە، چونکە ئێوە ئەگەر پەیمانی خۆتانو هاوڕێکانتان بشکێنن، ئاسانترە، لەوە کە پەیمانی خوداو پێغەمبەری خودا بشکێنن، وە هەروەها ئەگەر گەمارۆی خەڵکی قەلاّیەکت داو، داوایان لێ کردیت کە لەسەر فەرمانو (حوکم)ی خودا خۆیان بدەن بەدەستەوە شتی وایان لێ قەبووڵ مەکە، بەلاّم با لەسەر فەرمانی خۆت خۆبدەن بەدەستەوە، چونکە تۆ نازانیت ئایا فەرمانی خودا لەبارەی ئەوانەوە دەپێکیت یانا؟). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ٤٤٥٧}.

١٢٩٤- وَعَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا أَرَادَ غَزْوَةً وَرَّى بِغَيْرِهَا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری = پوختەی بوخاری/٣ – الترجمة الكوردیه. رقم: ١٢٥٧ = ٣٠٨٨ بوخاری + تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦١٩ = بوخاری/٤٤١٨ + پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم الترجمة الكوردیه/ نوری فارس/ بەرگی پێنجەم ژمارە: ١٩١٨ = شیحا/٦٩٤٧ = صحیح مسلم ترقیم (محمد فؤاد عبدالباقی): ٢٧٦٩}:

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کەدەچوو بۆ غەزایێ، شوێنە گومکێی دەکردو بەناوی خۆی ناوی نەدەهێناو، وای پیشان دەدا کەدەچێ بۆ جێگەیێ تر، هەتا دوژمن بەجمو جووڵی سوپای ئیسلام نەزانێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٤٤٧}.

١٢٩٥- وَعَنْ مَعْقِلِ بْنِ اَلنُّعْمَانَ بْنَ مُقَرِّنٍ (رضی الله عنه) قَالَ: { شَهِدْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ أَوَّلَ اَلنَّهَارِ أَخَّرَ اَلْقِتَالِ حَتَّى تَزُولَ

اَلشَّمْسُ، وَتَهُبَّ اَلرِّيَاحُ، وَيَنْزِلَ اَلنَّصْرُ } رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالثَّلَاثَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ. وَأَصْلُهُ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{صحيح أبي داود/٢٣١٣. المسند (٥/٤٤٤). أبو داود: ٢٦٥٥. ترمذي: ١٦١٣. نسائي في الكبرى/٨٦٣٧. ابن حِبَّان: ٤٧٥٧. الحاكم (٣/٣٣٣). تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٧٨ = ٣١٦٠}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولدا ئاوایە:

نوعمان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم لەگەڵ پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر سەر لەبەیانی دەستی نەکردایە بەجەنگ کردن، ئیتر شەڕ دەستپێکردنی دوادەخست، هەتا دەبوو بەنیوەڕۆ، وە با هەڵی دەکرد، وە نەصرو سەرکەوتنو پیرۆزی دادەبەزی). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٧، لاپەڕە: ٧١٩، ژمارە: ٤٤٦٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە لەهەموو سەرچاوەکاندا، لەنوعمانی کوڕی موقەڕرینەوەیە، وشەی مەعقیل هەڵەی قەڵەمە.

٢- نوعمانی کوڕی موقەڕرین هاوەڵی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەو بێ) برای سووەیدی کوڕی موقەڕرینە.

١٢٩٦- وَعَنْ اَلصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { سُئِلَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عَنْ اَلدَّارِ مِنْ اَلْمُشْرِكِينَ. يُبَيِّتُونَ، فَيُصِيبُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيهِمْ، فَقَالَ: "هُمْ مِنْهُمْ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٣٣ = بوخاری/ ٣٠١٢ + تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٤١ = بوخاری/٢٣٧٠، ٣٠١٢. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٣٤ = شیحا/٤٥٢٥}:

صەعبی کوڕی جەثثامە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەئەبواء، یان لە وەددان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات، ئەم پرسیارەیان لێ

كرد: قوربان! جاری وا دەبێ، لەشەودا لەناكاو دەدرێ بەسەر ناموسوڵمانانی جەنگی دا، لەناو ماڵەكانیاندا، لەكاتی ئەم شەبەیخونەدا ژن‌و منداڵ‌و ساوایان بەردەكەون‌و دەپێكرێن، ئایا بەكوشتن، ئایا بەزامار بوون، ئایا بە ئازاری تر، جا ئایا لە بارودۆخی ئاوادا حوكم‌و بڕیاری ئەم جۆرە پێكان‌و بەركەوتنی ژن‌و منالانە چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوانیش لەوان‌و لەبەر ناچاری بڕیاری كوشتنی ژن‌و منال‌و شەڕكەریان، لەدۆخی وادا، كە ئەستەمە لە یەكتری جیابكرێنەوە، وەك یەكەو دروستە). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٤٤٨٠}.

١٢٩٧- وَعَنْ عَائِشَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)): { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لِرَجُلٍ تَبِعَهُ يَوْمَ بَدْرٍ: " اِرْجِعْ. فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ" } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٢٩ = ٤٦٧٧ شيحا = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي: ١٨١٧}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عائیشەی دایكی باوەڕداران (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كاتێ دەرچوو لەگەڵ سوپاكەیدا بۆ جەنگی بەدر، كە گەیشتە حەررەتول وەبەرە، كەناوی شوێنێكە چوارمیل، لە مەدینەی جارانی سەردەمی پێغەمبەرەوە دوور بووە، لەوێ پیاوێكی بتپەرست هاتە خزمەتی، كەبۆ ئازایەتی‌و مەردایەتی‌و دلێری‌و جەنگاوەریی بەناوبانگ بوو، لەبەر ئەوە یاران‌و هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهاتنی ئەو پیاوە، گەلێ دڵشاد بوون، كابراكە كەهات بە پێغەمبەری گوت: هاتووم لەگەڵتا دێم بۆ ئەم جەنگە، هەتا یاریدەی ئێوەیش دەدەم‌و خۆشم لەتالان شتێكم دەست دەكەوێ!؟

ئەویش پێی فەرموو: (باوەڕت هەیە بەخوداو بە پێغەمبەری خودا؟).
گوتی: نەء. فەرمووی: (دە بگەڕێرە دواوە چونکە من یارمەتی لەخودا نەناس ناخوازم).

ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت تا گەیشتە لای (شەجەرەکە) کە ناوی شوێنێکە، جا لەوێ پیاوەکە هاتەوە بۆ لایو هەمان داوای پێشووی کردەوە لە پێغەمبەر، پێغەمبەریش لەجاری پێشوودا چی پێ فەرموو بوو، ئەمجارەیش هەر ئەوەی پێی فەرمووەوە، پیاوەکەیش وەك جاری پێشوو وەڵامی دایەوە، دیسان پیاوەکە گەڕایەوە، هەتا لەبەیداء کەناوی جێگەیەکە، حەزرەتی گرتەوەو قسەکەی یەکەم جاری دووبارە کردەوە بۆ پێغەمبەر، ئەویش فەرمووی پێی: (باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبەرەکەی دەکەیت؟). گوتی: بەڵێ. فەرمووی: (دەوەرە لەگەڵمان!).

(ڕوونکردنەوە):

کورتو پوخت: زاناکان دەفەرموون: بەپێی ڕۆژوو بەپێی بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانان، دروستە سوود لە پسپۆڕیو چالاکی ناموسوڵمان وەربگیرێ، وەك ئەوە بکرێن بە سەربازو بە پۆلیسو بە ئەفسەرو بە سەرلەشکرو بە کارمەندی تر، بەڵام ئەمە کاتێ دروستە کە ئێمە لەناپاکیو لە گزیکاریو لەخیانەتیان دڵنیابین، وەك زۆرینەی هاو وڵاتیە مەسیحییەکانی ناو وڵاتی موسوڵمانان، کە دەبن بەکارمەندو بە وەزیرو بە فەرماندەی سوپاو بە بەرپرسی گەورە، زۆر زۆر کەم ناپاکی‌یان لێ دەبینرێ، بەڵکوو زۆرینەی کات بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵ دەستن، وەك کەسێکی موسوڵمان!

١٢٩٨- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَأَى اِمْرَأَةً مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، فَأَنْكَرَ قَتْلَ اَلنِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١٢٣٤ = ٣٠١٤ بوخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٣٣ = شیحا/ ٤٥٢٣ = صحيح مسلم ترقيم محمد فؤاد/١٧٤٤}:

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: لە غەزایێ لە غەزاکانی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) لاشەی ژنێکی کوژراو، لەهۆزی دوژمن دۆزرایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەچاوی پێی کەوت، کوشتنی ژنو مندالی قەدەغە کرد). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ٤٤٧٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

١٢٩٩– وَعَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " اُقْتُلُوا شُيُوخَ اَلْمُشْرِكِينَ، وَاسْتَبْقُوا شَرْخَهُمْ" } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{ضعيف والجامع: ١٠٦٣. أبو داود/٢٦٧٠. ترمذی: ١٥٨٣. أحمد (٢٠/١٢/٥). ابن حزم في المحلّى/٢٩٨/٧}:

**سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو پیرو بەساڵاچوانەی ناموسوڵمانەکان، کە لەکاتی جەنگا، توانای شەڕکردنیان هەیە، لەکاتی بەرپابوونی جەنگا، لەنێوانی ئێوەو بێباوەڕاندا، ئەو جۆرە پیرو بەساڵا چوانەیش بکوژن، بەڵام منداڵو منداڵکاریان مەکوژن!).**

١٣٠٠– وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) { أَنَّهُمْ تَبَارَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ مُطَوَّلاً.

{بخاری. مغازی: ٣٩٦٦، ٤٩٦٨، ٣٩٦٩، ٤٧٤٣. مختصر صحيح مسلم = پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ٢١٥٢ = شیحا/٧٤٧٨ = مسلم ترقيم (محمد فؤاد عبدالباقی): ٣٠٣٣}:

**ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحيح مسلم)دا، ئاوا کراوە بەکوردی:**

ئـەم فەرموودەيـە لـە تـاجول ئوصـولا ئاوايـە، دەيكـەين بەڕاڤـەو رووونكردنەوە بۆ ئێرە:

پێشەوا عـەلی كـوڕی ئـەبو طاليـب (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: لـەڕۆژی ژينـەوەدا، مـن يەكـەم كـەس دەبم كـە لەبـەردەمی خـودای گـەورەو ميهرەبانـدا بەچۆكا دێـمو سـكاڵای حـاڵی خـۆم دەكـەم لەدەسـت ناحـەزەكانی خۆم.

قەيـسی كـوڕی عوبـاد (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەيفـەرموو: لەئـەبو زەرری غيفاريم بيست دەيفەرموو (رەزای خودای لێ بێ) وە سوێندی دەخوارد لەسـەر ئـەوە كـە ئـەم ئايەتـە: {هَـذَانِ خَـصْمَانِ اخْتَـصَمُوا فِـي رَبِّهِـمْ – الحج/٢٢/١٩} لەشانی ئەم دوو دەستەيەدا هاتە خوارێ، كە لـەڕۆژی غـەزای بەدردا چوونە مەيدان بۆ يـەكتری، دەسـتەی موسـوڵمانەكان: عـەلیو حـەمزەو عوبەيـدە بـوون، دەسـتەی بێباوەڕەكـانيش شـەيبەی كـوڕی رەبيعـەو عوتبـەی كوڕی رەبيعەو وەليدی كوڕی عوتبە بوون). {تاج/٤، زنجيرە: ٥، ژمـارە: ٣٩٩٨ سـورەتی حـەج} ئـەم فەرموودەيـە دواهـەمين فەرموودەيـە لـە صـەحيحی موسليمدا.

١٣٠١- وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَـذِهِ اَلْآيَـةُ فِينَـا مَعْشَرَ اَلْأَنْصَارِ، يَعْنِي: وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى اَلتَّهْلُكَةِ قَالَهُ رَدًّا عَلَى مَـنْ أَنْكَـرَ عَلَـى مَنْ حَمَلَ عَلَى صَفِ اَلرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ . رَوَاهُ اَلثَّلَاثَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{السلسلة الصحيحة: ١٣. الصحيح المسند: ٣١٥. أبو داود: ٢٥١٢. ترمذی: ٢٩٧٢. نسائی في السنن الكُبْرى: ١٠٩١٦}:

ئەمـە دەقـی ئـەم فەرموودەيـە لـە تـاجول ئوصـولدا، بـەرگی چوارەم، لاپەڕە: ١٠٧، ج/٤، زنجيرە: ٣ – تەفسيری سوورەتی بەقەرە، ژمارە: ٣٧٢٣:

ئەبو عیمرانی ئەسلەمی کوڕی زەیدی نەجیبی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە قوستەنتەنییە بووین، خەریك بووین ئازادی بکەین، لەوکاتەدا ریزێکی گەورەی ئەوانمان بۆ هاتە مەیدان، لە موسوڵمانانیش بەقەد ئەوان، بگرە زیاتریش، شێرانە دەرچوونو بۆیان چوونە مەیدان، عوقبەی کوڕی عامیر سەرکردەی خەڵکی میصر بوو، وە سەرکردەی کۆمەڵەکەیش فەضالەی کوڕی عوبەید بوو، جا پیاوێ، لە موسوڵمانان، هەڵمەتی بردە سەر ئەو ریزە لە لەشکری ڕۆمو نەوەستاو لەهیچ کۆی نەکردەوە هەتا خۆی کرد بەناویاناو دڕی پێیاندا، خەڵکەکەش هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: سوبحانەڵڵا! شتێکی سەیری کرد! بەدەستی خۆی، خۆی دەهاوێتە زناو ئاگری سوورەوە، خودایش دەفەرموێ: {وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ – البقرة/٢/١٩٥} . واتە: بەدەستی خۆتان، خۆتان تووشی فەوتانو سەرتیاچوون مەکەن).

کەچی ئەبو ئەیووبی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) هەڵسایەوە وتارێکی داو فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئێوە لەخۆتانەوە، ئەم ئایەتە بەم شێوەیە لێك دەدەنەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە هاتە خوارەوە، کە کۆمەڵی یاریدەدەرانین، کە ناسراوین بە ئەنصاری پێغەمبەر، چونکە کەخودا ئایینی ئیسلامی سەرخستو کاتێ یارمەتی دەرانی ئیسلام زۆر بوون، ئێمەی ئەنصار، لەناو خۆمانا بەنهێنی، بە یەکتریمان دەگوت: ماڵو سامانمان هەموو تیاچوو، ئەوا خودای گەورە ئیسلامی سەرخستو پشتیوانانی ئیسلام زۆر بوون، دەی کەوایە، با ئێمەیش ئیتر خەریکی ماڵو سامانو باخو ڕەزو کێڵگەکانی خۆمان بینو ئەوەی کەماوەو نەفەوتاوە پەروەردەی بکەین!

جا خودای گەورەو سەرومر، بەرپەرچی بۆچوونەکەی ئێمەی دایەوەو ئەم ئایەتەی بەم بۆنەیەوە بەتەواوی نارده خوارەوە بۆ پێغەمبەری خۆی کە دەفەرموێ:

{وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ – البقرة/٢/١٩٥}.

واته: ماڵی خۆتان بەخت بکەن لەڕێگەی خودادا، وە بەدەستی خۆتان، خۆتان مەخەنە ناو نەمانو فەوتانو سەرتیاچوونەوە، وە چاکە بکەنو هەموو شتێ لەسەر شێوەیەکی چاکی شەرعی بکەن، بەڕاستی خودای مەزن چاکەکارانی خۆش دەوێ، وە ئەوەی کە پێشەی چاکەیە خۆشەویستی خودایە).

پیشەت چاکەبێو خراپە نەکردن

خۆشەویستی خوایت، لەژیانو مردن!

کەواتە: لەسەر ئەم بنیاتە تیاچوونو فەوتانو لەناوچوونو نەمان ئەوەیە کە بەدیار باخو رەزو ماڵو سامانەوە کڕکەوینو خەریکی ماڵداریی کردن ببینو واز لە غەزاو خەبات گێڕان بهێنین! چونکە لەم حاڵەتو بارو دۆخەدا، گیانی لەخۆبووردنو خۆبەخت کردن لەپێناوی خودادا نامێنێ. دوژمن باشترین هەلی دەست دەکەوێو دەتان فەوتێنێ.

ئیتر ئەبو ئەییوب (رەزای خودای لێ بێ) شەوقی کەوتە سەر غەزاو بەبێ پەروا، بەپێوە راوەستاو دەستی کرد بە کوشتارو شەڕکردنو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا هەتا شەهید کرا، وە لەخاکی رۆم بەخاك سپێردرا).

بڕوانە فەرموودەی ژمارە (١٠٤) کە لەپێشەوە رابورد بۆ ژیاننامەی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری.

١٣٠٢– وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { حَرَقَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَخْلَ بَنِي اَلنَّضِيرِ، وَقَطَعَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٣٨ = بوخاری/٤٠٣١، ٣٠٢١، ٤٠٣٢، ٤٨٨٤. مختصر صحیح مسلم/٣. ژمارە: ١١٣٥ = شیحا/٤٤٢٨}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیم (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەزە خورماکانی جوولەکەکانی بەنی نەضیری سووتاندو فەرمانی دا بڕییانن، کە ئەم ڕەزانە لە بووەیرە بوون، کە نزیکی دوو میل لەمەدینەی جارانەوە دوورە، کە ئەم جوولەکانە، ئەو پەیمانە کەدابوویان بە پێغەمبەر هەڵیان وەشاندەوە، جا جوولەکەکان بەمە ئاگریان تێبەربوو، گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ لەلایەکەوە دەڵێیت: من پێغەمبەرم، کەچی لەلایەکی ترەوە دەچی ڕەزو باخ دادەپاچیو دایدەهێنیو داری بەری دەسووتێنی، ئەمە چەنی بە چەندە؟

جا خودای گەورەو مەزن بۆ بەرپەرچی ئەم گومانەو ئەم ڕەخنە درۆیە، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: {مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ – الحشر/٥٩/٥}.

واتە: هەرچی ئێوە بڕیتان لەباخە خورماکانی بەنی نەضیر، یا هێشتتانەوە بەڕاوەستاوی لەسەر ڕەگو ڕیشەکەی خۆی، هەمووی بە فەرمانی خودا بوو، هەتا بێباوەڕانی پێ چاوترسێن بنو ئەو بەدکارو فاسقو لەپەیمان دەرچوانە، ڕەنجەڕۆو ڕیسوا ببن بەفەرمانی خودا).

جا بەم بۆنەیەوە حەسسانی کوڕی ثابیت، کەناودارە بە شاعیری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ (وافر):

وَهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيٍّ

حَرِيقٌ بِالبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ

واتە (دەریای وافیر):

بڵێسەی ئاگرێ لە بووەیرە بەرزە

سەرۆکی قوڕەیشی پێ کەوتۆتە لەرزە!

{تاج/٤، زنجيره: ٤٢، ژماره: ٤١٥٧ + تاج/٤، زنجيره: ٧٥، ژماره: ٤٥٥٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٣٠٣- وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ اَلصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "لَا تَغُلُّوا" فَإِنَّ اَلْغُلُولَ نَارٌ وَعَارٌ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي اَلدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ" } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{السلسلة الصحيحة: ١٩٧٢، المسند/٥/٣١٦ – ٣٢٦. نسائی في الكبرى/٦٥١٥}:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دەستپیس مەبن‌و گزی‌و فزی‌و دزی لەدەسکەوتی جەنگی مەکەن، چونکە دزی‌و گزی لە دەستکەوتی جەنگی، ئاگری سوورو ریسوا بوونە لەهەردوو جیهاندا بۆ خاوەنەکەی).

١٣٠٤- وَعَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَضَى بِالسَّلَبِ لِلْقَاتِلِ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. وَأَصْلُهُ عِنْدَ مُسْلِمٍ.

{صحيح إرواء الغليل/١٢٢٣. مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١١٤١ = شيحا/٤٥٤٣. بخاری. بیوع: ٢١٠٠، ٣١٤٢، ٤٣٢١، ٧١٧٠. ترمذی. سیر: ١٥٦٢}:

ئەمە دەقی وەرگێڕاوی ئەم فەرموودەیە لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا: {بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٨٩ – غەزای حونەین}:

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەساڵی غەزای حونەیندا، کە لەگەڵ حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ ئەم غەزایە، کە ئەم غەزایە لەپێش ئازادکردنی مەککەدا رووی دا، حونەین شیوێکە وا لەنێوانی مەککەو طائیفدا لەپشت عەرەفاتەوە، دەوری دە دوازدە میلێ لە مەککەوە دوورە، کاتێ بەرەنگاری ناموسوڵمانەکان بووین، لەسەرەتاوە

موسـولمانەکان زاڵ بـوونو سـەرێ دووان سـەرکەوتن، پیـاوێکم بینـی لـە بتپەرسـتەکان، پیـاوێکی موسـوڵمانی دابـوو بەزەویـداو لەسـەری دانیـشتبوو، دەیویـست لـە پـەلو پـۆی بخـاتو بیکـوژێ، منـیش سـوورێکم بـۆ خـواردو لەپشتیەوە بۆی چووم‌و شمشێرێکم ماڵی بەسەر نەرەی شانیدا، گەیاندمە سەر جێگـەی کاریگـەری. لەگـەڵ ئەوەیـشا پـەلاماری دامو باوەشـی پیامـاکردو بـە گوشینێکی وا گوشیمی مردنم بەچاوی خۆم دی، بـەڵام ئـیتر کەوتـە گیانـەڵاو تلیسایەوەو منی بەرداو مرد، بەرە بەرە سوپای ئیـسلام شکستیان تـێ کـەوت، منیش رامکرد، لەرێ گەیشتم بە عومەری کوری خەططـاب (رەزای خـودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوە ئەو خەڵکە چییانە بۆ واشکانو شکستیان هێنا؟

گوتم: فەرمانی خودا وابوو، چارەنووسی خودایی رەتبوونـەوەی نییـە! لەپاشدا خەڵکەکە گەرانـەوەو شـێرانەو مەردانـە تـێ هەڵچوونەوەو لـەدەوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) وەك شوورای پـۆلایین، ئاخڵـەیان داو، گـۆی سـەرکەوتنیان لەمەیـدانا، بەهەڵمـەتی پاڵەوانـەیان بـەدوژمن بـەجێ هێـشتو، ئـاڵای هەمیـشە سـەربەرزو شـەکاوەو سـەرکەوتووی موحەممـەدیان، دیـسانەوە لەمەیـدانا شـەکانەوە، جـا لـەپاش سـەرکەوتنی تـەواو، حـەزرەت (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دانیــشتو فــەرمووی: (کەســێ لەغــەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێو بەڵگەی هەبێ لەسەر ئەوە کە ئـەو کوشـتوویەتی، ئـەوە رووتی بکاتەوە بۆ خۆیو کەلوپەلەکەیو تفاقەکەی هی خۆیەتی!).

فــەرمووی: منــیش هەڵــسام گــوتم: کــێ شــایەتیم بــۆ دەدا کــەمن پاڵـەوانێکی واوام کوشـتووە، هـەتا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) تفاقەکەیم پێ بدا! ئەوسا دانیشتمەوە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار ناو بەناو ئەم فەرمایشتەی فەرموو، منیش هەموو جارێ کە ئەو وای دەفەرموو هەڵ دەسامو دەمگوت: کێ شایەتییەکی واوام بۆ دەدا، هەتا لەسەری

جاری سێیەما، کە هەڵسام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە ئەی ئەبو قەتادە چیتە؟).

منیش چیرۆکی کوشتنی پاڵەوانەکەم لەنووکەوە گێڕایەوە بۆی. جا پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو قەتادە راست دەکا، تفاقو کەلوپەلی ئەو کوژراوە وا لەلای من، دەی تۆ بفەرموو کە ئەبو قەتادە لەمن رازی بکە، شتێکی تر وەربگرێ لەجیاتی مافی خۆی. ئەبوبەکری صەدیقیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەبەخودا شتی وا نابێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شتی وا ناکات، کەبچێ پەلاماری دەستکەوتێ شێری لەشێرانی خودا بدات و لەوی بستێنێ و بیدات بەتۆ، ئەمە لەکاتێکدا، کە ئەو شێرە لەپێناوی خوداو پێغەمبەری خودادا جەنگ دەکاو دەست بە قورگی شێردا دەکات!!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەبوبەکر راست دەکاو قسەکەی دروستە، کەوابوو تفاقو کەرەستەو کەلوپەکە گشتی بدە بە ئەبو قەتادە، هی ئەوە هی تۆ نییە).

ئەبو قەتادە فەرمووی: جا کابراکە تفاقەکەی دایەوە بەمن، زریەکەیم فرۆشت و بە پارەکەی لەناوچەی بەنی سەلەمە، باخێکم پێی کڕی، وە ئەو باخە بوو بە بناخەی ماڵداریی کردنی سەردەمی ئیسلامەتیم!). {تاجول ئوصول/٤، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٥١٣}.

(روونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیە، لەشەڕدا موسوڵمانێ، ناموسوڵمانێ بکوژێ، تفاقەکەی کە لەو شەڕەدا پێیەتی، وەك شمشێرو زریەو تیرو کەوانو دەمانچەو تفنگ هی خۆیەتی.

١٣٠٥- وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فِي - قِصَّةِ قَتْلِ أَبِي جَهْلٍ - قَالَ: { فَابْتَدَرَاهُ بِسَيْفَيْهِمَا حَتَّى قَتَلَاهُ، ثُمَّ انْصَرَفَا إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ

عَلَيْهِ وسَلّم) فَأَخْبَرَاهُ، فَقَالَ: "أَيُّكُمَا قَتَلَهُ؟ هَلْ مَسَحْتُمَا سَيْفَيْكُمَا ؟" قَالَا: لَا. قَالَ: فَنَظَرَ فِيهِمَا، فَقَالَ: "كِلَاكُمَا قَتَلَهُ، فَقَضى (صلى الله عليه وصلم) بِسَلَبِهِ لِمُعَاذِ بْنِ عَمْرِو بْنِ اَلْجَمُوحِ" }  مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٦٩ = ٣١٤١، ٣٩٦٤، ٣٩٨٨. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٤٢ = شیحا/٤٥٤٤ = مسلم ترقيم (محمد فؤاد عبدالباقی): ١٧٥٢}:

**ئەمە دەقی وەرگەڕاوی ئەم فەرموودەیە لە موختەصەری صەحیحی موسلیم دا:**

**عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای بەدردا، وا لەڕیزی شەڕکردندا ڕاوەستاوم، کە سەیری ڕاستو چەپی خۆمم کرد، وا دوو کوڕی مێرد منداڵی ئەنصاری وان لە ڕاستو چەپمەوە، لەدڵی خۆم دا گوتم: خۆزگە لەنێوانی دوو پیاوی لەمانە کارامەترو دلێرتردا دەبووم، کە کارامە بوونایەو ئەزموونی جەنگیان هەبوایە.**

**جا یەکێکیان تێوەی ژەندمو گوتی: مامەکە! ئایا ئەبو جەهل دەناسیت؟ گوتم: بەڵێ دەیناسم بۆچیتە؟ ئەی کوڕی برای خۆم! گوتی: بیستوومە کە جنێو بە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەدات، بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەو سەروەرە، ئەگەر بیبینم لە کۆڵی نابمەوە، هەتا یان دەمکوژێ، یان دەیکوژم، دیارە ئەوەمان دەکوژرێ کە زووتر ئاکامی دێت!**

**منیش لەم قسەیە سەرسام بوومو لەلام سەیرو عەنتیکە بوو، ئەوی تریشیان دیسان هەروای گوتو هەمان پرسیارو قسەی کرد.**

**جا ئەوەندەی نەبرد، تەماشام کرد ئەبو جەهل جێ بەخۆی ناگرێ، وەك سەگی هار دێتو دەچێ. جا بەدوو لاوەکەم گوت: وریابن! ئەمە یارۆکەتانە، ئەمە ئەوەیە کە ئێوە بۆی دەگەڕێنو لەبارەیەوە لەمنتان پرسی،**

ئەوە ئەبو جەهلە، ئیتر هەردووکیان بە شمشێری رووتەوە پەلاماری ئەبو جەهلیان دا، وەدایانە بەر شیر، هەتا کوشتیان.

ئەوجا هەردووکیان چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەرو پێیان گوت: ئەبو جەهلمان کوشت. فەرمووی: (کامتان کوشتتان؟ هەردووکیان گوتیان: من کوشتم. فەرمووی: ئایا شمشێرەکانتان سڕیوە؟). گوتیان: نەخەیر، کە تەماشای شمشێرەکانی کردن. فەرمووی: (راست دەکەن، بەهەردووکتان کوشتووتانە!!).

ئەوجا تفاق‌و کەلوپەلە رووتکراوەکەی ئەبو جەهلی دا بە موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح، چونکە ئەو گەیاندبوویە حاڵی گیانەڵا، وە ئەو دوو لاوەیش موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەموح‌و موعازی کوڕی عەفراء بوون).

(روونکردنەوە):

ئاخ هەڵەی چاپ، لە موختەصەری صەحیحی بوخاریدا، دێڕی کۆتایی ئەم فەرمودەیە لەکاتی چاپ کردندا شێواوە، تکایە بەپێی ئێرە ڕاستی بکەنەوە.

١٣٠٦- وَعَنْ مَكْحُولٍ" (رضى الله عنه) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَصَبَ اَلْمَنْجَنِيقَ عَلَى أَهْلِ اَلطَّائِفِ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ فِي "اَلْمَرَاسِيلِ" وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ. وَوَصَلَهُ الْعُقَيْلِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

{المراسيل: ٢٩٩. الضعفاء (١/٢٤٣). ترمذى/٢٧٦٢}:

مەکحول (رەحمەتی خودای لێ بێ) کە تابیعییە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد، لەکاتی گەمارۆدانی خەڵکی تائیفدا، کە نزیکەی مانگێکی خایاند، کە مەنجەنیق دابنێن‌و بیان دەنە بەر گوللەی مەنجەنیق.

(ڕوونکردنەوە):

١- دانەر مامۆستای عەسقەلانی دەڵێ: ئەم فەرموودەیە ئەبو داوود لەپەڕاوی (المراسیل)دا، ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، وەپیاوانی ئەم فەرموودەیە هەموویان جێگەی متمانەی ئەهلی فەرموودەن.

٢- عوقەیلی لەپەڕاوی (الـضُّعَفَاءُ الكبير)دا، ئاوا ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە: عەوامی کوڕی حەوشەب، واتە: ئەبو صادیق، لەعەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەکاتی گەمارۆدانی قەڵای طائیفدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد مەنجەنیقیان دانا، خەڵکی تائیفیان دایە بەر گولوولەی مەنجەنیق. عوقەیلی دەڵێ: فەرموودەیەکی نەزانراوە.

٣- شێخ موحەممەدی خاڵ (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە فەرهەنگی خاڵدا دەفەرموێ: (مەنجەنیق ئامێر (آلة) ێکە، بۆمباو ئاگری پێ فڕێ ئەدرێتە ناو دوژمنەوە، لەفارسییەوە وەرگیراوە (فەرهەنگی خاڵ).

٤- طالیف شارۆچکەیە بووە، دەکەوێتە کەناری شیوێکەوە، دوازدە فەرسەخ لە مەککەوە دوورە، هەوایەکی خۆشی هەیە، لەکوێستان دەکا، لە زستانانا، ئاو لێی دەبەستێ، بەتایبەتی لەچیاکانی.

٥- مەکحوولی کوڕی عەبدوڵڵا، ناسراوە بە ئەبو عەبدوڵڵا، بەڕەگەز هندییە، لەدیلەکانی کابولە، بەندەی سەعیدی کوڕی عاص بوو، بەخشی بەژنێ لەهۆزی هوذەیل، ژنەکە لەمیصر ئازادی کرد، ئەوجا مەکحوول گواستیەوە بۆ دیمەشق، وە لەوێ نیشتەجێ بوو، ئەنەسی کوڕی مالیكو ئیبنو عومەرو واثیلەو ئەبو ئومامەو هاوەڵانی تری دیوەو گێڕانەوەی لەم زاتانەوە هەیە، یەکێ بوو لە شەرعزانەکانی وڵاتی شام، لەدەوروبەری ساڵی (١١٢) سەدو

دوازدەی کۆچی لەشام مردووە. مامۆستای فێرکاری ئەوزاعیو کەسانی تریش بووە، لەبەر ئەوە کە خەڵکی (سند) بوو، لەعەرەبیدا زمانی پاراو نەبوو.

٦- لەکاتی پێویستدا، دروستە بۆ سوپای ئیسلام چەکی قورس بەکاربهێنێ، بۆ پەخشو بەرگریی لەنووری ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

١٣٠٧- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَى رَأْسِهِ اَلْمِغْفَرُ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ اَلْكَعْبَةِ، فَقَالَ: "اُقْتُلُوهُ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٤٧ = بوخاری/١٨٤٦، ٣٠٤٤، ٤٢٨٦، ٥٨٠٨. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٦٨ = شیحا: ٣٢٩٦ = مسلم: ١٣٥٧}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، کاتێ پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار، هاتە ناو شاری مەککەوە، کڵاوزرێیەکی لەسەردا بوو، کە کڵاوزریەکەی داکەند، لەوکاتەدا پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیبنو خەطەل ئەو دوژمنە پیسە، دامێنی کەعبەی گرتووەو پەنای بردۆتە بەر بەیت لەترسانا، جا تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (بیکوژن ئامانی مەدەن). جا نەضلەی کوڕی عوبەید بەهاوکاری سەعیدی کوڕی حورەیث کوشتی، چونکە کاتی خۆی لەئیسلام وەرگەڕابوو، وە موسوڵمانێکی بەناڕەوا کوشتبوو، وە خوسپو هەجوی پێغەمبەریشی دەکرد. {تاج/٢، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ١٧٠٨}.

(ڕوونکردنەوە):

لەڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەنیا ئامانی حەوت کەسی نەدا لەبێباوەڕان، وە فەرمانی دا، ئەگەر ئەم حەوت کەسە پەنا بەرنە بەر کابەو دامێنی کابەش بگرن، ئامانیان مەدەنو

بیانکوژن، ئیبنو خەطەلیان کوژرا، بەڵام ئەو شەشەکەی تریان ئیسلام بوون‌و ڕزگاریان بوو لەکوشتن.

١٣٠٨- وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَتَلَ يَوْمَ بَدْرٍ ثَلَاثَةً صَبْراً } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ فِي "اَلْمَرَاسِيلِ" وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{أبو داود في المراسيل (٢١٤٩/١)}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە تابیعی‌یە، فەرمووی: لەڕۆژی غەزای بەدردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (سێ کەسی بەند کرد بۆ کوشتن‌و لەپاشا کوشتنی). دانەر دەفەرموێ: ئەبو داوود لە (المراسيل)دا گێڕاویەتەوە، پیاوانی ڕشتەکەی متمانەدارن.

١٣٠٩- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَدَى رَجُلَيْنِ مِنْ اَلْمُسْلِمِينَ بِرَجُلٍ مِنْ اَلْمُشْرِكِينَ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ. وَأَصْلُهُ عِنْدَ مُسْلِمٍ.

{صحيح، إرواء الغليل: ١٢١٧. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم بەکوردی/٢، ژمارە: ١٠٠٨ شیحا: ٤٢٢١ = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي: ١٦٤١. ترمذي: ١٥٦٨}:

ئەمە دەقی وەرگەڕاوی ئەم فەرموودەیە، لەپوختەی موسلیم (مختصر صحيح مسلم)دا:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هۆزی ثەقیف، هاوپەیمانی هۆزی عەقیل بوون، هەروا هاوپەیمان بوون لەگەڵ موسوڵمانانندا، جا هۆزی ثەقیف پەیمانەکەیان دەشکێنن‌و دووپیاو لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیل دەکەن، هاوەڵانی پێغەمبەریش پیاوێ لەهۆزی بەنی عەقیل یەخسیر دەکەن، پیاوە دیلەکە وشترێکی پێ دەبێ،

ناوی عەضباء دەبێ، هاوەڵان ئەویش بەتاڵانی دەگرن، لەدواتر ئەم وشترە کەناوی عەضباء بوو، بوو بەهی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

پیاوە دیلەکە بەکۆتو زنجیرەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلایەوە ڕەت بوو، کابرا گوتی: ئەی موحەممەد! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای و فەرمووی پێی: (ها چیتە، چیت دەوێ؟). گوتی: من تاوانم چییە بەچی هەقێ منتان گرتووە، وەبەچی هەقێ ئەو وشترەی منتان بەتاڵانی گرتووە، کە هەمیشە پێشەنگی کاروانی حاجیان بوو؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر ئەوە کە زۆر بەزەحمەتی زانی، کە تۆمەتی بێ پەیمانی لێ بدرێ و گومانی وا خراپی پێ ببرێ، فەرمووی: (تۆ بەتاوانی ئەقیفی هاوپەیمانەکانت گیراویت، کە بەناڕەوا دوو پیاویان لە هاوەڵانی من بەدیل گرتووە!). ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی بڕواو کەمی ڕۆیشت، کابرا بانگی کردەوەو گوتی: ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد!

پێغەمبەریش زۆر بەسۆزو میهرەبانو نەرمو نیان بوو، لەبەر ئەوە گەڕایەوە بۆلای و فەرمووی: (ها خێر، چیت دەوێ؟) گوتی: (من موسوڵمان بوومو ئێستا موسوڵمانم).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم قسەیەت کاتێ سوودی تەواوی دەبوو بۆ تۆ، کەپێش ئەوە یەخسیر بکرێیت، بتگوتبایە، بەڵام ئێستا گەرچی سوودی هەیە بۆت بەڵام ڕزگارت ناکا لەدیلی).

دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی بڕوا، بەڵام کابرا بانگی کردەوەو گوتی: ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆلای و فەرمووی: (چیت دەوێ؟) گوتی: من برسیم نانم پێ بدە، تونیم ئاوم پێ بدە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر

بێ) (ئەمەیان مافی خۆتە) فەرمانی کرد، نانو ئاوی پێ درا، جا ئەم پیاوەیان گۆڕییەوە بەدوو هاوەڵەکەی پێغەمبەر، کەهۆزی ثەقیف دیلیان کردبوون!.

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەضبای گلدایەوە بۆ خۆی، هەتا ڕۆژێ بتپەرستەکان (موشریکەکان: فرە خواکان) هێرشیان هێنایە سەر دەوروبەری شاری مەدینە، ژنێکی ئەنصارییان بەدیل بردو عەضباشیان بەتاڵانی گرتو بردیانن بۆ وڵاتی خۆیانو ژنەکەیان بە کۆتو بەزنجیر بەستەوە، ئەو هۆزە دەستووریان وابوو، ئاژەڵو ماڵاتی خۆیانیان لەبەردەمی ماڵەکانیاندا دەکردە پەچەوەو مۆڵ دەداو وشترەکانی خۆیان بەشەو لەپەچەی بەرماڵەکانیاندا پیخ دەدا. جا شەوێ ژنە دیلەکە خۆی لەکۆتەکەی قوتار کردوو ڕۆیشت بۆ ناو وشترەکان، هەتا سواری وشترێ ببێو خۆی ڕزگار بکا، هەر کە لەوشترێ بۆ ئەم مەبەستە نزیك دەبۆوە، وشترەکە دەیقۆڕاند، ئەویش وازی لێ دەهێنا، هەتا گەیشتە لای عەضباء، لەو نزیك دەبێتەوە، ئەو نابۆڕێنێ. فەرمووی: عەضباء، بەڕاستی وشترە مێچکەیەکی سەر نەرمی هێمن بوو، جا ژنەکە سواری دەبێو لەسەر پاشەڵی دادەنیشێ، ئەوجا دەی لێ دەکاو بەغار دەیبا، دوایی هەستی پێ دەکەنو شوێنی دەکەون، بەڵام نایگرنەوە. فەرمووی: ژنەکە ئاهو نەزر دەکا، بۆ خودای گەورەو سەروەر، ئەگەر لەسەر پشتی عەضباء ڕزگاری بکا، دەیکا بە خێرو سەری دەبڕێو گۆشتەکەی دەبەخشێتەوە. جا خودا ڕزگاری دەکا، کاتێ دەگاتە مەدینە، خەڵکەکە دەیبیننو دەڵێن: ئەمە عەضبایە، ئەمە وشترە مێنگەکەی پێغەمبەرە، ژنەکە دەڵێ: من نەزرم کردووە ئەگەر لەسەر پشتی ئەم وشترە خودا ڕزگارم بکا، سەری ببڕم!!

خەڵکەکە ڕۆیشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە ئەم باسەیان باسکرد بۆی، ئەویش بۆ سەرسامی فەرمووی: (سوبحانەڵڵا!

پاکیو پیرۆزیو بێگەردیی هەر بۆ خودایەو بەس! بەڕاستی پاداشی چاکە بەخراپە ئاوا دەبێ، نەزری کردووە بۆ خودا ئەگەر خودا لەسەر پشتی ئەو وشترە رزگاری بکا سەری ببڕێ!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەزری گوناه دانامەزرێ، شتێکیش کەماڵی کەسێ نەبێ، نەزری دانامەزرێ با نەزریشی بکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٣٢}.

١٣١٠- وَعَنْ صَخْرِ بْنِ اَلْعَيْلَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "إِنَّ اَلْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا " أَحْرَزُوا دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ" } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَرِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ.

{ضعيف أبي داود: ٦٧٠. أبو داود: ٣٠٦٧}:

صەخری کوڕی ئەل‌عەیلە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر کۆمەڵێ، هەرکەسێ، کاتێ موسوڵمان دەبن، ئیتر بەپێی یاسانامەی ئیسلام، سەرو گیانو خوێنو نامووسو ماڵو سامانی خۆیان دەپارێزن، کەس مافی ئەوەی نییە کە زیان لەسەرو ماڵو نامووسیان بدا، مەگەر بەپێی یاسانامەی خودای گەورە).

(ڕوونکردنەوە):

صەخری کوڕی ئەل‌عەیلە، کە ناسراوە بە ئەبو حازم، هاوەڵی پێغەمبەرە.

١٣١١- وَعَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعَمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ فِي أُسَارَى بَدْرٍ: { " لَوْ كَانَ اَلْمُطْعَمُ بْنُ عَدِيٍّ حَيًّا، ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلَاءِ اَلنَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ" } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٣٦ = ٤٠٢٤، ٧٦٥، ٣٠٥٠، ٤٠٢٣، ٤٨٥٤}:

جوبەیری کوڕی موطعیمی کوڕی عەدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی دیلەکانی غەزای بەدرەوە، کە حەفتا جەنگاوەر بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بریا موطعیمی کوڕی عەدی ئێستا زیندوو بوایەو، سەبارەت بەم بۆگەن و گەندەڵانە، تکای لێ بکردمایەو، داوای لێ بکردمایە کە بەخۆڕایی، بەبێ سەرانە لەبەرخاتری ئەو بەریان بدەم، تکاکەیم دەگرت و بەبێ بەرابەر هەر حەفتایانم لەبەر خاتری موطعیم بەردەدا).

(ڕوونکردنەوە):

١- هۆی ئەم فەرموودەیە، ئەمەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستوویەتی چاکەی موطعیمی لەبەرچاوبێ و باسی ئەو مەردایەتی و پیاوەتییەی ئەو بکات، کە لەپاش چوونی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ لای خەڵکی تائیف، کە قەبووڵی ئیسلام بکەن و پەنای پێغەمبەر بدەن، بەڵام بە نائومێدی گەڕایەوەو خەڵکی مەککە ویستیان ئازاری بدەن، موطعیم خۆی و چوار کوڕی پەنای پێغەمبەریان داو گوتیان ئەوەی دەستی بۆ ببات دەستی دەبڕین، وە لەزۆر کاتدا، موطعیم هەڵوێستی لەگەڵ ئیسلامدا باش بوو، موطعیم تەمەنی لەنەوەد تێپەڕی بوو، لەپێش نەبەردی بەدردا مردووە. {بڕوانە: ژیاننامەی جوبەیری کوڕی موطعیم لە ژمارە: (١٧٩)دا، لەپێشەوە ڕابورد}.

١٣١٢- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { أَصَبْنَا سَبَايَا يَوْمَ أَوْطَاسٍ لَهُنَّ أَزْوَاجٌ، فَتَحَرَّجُوا، فَأَنْزَلَ اَللَّهُ تَعَالَى: وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ اَلنِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = شيحا/٣٥٩٣ - ٣٥٩٧ = مسلم ترقيم محمد فؤاد: ١٤٥٦}:

ئەمە وەرگەڕاوی ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا: ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆژی غەزای حونەین، لەشکرێکی نارد بۆ سەر ئەوطاس، جا لەشکرەکە سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو هەندێ ژنی لێ گرتن بەدیل.

جا هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زات ناکەن، کە جووت ببن لەگەڵ ئەو ژنە دیلانەدا، گوایە ژنی مێرددارن‌و مێردی بتپەرستیان هەیە، ژنی مێرداریش بۆ کەسی تر جگە لەمێردەکانیان، دروست نییە کە دروست ببێ لەگەڵیان.

جا خودای گەورە لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی نارد: {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ – النساء – ٤/٢٤}. واتە:

حەرام کراوە لەسەرتان ژنانی مێرددار کە لەپەنای شووی شەرعی‌و ڕەوادا، ناموسی خۆیان دەپارێزن، تەنیا ئەو ژنە خاوەن مێردانەیان لێ دەرچێ کە لەجەنگا داگیریان دەکەن‌و لە کافرانیان دەستێنن. واتە: ئەو جۆرە ژنە دیلانە کەعیددەو حەیەی شەرعییان تەواو بوو، ئیتر دروستە بۆ خاوەنە موسوڵمانەکەی بڕواتە لای). {تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٥١٩، ژمارە: ٢١٤٧، زنجیرە: ٤٥ – د/ت/م}.

١٣١٣– وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { بَعَثَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَرِيَّةٍ وَأَنَا فِيهِمْ، قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً، فَكَانَتْ سُهْمَانُهُمْ اِثْنَيْ عَشَرَ بَعِيراً، وَنُفِّلُوا بَعِيراً بَعِيراً } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٦٦ = ٣١٣٤، ٤٣٣٨. مختصر صحیح مسلم بالکوردی/٣، ژمارە: ١١٣٩ = شیحا/٤٥٣٥ = مسلم ترقیم محمد فؤاد: ١٧٤٩}:

لەپوختەی موسلیم دا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەلێ جەنگاوەری نارد بەرەو نەجد بۆ غەزا، من خۆم لەناویانا بووم لەم غەزایەدا، ڕانە وشترو گەلە ڕانێکی زۆرمان بەتالانی گرت، گشتمان هەر یەکی سەرو دوازدە وشتر پشکمان بەرکەوت، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەریەکی سەرو وشتری بەزیادە بەش پێماندا. {تاج/٤، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٤٩٢، ٤٤٩٣ چاپی چوارەم}.

١٣١٤- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: { قَسَمَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ، وَلِلرَّاجِلِ سَهْمًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٥٧٥ بوخاری/٤٢٢٨ + تەجرید/٣، ژمارە: ١١٨٢ = بوخاری/٢٨٦٣. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٥٠ = شیحا/٤٥٦١ = مسلم/١٧٦٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: لەغەزای خەیبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەسکەوتی جەنگی دابەش کرد بەسەر جەنگاوەرەکاندا، لەسەر ئەم شێوەیە: دوو پشکی دانا بۆ ماین، یا بۆ ئەسپ، وە یەك پشکی دانا بۆ سوارەکەی. واتە: سێ پشکی دانا بۆ سواری ماین‌و ئەسپ، پشکێ بۆ خۆی‌و دوو پشك بۆ ماینەکەی! بەڵام بۆ پیاوی پیادە یەك پشکی دانا). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٤٩٣، ٤٤٩٤، ج/٤}.

١٣١٥- وَلِأَبِي دَاوُدَ: { أَسْهَمَ لِرَجُلٍ وَلِفَرَسِهِ ثَلَاثَةَ أَسْهُمٍ: سَهْمَيْنِ لِفَرَسِهِ، وَسَهْماً لَهُ }.

{صحيح أبي داود: ٢٣٧٣}:

ئەبو داوود (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ دەسکەوتی جەنگیی دابەش دەکرد، بەم شێوەیە دابەشی دەکرد:

بۆ سوارو ئەسپەکەی سێ پشکی دادەنا ئاوا: دووپشك بۆ وڵاخەکەی ژێری‌و پشکێ بۆ خۆی).

١٣١٦- وَعَنْ مَعْنِ بْنِ يَزِيدَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { سَمِعْتَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: "لَا نَفْلَ إِلَّا بَعْدَ اَلْخُمُسِ" } رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلطَّحَاوِيُّ.

{صحيح الجَامِعِ: ٧٥٥٢}:

مەعنی کوڕی یەزید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (زیادە بەش بەکەس نادرێ، مەگەر لەپاش جیاکردنەوەی پشکی پێنج یەك، کە ناسراوە بە خومس).

(ڕوونکردنەوە):

١- پێنج یەك ئەوەیە کە لەو تاڵانییەی جەنگاوەرەکان بەشەڕ وەری دەگرن لە ناموسوڵمانەکان، پێنج یەکی لێ جیادەکرێتەوەو دەدرێ بە سەرۆکی موسوڵمانان، ئەویش بەپێی ئایەتی: {وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ – الأنفال/٤١} دابەشی دەکا بەسەر پێنج تاقمەکەدا.

٢- مەعنی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەخنەس، خۆی‌و یەزیدی باوکی‌و ئەخنەسی باپیری، هەرسێکیان هاوڕێی پێغەمبەر بوون (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یەزیدو لە باوکی‌و لە باپیرەی بێ).

مەعن خۆی‌و باوکی‌و باپیرەی، لەخزمەتی پێغەمبەردا، ئامادەی نەبەردی بەدر بوون، واتە: هەرسێکیان بەدرین، وەنەبیستراوە کە کەسێکی تر هەبێ: کە خۆی‌و باوکی‌و باپیرەی بەدری بن. یەزید دەفەرموێ: کاتێ ئیسلام بووم، هەموو کەسوکارەکەم لەگەڵما موسوڵمان بوون، تەنیا ژنێ نەبێ، جا بەم

بۆنەیەوە خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتە پیرۆزەی نارده خوارەوە بۆ پێغەمبەر: {وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ – الممتحنة/١٠}.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە بەڵێنی پێم داوە، کە حەفتا هەزار کەس لەنەتەوەی موسوڵمانی من، بەبێ لێپرسینەوە بباتە بەهەشت!).

یەزیدی کوڕی ئەخنەسیش (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: (سوێندم بەخودا، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم نەتەوەی ئیسلامەی کە پەیڕەوی تۆ دەکەن، ئەوەندە زۆرو گەورەو بێ شومار دەبن، ئەم ئەندازەیە کە حەفتا هەزارە، لەچاو سەرجەمی نەتەوەی ئیسلامدا، وەك مێش و گامێش وایە!!).

مەعن ئامادەی رزگاریکردنی شاری دیمەشق بوو، وە لەوێ خانوویەکی هەبوو، لەگەڵ معاویە بوو، لەهەرای صەفیندا.

١٣١٧– وَعَنْ حَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { شَهِدْتُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) نَفَّلَ اَلرُّبْعَ فِي اَلْبَدْأَةِ، وَالثُّلُثَ فِي اَلرَّجْعَةِ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ اَلْجَارُودِ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{صحيح أبي داود: ٣٣٨٩. الصحيح المسنَدُ: ٣٩٠}:

حەبیبی کوڕی مەسلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، بەم شێوەیە زیادە پشکی دەدا بە جەنگاوەرەکان:

یەکەم: ئەو کۆمەڵە جەنگاوەرانەی کە لەسەرەتای شەڕەوە هەڵمەتیان بېردایەو دەستکەوتێکیان ببوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چواریەکی ئەو دەستکەوتەی ئەوانی بەزیادە بەش، دابەش دەکرد بەسەر خودی ئەو لقە جەنگاوەرانەدا کە لەسەرەتاوە هەڵمەتیان بردووە. وە سێ

سێیەکەکەی تری ئەو دەستکەوتەی ئەوانی دابەش دەکرد بەسەر سەرجەمی سوپاکەدا بەگشتی.

دووەم: بەڵام ئەگەر لەکاتی گەڕانەوەی سوپاکەدا بۆ ڕێگەو جێگەی خۆی، پەلێ جەنگاوەر هەڵمەتیان ببردایە بۆسەر دوژمن‌و دەستکەتێکیان ببوایە، ئەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێیەکی ئەو دەستکەوتەی ئەوانی، بەزیادە بەش، دابەش دەکرد بەسەر خودی ئەو پەلە جەنگاوەرانەدا، کە لەکاتی گەڕانەوەی سوپاکەدا، ئەو هەڵمەتەیان بردووە، وە دوو سێیەکەکەی تری ئەو دەستکەوتەی ئەوانی دابەش دەکرد بەسەر سەرجەمی سوپاکەدا بەگشتی). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٤٩٨}.

(ڕوونکردنەوە):

حەبیبی کوڕی مەسلەمەی کوڕی مالیکی قورەیشی، کەسناوی ئەبو عەبدوڕەحمان بوو، هاوەڵێکی نازداری پێغەمبەرە، ناسراو بوو بە (حبیب الروم = حەبیبی ڕۆمی) چونکە ئەوەندەی غەزا لەدژیان کردبوو، پێشەوا عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) کردی بە فەرمانڕەوای سەر وڵاتی جەزیرە، لەپاشا ئەرمەنستان‌و ئازەربیجانیشی خستە پاڵ، لەپاشا لایبرد، حەبیب زۆر زوو نزاو پاڕانەوەی گیرا دەبوو، ناسرابوو بە (نزا گیرا). هەتا مرد لەگەڵ موعاویە بوو، لەساڵی (٤٢) چل‌و دووی کۆچیدا، لە ئەمینیەیە، یا لە دیمەشق مردووە. دەڵێن: کاتێ مەرگ بوو بەمیوانی تەمەنی لە پەنجا ساڵ کەمتر بووە.

١٣١٨- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنْ اَلسَّرَايَا لِأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً، سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ اَلْجَيْشِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بخاری. فرض الخمس/٣١٣٥. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٤٠. أبو داود. جهاد: ٢٧٤٦}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زیادە بەشی تایبەتی دەدا بەهەندێ لەو پەلو لقە جەنگاوەرانەی کە دەیناردن بۆ خەباتو جەنگو غەزا، سەرەڕای ئەو بەشەیش کە دەیدا بەگشت کەسێ لە سوپاکە، دیارە کە پێنج یەك لەهەموو تالانیو دەستکەوتەکە، لەپێش دابەشکردنیدا، پێویستە کە دەربکرێ تەنانەت پێنج یەك لەم زیادە بەشانەیش، لەپێش دابەشکردنیدا دەبێ دەربکرێ).
{تاج/٤، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٤٤٩٧}.

(ڕوونکردنەوە):

بۆ ڕوونکردنەوەی باسی خومسن (پێنج یەك) بڕوانە:

١- تاج/٤، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٤٩٩ هەتا ژمارە: ٤٥٠٣ + تاج/٤، لاپەڕە: ٢٣٧، زنجیرە: ٩ سوورەتی ئەنفال.

٢- تەجریدی بوخاری بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٣٧٩، زنجیرە: ٦١ باسەکانی پێنج یەك لە ژمارە: ١٢٥٨وە هەتا ژمارە: ١٢٧٥.

١٣١٩- وَعَنْهُ قَالَ : {كُنَّا نُصِيبُ فِي مَغَازِينَا اَلْعَسَلَ وَالْعِنَبَ ، فَنَأْكُلُهُ وَلَا نَرْفَعُهُ } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَلِأَبِي دَاوُدَ: { فَلَمْ يُؤْخَذْ مِنْهُمْ اَلْخُمُسُ }. وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٧٥ = ٣١٥٤ بوخاری. صحيح أبي داود: ٢٣٥٠}:

دیسان ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: جاران لە غەزادا، هەنگوینو ترێو میوەو شتی وامان دەست دەکەوت، بۆ خۆمان دەمانخواردو نەمان دەبردە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەتا بیخاتە سەر تالانییەکەو دوایی دابەشی بکا بەسەر پێشییاوانی دا). {تاج/٨، لاپەڕە: ١٧٨، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٢ چاپی یەکەم =

تـاج/٤، زنجـيره: ٧٣، ژمـاره: ٤٥٤٧ + ژمـاره: ٤٥٤٨، ٤٥٤٩}. لەگێڕانـەوەی ئـەبو داووددا: پێنـج یەكیان لێ وەرنەدەگرتن.

١٣٢٠- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا) قَـالَ: { أَصَـبْنَا طَعَاماً يَوْمَ خَيْبَرَ، فَكَانَ اَلرَّجُلُ يَجِيءُ، فَيَأْخُذُ مِنْهُ مِقْدَارَ مَـا يَكْفِيـهِ، ثُـمَّ يَنْـصَرِفُ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ اَلْجَارُودِ، وَالْحَاكِمُ.

{أبو داود/ ٢٧٠٤. ابن الجارود/١٠٧٢. الحاكم/٢/١٣٧}:

عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خودای لێ بـێ) فـەرمووی: لـەڕۆژی غەزای خەیبەردا، خواردەمەنیمان دەست كـەوت، پیـاو دەهـات ئەوەنـدەی لێـی دەبرد، كە بەشی بكا، ئیتر دەڕۆیشت.

١٣٢١- وَعَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ اَلْـآخِرِ فَلَـا يَرْكَـبُ دَابَّـةً مِـنْ فَـيْءِ اَلْمُسْلِمِينَ، حَتَّى إِذَا أَعْجَفَهَا رَدَّهَا فِيهِ، وَلَا يَلْبَسُ ثَوْباً مِنْ فَـيْءِ اَلْمُـسْلِمِينَ حَتَّـى إِذَا أَخْلَقَهُ رَدَّهُ فِيهِ" } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالدَّارِمِيُّ، وَرِجَالُهُ لَا بَأْسَ بِهِمْ.

{أبو داود/٢٧٠٨. دارمی/٢٤٨٨. أحمد/٤/١٠٨. ابن حبان/٤٨٥٠. حَـسَنٌ، صحيح الجامع/٦٥٠٧}:

ڕووەیفیعـی كـوڕی ثابیـت (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ باوەڕی تەواوی بە خوداو بە پێغەمبەرو بەڕۆژی دوایی هەیە، با ئەم كارە حەرامانە ئەنجام نەدا:

یەكەم: نابێ لەتالانی، ولاخێ بەرێ، سواری پێ بكـا، یـان ئـیش‌و كـاری تری پێ بكا، وەك جووت‌و باركێشان‌و شـتی تـری وا، هـەتا لـەڕو لاوازی دەكـا، ئەوسا بیباتەوە بۆ سەر خەرمانی دەستكەوتی تالانییەكە، شتی وا نادروستە.

دووەم: وەنابـێ جل‌و كەل‌وپـەل‌و بـەرگ‌و شـتی وا ببـاو لەبـەری بكـاو بەكاری بهێنێ، هەتا كۆنی دەكا، ئەوسا بیباتەوە بۆ سەر خەرمانی تالانییەكە، كاری وا نادروستە.

(روونكردنەوە):

١- رووەيفيعى كوڕى ثابيتى كوڕى سەكەنى ئەنصارى، بەميصرى دائەنرێ، موعاوييە كردى بە فەرمانڕەوا لەسەر شارى طەرابولس، ساڵى (٤٧) چل‌و حەوتى كۆچى لەوێوە، رووەيفيع ئەفريقاى غەزا كرد. دەڵێن: لەشام مردووە، هەندێ دەڵێن: لە (بەرقە) مردووەو گۆڕەكەى وا لەوێ.

٢- بەپێوەرى ئەم فەرموودەيە، هەموو ناخونەك‌و گزى‌و فزى‌و دەست پيسيەك لەدارايى‌و سامانى ميرى نادروستە، مەگەر بەشێوەى فەرمى، مۆڵەت درابێ بەكەسى پەيوەندى‌دار كە سوود لەو شتە وەربگرێ، وەك كارمەندێ، دەوڵەت ماشێنێكى بۆ تەرخان كردبێ، كە هاموشۆى فەرمانگەى پێ بكا، وە هەروەها.

١٣٢٢- وَعَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ اَلْجَرَّاحِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { " يُجِيرُ عَلَى اَلْمُسْلِمِينَ بَعْضُهُمْ" } أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَأَحْمَدُ، وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ.

{مَجْمَعُ الزَّوَائِد: ٩٦٨٤. أحمد ١/١٩٥}:

ئەبو عوبەيدەى كوڕى ئەل - جەرراح (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: گوێم لە پێغەمبەر بوو (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەيفەرموو (هەموو موسوڵمانێ بۆى هەيە كە پەناى كەسێ بدا، هەركاتێ هەر موسوڵمانێ پەناو ئامانى دا بەكەسێ، ئيتر پێويستە لەسەر هەموو موسوڵمانێكى تر كەرێزى ئەو پەنادان‌و ئامان دانە بگرێ). {بڕوانە: تاج/٤، زنجيرە: ٧٧، ژمارە: ٤٥٥٧، ٤٥٥٨، ٤٥٥٩، لاپەڕە: ٧٧٧ چاپى چوارەم}.

١٣٢٣- وَلِلطَّيَالِسِيِّ: مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: { " يُجِيرُ عَلَى اَلْمُسْلِمِينَ أَدْنَاهُمْ" }.

{حسن، المشكاة: ٣٤٩٦}:

پێشەوا طەیالیسی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، کە عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خوارترینی موسوڵمانان بۆی هەیە کە پەنای بێباوەڕ بداو هەر موسوڵمانێ ئامانی بەخشی بەهەر ناموسوڵمانێ، پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە ڕێزی ئەو پەنادانو ئەماندانە بگرێت).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو عوبەیدە (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی تەواوی عامیری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی جەرراحە، هاوەڵێکی ناسراوو ناوداری پێغەمبەری خۆشەویستو نازدارە، ئەبو عوبەیدەو عوثمانی کوڕی مەظعوونو عوبەیدەی کوڕی حاریثو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدول ئەسەد، لەیەك کاتدا موسوڵمان بوون، لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)ماڵی ئەرقەم بکا بە بارەگای نهێنی کۆمەڵەی موسوڵمانان.

دایکی ئەبو عوبەیدە، ناوی ئومەیمەی کچی غەنەمە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئەبو عوبەیدە دوو کۆچی کردووە، کۆچێ بۆ وڵاتی حەبەشەو کۆچێ بۆ مەدینە، ئامادەی شەڕگەی بەدرو شەڕگاکانی تری پاشی بەدر بووە، لەغەزای ئوحوددا دوو ئەڵقەی کڵاو زریەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەقیبوونە ڕوومەتی پێغەمبەر، ئەبو عوبەیدە بەددان دەریانی هێنا، بەهۆی ئەوەوە دوو ددانی پێشینەی کەوتنو بۆی بوون بەهۆی جوانیو ڕەزا شیرینی!! {مختصر صحيح مسلم ژمارە: ١١٦١، بەرگی/٣}.

زۆرینەی وڵاتی شام لەسەر دەستی ئەبو عوبەیدەدا ئازادکرا، فەرموودەی زۆری هەبوو، باڵا بەرز بوو، ماڵو سامانێکی وەهای نەبوو، گوزەرانی زۆر سادەو ئاسایی بوو، کاتێ ئەبو عوبەیدە فەرمانڕەوای سەر وڵاتی شام بوو، عومەریش جێنشینی موسوڵمانان بوو، پێی فەرموو: ئەی ئەبو عوبەیدە! ماڵەکەت زۆر پەڕپووتە، دەبوو هەندێ ماڵو داراییت ببوایە!!

ئـەبو عوبەيـدە (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) لـەوەڵاما بـە پێـشەوا عومـەرى فـەرمووى: (ئـەى فـەرمانڕەواى موسـوڵمانان! ئەمـەى هەمانـە، دەمانگەيەنێتـە هەوار).

يـەكێ لـە دروشمـەكانى ئـەبو عوبەيـدە، ئـەم گوتەيـە بـوو: (خراپـەى دێرين، بەچاكەى شيرين بسڕنەوە!).

لـە تاعوونەكـەى عاموسـدا، بـەتاعوون شـەهيد بـوو لەشـام، لەگونـدێ كەناوى عامواس بوو، لەبەينى ڕەملەو بەيتولمەقديسدا بوو، لەسـاڵى هـەژدەى كۆچيدا بوو، لەتەمـەنى پـەنجاو هەشت سـاڵيدا، يەكێكە لـە دە كەسـە مـوژدە پێدراوەكان، كـە پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) مـوژدەى بەهەشـتى پێيـان داوە كـە ناسـراون بـە عەشـەرەى موبەشـەرە، نازنـاوى لـەناو هـاوەڵانى پێغەمبەردا: (ئەميندارى پێغەمبەر) بوو. {بڕوانە: مختـصر صـحيح مـسلم/٤، لاپـەڕە: ٣٥٢، چـاپى يەكـەم، ژمـارە: ١٦٥١ چ/١ + بڕوانــە: تـاج/٣، زنجـيرە: ٥٣، ژمارە: ٢٩٤٨، ٢٩٤٥، ٢٩٤٦، ٢٩٤٧}.

١٣٢٤- وَفِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" : عَنْ عَلِيّ (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْـهُ قَـالَ): { "ذِمَّـةُ اَلْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ" }. زَادَ اِبْنُ مَاجَه مِـنْ وَجْـهٍ آخَـرَ: { " يُجِـيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ" }.

{تجريـد/٤، رقـم: ١٣٩٥ = ٣٥٠٨، ٦٠٤٥ + تجريـد/٢، رقـم: ٨٥٦ = ١٨٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٧٣٠٠. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمـارە: ٧٧٧ = شيحا/٣٣١٤ = مسلم/١٣٧٠}:

دەقــى وەرگــەڕاوى بــەكوردى ئــەم فەرموودەيــە، لــە موختەصــەرى صەحيحى موسليمدا {بەرگى/٢، لاپەڕە: ٢٧٨ چ/١، ژمارە: ٧٧٧} ئاوايە:

ئيبراهيمـى تــەميمى (ڕەحمــەتى خـوداى لێ بــێ) فــەرمووى: بــاوكم فەرمووى: عەلى كـوڕى ئـەبو طاليـب (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) ڕۆژێ وتـارێكى دا بۆمـان، فـەرمووى: (هەركەسـێ گومـانى وابـێ، كـە ئێمـە كـە كـەسو كـارى

پێغەمبەرین، نامەو نووسراوێکی تایبەتیمان لەلا هەیە، کەبەس خۆمان دەیخوێنین‌و لەلای خەڵکی تر نییە، هەرکەسێ گومانی وای هەبێ، ئەوە بێگومان کە درۆ دەکا، ئێمەیش کە ئاڵ‌و بەیتی پێغەمبەرین، وەك سەرجەمی موسوڵمانانی تر بەگشتی، هەر قورئانی پیرۆزمان لەلا هەیەو بەس، کە نامەو نوسراوی خودایە، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەیش وەك موسوڵمانانی تر، هەندێ فەرموودەمان لەلا هەیە، بەڵام بڕیارەکەی بۆ هەموانە، نەوەك هەر بۆ خۆمان‌و بەس. وەك ئەم چەند فەرموودەیە، کە لەناو ئەم تۆمارەدا نووسیومنەتەوە (فەرمووی: تۆمارێکی پێچراوەبوو، لەناو هەبگەی شمشێرەکەیدا دانابوو بۆ پاراستن، نەبادا کەبفەوتێ).

ئەوجا عەلی فەرمووی: ئەمانە لەم تۆمارەدا نووسراون: تەمەنی ئەو وشترانەی کە دەدرێن بەخوێندا، کاتێ کەسێ دەکوژرێ، چەند شتێ تر سەبارەت بەچۆنێتی‌و چەندێتی خوێنی زام‌و زامکاری (الجراحات). وە ئەمەیشی واتیادا: (مەدینە لەنێوانی چیای عەیرەوە هەتا چیای ثەور بەستە).

(بەست واتە: حەرەمە، بەفەرمانی شەرع کۆمەڵێ کاری تیا نادروسمتە، کە لەشوێنانی تر، بەپێی مەرجی دیاریکراو دروستن). جا هەرکەسێ، کارێکی ناڕەوای تیادا بەرپابکا، یا پیاو خراپێکی تیادا پەنابدا، یا کارێکی ناشایستەی تازە قەڵڵای تیادا بکا بە باو، لەعنەت‌و نەفرەتی خوداو نەفرەت‌و لەعنەتی هەموو فریشتەکان‌و لەعنەت‌و نەفرینی هەموو مرۆڤەکانی لێ بێ، لەڕۆژی قیامەتدا خودا نەفەرزو نە سوننەتی لێ قەبووڵ ناکا. لە ئەستۆگرتنی پەیمان بۆ موسوڵمانان وەك یەکە، هەموو موسوڵمانێ مافی ئەوەی هەیە کە پەیمانی ئەمان‌و پەنادان، بە کافران‌و بە بێباوەڕان، بەپێی یاسانامەی خودا بدات، هەرە خوارینەکەیان مافی پەنادان‌و ئەمان پێدانی هەیە، بەهەر بێ باوەڕێ

که بیەوێ ئامانی پێ بداو پەنای بدا ئەوەی بۆهەیە. وە هەرکەسێ حاشا لەباوکی خۆی بکاو خۆی بکا بە نەتەوەی پیاوێکی تر، یا حاشابکا لە ئازادکەرانی خۆی‌و کەسانی تر بکا بە ئاغای ئازادکاری خۆی، لەعنەت‌و نەفرینی خوداو فریشتەکان‌و هەموو مرۆڤەکان لەو جۆرە کەسانە بێ، لە قیامەتدا نە تەوبەیان لێ قەبووڵ دەکرێ، نە تۆڵەو بریتی‌و کەفارەتیان لێ وەردەگیرێ!). {تاج/١، زنجیره: ١٦، ژماره: ١١٧ + تاج/٢، زنجیره: ١٣٩، ژماره: ١٧٣٣ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو ماجە لەڕێگەی کەسێکی ترەوە جگە لە ئیمام عەلی، ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

لە (صحیح الجامع الصَّغیر وَزِیاداتِهِ) کە دانراوی شێخ محمد ناصرالدین الألبانی‌یە، ئەم فەرموودە ئاوا راگوێز دەکا:

فەرموودەیەکی حەسەنە، ئەبو داوودو ئیبنو ماجە، دەگێڕنەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمانان لەناو خۆیانا، کەسیان لەکەسیان زیاتر نییەو خوێن‌و سەرو گیانیان هاوتای یەکترین، لەهەمان کاتدا هەرە خوارینەکەیان مافی ئەوەی هەیە کە ئامان‌و پەیمانی پەنادان بدا بە هەرکەسێ کە خۆی ئارەزووی هەبێ، کە مافی پەنادان‌و ئامانی پێ بدات، هەروا دوورترین کەسیان لە وڵاتی بێباوەڕانەوە، ئەگەر پەیمانی ئامانی دا بە بێباوەڕێ، دەبێ هەموو موسوڵمانێ رێزی ئەو ئامانەی بگرێ‌و ئەو پەیمانەی هەڵ نەوەشێنێتەوە. هەروا دەبێ موسوڵمانان لەناو خۆیانا یەك دڵ‌و یەك دەست بن‌و دەشێ پشتی یەکتری بگرن‌و کۆمەکی یەکتری بکەن‌و لەدژی ئەوانەی کە لەدژیانن‌و لە ملەتی خۆیان نین یەك بگرن!).

ئەمەیش دەقی ئەو بەشەیە، کە لەم فەرموودەیە کراوە بەکوردی:

(المسلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ وَيُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ). {صحيح الجامع الصغير وزياداته/ الألباني/ رقم: ٦٧١٢}.

١٣٢٥- وَفِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" مِنْ حَدِيثِ أُمِّ هَانِئٍ: { قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ"}.

{صحيح البخاري/٣١٧١. صحيح مسلم/٣٦٦ = ترقيم شيحا/١٦٦٥}:

ئەم فەرموودەیە لە (التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول)دا ئاوايە:

ئوم هانيئى كچى ئەبو طاليب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی ئازادكردنی مەككەدا، عەرزی پێغەمبەرم كرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی برام، كە برای دايكیو باوكيمە، دەيەوێ ئەو پياوە بكوژێ، منيش پەنای ئەوم داوە، پياوەكە جەعدەی كوڕی هوبەيرەيە، كە هەنەزای منە، پێغەمبەريش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی دايكی هانی! پەنای ئەو كەسەمان دا، كەتۆ پەنايت داوە). (ب/د/ت) گفتە (لفظ)ی تەرمەزی ئاوايە:

دوو پياوی خزمی شووەكەم پەنايان هێناوە بۆمن، منيش پەنايانم داوەو ئامانم داوە پێيان، پێغەمبەريش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی كەتۆ پەناو ئامانی پێ بدەی، ئەی دايكی هانی! ئێمەيش ئامانی پێ دەدەين!). {تاج/٤، زنجيرە: ٧٧، ژمارە: ٤٥٥٧ ج/٤. بڕوانە: رياض/٣، لاپەڕە: ١١٧، زنجيرە: ٢٠٦ و ٢٠٧ لە ژمارە: ١١٣٩وە هەتا ژمارە: ١١٤٣، تاج/١، ژمارە: ٩٥٦}.

(ڕوونكردنەوە):

ئوم هانی چلو شەش فەرموودەی هەيە، دەڵێن: ئەم لەدوا ئيمامی عەلی مردووە، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، خوشكی هەقی باوكیو دايكی عەلیو عەقيلو جەعفەرو طاليبی كوڕانی ئەبو طاليبە، خۆی ناوی فاختيەيە، دايكيان ناوی فاطيمەی كچی ئەسەدە. ئوم هانی ژنی هوبەيرە بوو، لە

هوبـەیرە ئـەم منالآنـەی بـووە: عـەمرو هـانیو یوسـفو جەعـدە. ئـوم هـانی فەرمموودەی لەشەش پەڕاوەکەدا هەیـە: کـە بوخـاریو موسـلیمو ئـەبو داوودو تەرمــەزیو نەســائیو ئیبنــو ماجەیــە فــەرموودەکانی ئــەو ئــەم زاتانــە دەیگێڕنەوە: جەعدەی کوڕیو یـەحیای کـوڕی جەعـدەی کـوڕیو کوڕەزایـەکی تری کەناوی هاروون بووەو ئیبنو عەبباس کە ئامۆزای بووە، ئـوم هـانی سـاڵی ئازادکردنی مەککە ئیسلام بووە. {مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ١٥٧}.

١٣٢٦- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {" لَأُخْرِجَنَّ اَلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ اَلْعَـرَبِ، حَتَّـى لَـا أَدَعَ إِلَّـا مُسْلِماً"}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختـــصر صـــحیح مـــسلم/٣، ژمـــارە: ١١٥٣ب = ٤٥٦٩ شـــیحا = مسلم/١٧٦٧}:

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بـەگوێی خـۆم لــەدەمی پێغەمبــەرم بیــست دەیفــەرموو (دروودی خــودای لەســەر بــێ): (جوولەکەو گاور لەدورگەی عەرەب دەردەکەمو موسـوڵمان نـەبێ کەسـی تـری تیادا ناهێڵم). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٣٥٦٥ چ/٤}.

١٣٢٧- وَعَنْهُ (رضى الله عنه) قَالَ: {كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي اَلنَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اَللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ، مِمَّا لَمْ يُوجِفْ عَلَيْهِ اَلْمُسْلِمُونَ بِخَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ، فَكَانَتْ لِلنَّبِيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) خَاصَّةً، فَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَةٍ، وَمَا بَقِيَ يَجْعَلُهُ فِي اَلْكُـرَاعِ وَالسِّلَاحِ، عُدَّةً فِي سَبِيلِ اَللَّهِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریـــدی بوخـــاری/٣، ژمـــارە: ١١٩٥ = ٢٩٠٤، ٣٠٩٤، ٤٠٣٣، ٤٨٨٥، ٥٣٥٧، ٥٣٥٨، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥. صحیح مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا/ ٤٥٥٠ = مسلم (محمد فؤاد): ١٧٥٧}:

عومـەری کـوڕی خـەتتاب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ئـەو مـاڵو تالآنییـە، کـە لـەماڵی هـۆزی بـەنی نـەضیری جوولەکـە دەسـتی پێغەمبـەر

(دروودی خودای لەسەر بێ) کەوت، خودا خۆی دەستی پێغەمبەری خستبوو، موسوڵمانان بەتاودانی ماینو ئەسپو بە غاردانی وشترو، بە جەنگ پەیدایان نەکردبوو، بەڵکوو ئەو ماڵو تالانییە بەر بڕیاری ئەم ئایەتە دەکەوێ، کە دەفەرموێ: {وَمَا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ – الحشر/٥٩/٦}:

ئەوەی کەخودا دەستی پێغەمبەری خۆی خست، لەماڵی مفتی بێ ئارەقی هۆزی بەنی نەضیر، ئێوە – ئەی لەشکری ئیسلام! – بۆ بەدەستهێنانی ئەو ماڵو سامانە، هیچ ئەسپو وشترێکتان تاونەدا بوو، بەڵکوو خودای گەورە بە بەخششی خۆی رەخساندبووی بۆی).

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جا لەبەرئەوە ئەو ماڵو سامانە، بەتایبەتی بوو بوو بەهی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئازووقەو مەصرەفو خەرجی ساڵێکی خێزانو کەسو کاری خۆی لێ دادەناو، هەرچی لەوە دەمایەوە، دایدەنا بۆ ئیشو کارو پێویستی موسوڵمانانو خەرجی دەکرد بۆ ئامادەکردنی جەنگو تفاقی جەنگو ولاخ، لەڕێگەی خودادا، وە دەیکرد بەکەرەستەی جەنگ). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ٤١٥٨. چاپی چوارەم – سورەتی حەشر}.

١٣٢٨– وَعَنْ مُعَاذٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) خَيْبَرَ، فَأَصَبْنَا فِيهَا غَنَمًا ، فَقَسَمَ فِينَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) طَائِفَةً، وَجَعَلَ بَقِيَّتَهَا فِي اَلْمَغْنَمِ" } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَرِجَالُهُ لَا بَأْسَ بِهِمْ. {حسن، صحيح أبي داود: ٢٣٥٥}:

موعازی کوڕی جەبەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا، قەڵای خەیبەرمان بەجەنگ ئازادکرد، رانی بزنو مەڕمان بەتالانی گرت، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو تالانییە، هەندێکی، لەجیاتی زیادە بەش، بەسەرمانا دابەش کرد، ئەوی تریشی خستە

سەر خەرمانی دەستکەوتی ئەو جەنگەو ئەوجا بەپێی یاسای دابەشکردنی تالآنیو دەستکەوتی جەنگی دابەشی کرد).

١٣٢٩- وَعَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "إِنِّي لَا أَخِيسُ بِالْعَهْدِ، وَلَا أَحْبِسُ اَلرُّسُلَ " } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٢٥١٠. الصحيح المُسنَدُ: ١٢٢٢. أبو داود/٢٧٥٨. نسائي في الكبرى/٨٦٧٤. ابن حبان: ٤٨٧٧}:

ئەبو رافیعی مەولای پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەئەبو رافیع بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (من پەیمان ناشکێنمو پەیمانی خۆم دەبەمە سەر، وە هەروەها نوێنەریش بەندی ناکەم). {تاج/٤، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٤٥٦٠}.

١٣٣٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "أَيُّمَا قَرْيَةٍ أَتَيْتُمُوهَا، فَأَقَمْتُمْ فِيهَا، فَسَهْمُكُمْ فِيهَا، وَأَيُّمَا قَرْيَةٍ عَصَتْ اَللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنْ خُمُسَهَا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ ، ثُمَّ هِيَ لَكُمْ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٤٦ = ٤٥٤٩ شيحا = ١٧٥٦ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو دێهاتو گوندانەی کە بەپێی رێکەوتننامە دەچنە ناویانو تیایانا جێنشین دەبن، ئەوە بەشو مووچەو پشکی ئێوە لەرێگەی بەیتولمالەوە دەستتان دەکەوێو پێشەوا بۆتان دیاری دەکا، بەلآم هەر گوندێ لەخوداو پێغەمبەری خودا یاخی ببێو لەدژی موسوڵمانان بجەنگێو موسوڵمانان بەهێزی بازوو زاڵ ببن بەسەریانا، ئەوە چی دارایی‌و سامانیان هەیە دەبێ بەتالآنیو دەسکەوتی جەنگی بۆ موسوڵمانان، پاش ئەوە لەو دەستکەوتە پێنج یەك جیادەکرێتەوە بۆ بەیتولمال، چوار یەکەکەی تری دابەش دەکرێ بەسەر جەنگاوەرەکانا) .

(ڕوونكردنەوە):

١- غـەزاو تێكۆشـانو خـەباتگێڕان، بـەپێی مـەرجی تایبـەت، فـەرزو پێویستە لەسەر پیاوان، بەمەرجی توانین.

٢- خـەباتو غـەزا لەسـەر ژنـان نییـە، بـەڵام ئەگـەر هاوبەشـیش بكـەن جێگەی خۆیەتی، غەزای ژنان حەجو عەمرەیە.

٣- خزمـەتی دایـكو بـاوك، بەتایبـەتی لـەكاتی پێویـستدا گـەورەترین خەباتو غەزایە.

٤- خاوەنی مەهانەی ڕەوا نەشچێ بۆ غەزا قەیناكا.

٥- غەزا بەمەرجێ لەلای خودا وەرگیراوە كەساخ لەبـەر ڕەزای خودابـێو بەس.

٦- جاروبار، لەناكاو، لەپڕ بەبێ ئاگاداركردنـەوە، دروسـتە كـە پـەلاماری دوژمن بدرێو چاو ترسێن بكرێ.

٧- سەرچاوەی تەزبیحو دروستبوونی ژماردنی ویـردو صـەڵاواتو یـادی خودا. {بڕوانە: ژمارە: ١٢٩٢ - ڕوونكردنەوە}.

٨- گۆڕینی ناو، لەبەر هۆی لەبار، بەناوێكی تری جوان سوننەتە.

٩- غەزا دەبێ لەگـەڵ كەسـانی بێبـاوەڕی بـێ دیـن بـێ، كـە دوژمنایـەتی خواو پێغەمبەرو ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەكەن.

١٠- لەكاتی دەسـتپێكردنی جـەنگا شـوێنە گومكـێو فـێڵو هەڵخەڵەتانن سوننەتەو كارێ زۆر پەسەندە.

١١- بەپێی ڕۆژو بەپێی بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانان، دروسـتە سـوود لەپسپۆڕیو چالاكیی ناموسوڵمان وەربگیرێ.

١٢- لەشەڕدا كوشتنی ژنو منالٚ دروست نییە.

١٣- پـیرو بەساڵاچـوو لـەكاتی شـەڕدا نـاكوژرێن، مەگـەر دوژمـن سـوودو بەهرە لە پسپۆڕیو توانایان وەربگرێ.

١٤- جەنگاوەر ئەگەر بۆ روونکردنەوەی رووی راستی بێ، نەوەك بۆ فیزو دەعیە، باسی ئازایی‌و پایەی خۆی بکا دروستە.

١٥- لەجەنگا، لەکاتی پێویستدا، هەموو زیاندانێ، چی زیانی سەربازی، چی زیانی گیانی، چی زیانی سامانی، لەدوژمن‌و لە بەرژەوەندەکانی دوژمن دروستە.

١٦- دەستپیسی‌و گەندەڵی دارایی‌و دزی‌و فزی لە سامانی دەوڵەت قەدەغەیەو نادروستەو تاوانە.

١٧- لەکاتی شەڕدا، بەپێی بەرژەوەندی گشتی بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێ دروستە، وەك مەنجەنیق‌و تۆپ‌و فڕۆك‌و مووشەك‌و بۆمبا.

١٨- بەکارهێنانی سەنگەرو زریەو کڵاو زریەو شتی تری وا، کە لەکاتی شەڕدا، لەزیانی جەستەیی‌و گیانی کەم دەکەنەوە دروستە، بەڵکوو ئەگەر فەرزو پێویست نەبێ، سوننەتێکی گەورەیە، وە ئەم جۆرە کەرەستەی پاراستنە، بەپێی رۆژگار دەگۆڕێ، وەك: کەممامەی غاز.

١٩- نەزری شتێ کەهی تۆ نەبێ دانامەزرێ.

٢٠- لەکاتی ئیسلام بووندا، خۆشۆردن سوننەتە.

٢١- زیادە بەش کە دەدرێ بەجەنگاوەر دروستە.

## ٨٣- باسی سەرانەو ئاگربەست (شەڕ راوەستان)
## بَابُ: الجِزيَةِ وَالهُدْنَةِ

{بڕوانە: تاج/٤، لاپەڕە: ٧٧٤، زنجیرە: ٧٦، لە ژمارە: ٤٥٥٤وە هەتا ژمارە: ٤٥٥٦}.

١٣٣١- عَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَخَذَهَا - يَعْنِي: اَلْجِزْيَةُ - مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٧٦ = بوخاری/٣١٥٦}:

له تەجریددا ئاوایە:

عومەری كوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) لەپێش مەرگیدا بەسالێ، نامەی نارد بۆ خەڵكی بەصرە: (كە هەر ژنو مێردێ لە ئاگرپەستەكان، كە لەناو خۆیانا خۆییو مەحرەمنو بەپێی یاسانامەی ئیسلام بەیەكتری ناشێن، وەك ئەوە خوشكو بران، ئەوە ئەم جۆرە ژنو مێردە لەیەكیان جیا بكەنەوەو ئەو جۆرە هاوسەرییە هەڵوەشێننەوە).

وەهەتا عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف شایەتی نەدا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرانەی وەردەگرت لە ئاگرپەستەكانی وڵاتی هەجەر، حەزرەتی عومەر سەرانەی لێ وەرنەدەگرتن، بەڵكوو سەرپشكی دەكردن: كە یا ئیسلام قەبووڵ بكەن، یان بەشمشێر دەكوژرێن، بەڵام لەپاش شایەتی عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف، ئیمامی عومەر سەرانەی لە ئاگرپەرستیش وەردەگرت. {تاج/٤، ژمارە: ٤٥٢١، زنجیرە: ٦٦، لاپەڕە: ٧٥٥ + ژمارە: ٤٥٢٢}.

(ڕوونكردنەوە):

١- مەجووس واتە: ئاگرپەست، بەپێی ئایینی خۆیان، خوشك لەبرای خۆی مارە دەكەن، شتی وا لە ئیسلاما نادروستەو قەدەغەیە، لەبەر ئەوە هەركاتێ لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامدا، شتی وا ڕوویدا، دەبی قەدەغە بكرێو ڕێگەی ئەوەیان نەدرێ.

٢- بۆ ئێمە دروست نییە ژنو ژنخوازی لەگەڵ ئاگرپەست ئەنجام بدەین، نە دروستە ژنیان لێ بخوازین، نە درووستە ژنیان پێ بدەین، لەمەدا لەگاورو جوولەكە جیاوازن، دروستە ژنی جوولەكە یان ژنی گاور بهێنین، بەڵام دروست نییە كە ژنیان پێ بدەین.

٣- گاورو جوولەکەو ئاگرپەست سەرپشکن لەنێوانی دانی سەرانەدا، یان شەڕکردن لەگەڵیانا، یان قەبووڵی ئیسلام هەریەکێ لەم سی شتە قەبووڵ بکەن، لێیان قەبووڵ دەکەین.

٤- حافظ دەفەرموێ: لەڕێگەیەکی ترەوە، ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت کراوە، بەڵام پچڕاندنی واتیادا، لە مووەطادا هاتووە. کە ئەمەیە: ئیبنو شەهاب دەفەرموێ: گەیشتۆتەوە بەمن کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرانەی لەئاگرپەستەکانی بەحرەین وەرگرتووە.

١٣٣٢- وَعَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَنَسٍ، وَعَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ" (رضى الله عنه) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعْثِ خَالِدُ بْنُ اَلْوَلِيدِ إِلَى أُكَيْدِرِ دُومَةَ، فَأَخَذُوهُ فَأَتَوْابِهِ فَحَقَنَ دَمِهِ، وَصَالَحَهُ عَلَى اَلْجِزْيَةِ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{حسن، صحيح أبي داود: ٢٦٢١}:

عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودا لە خۆیو لەباوکی بێ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوەو لە عوثمانی کوڕی ئەبو سولەیمانەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ سەر پادشای دۆمە، لەشکرەکەی خالید، شای دومەتولجەندەلیان بەدیل گرت، کە ناوی ئوکەیدیر بوو، مەسیحی بوو، هێنایان بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامانی دایەو لەسەرو گیانی خۆی ئەمینی کردەوەو لەگەڵی پێکهات لەسەر ئەوە کە سەرانە بداتو لەسەر وڵاتی خۆی بمێنێتەوە. {تاج/٤، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٤٥٢٥}.

(ڕوونکردنەوە):

١- عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی خەطاب، دائەنرێ بە تابیعی، لەپێش مەرگی پێغەمبەردا، بەدوو ساڵ لەدایك بووە، پیاوێکی شۆخو جوان بوو،

بەخۆوە بوو، خێرخواز بوو، هەستیار – واتە: شاعیر – بوو، ساڵی حەفتای کۆچی مردووە، لەپێش مەرگی عەبدوڵلای برایدا بەچوار ساڵ، لەدایکەوە باپیرەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە.

٢- عوثمانی کوڕی ئەبو سولەیمانی کوڕی جوبەیری کوڕی موطعیم، قورەیشییە، مەککەییە.

١٣٣٣– وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { بَعَثَنِي اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) إِلَى اَلْيَمَنِ، وَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَاراً، أَوْ عَدْلَهُ معافرياً } أَخْرَجَهُ اَلثَّلَاثَةِ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{صحيح، إرواء الغليل: ١٢٥٤. أبو داود: ١٥٧٧. ترمذي: ٦٢٣. نسائي: ٢٢٤٢. ابن حبان: ٤٨٨٦. حاكم/١/٥٥٥}:

موعاذی کوڕی جەبەل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ منی نارد بۆ سەر وڵاتی یەمەن، فەرمانی پێم کرد: کە ئەوەی ڕەسیدە بووە، واتە: بالغ بووە، ساڵی یەك لیرەی زێڕی سەرانە لێ وەربگرم، یان بایی لیرەیێ جلوبەرگی مەعافیری لێ وەربگرم. {تاج/٤، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٤٥٢٧}.

(ڕوونکردنەوە):

موعافیری جۆرە جلوبەرگێکە، کە لەشاری موعافیر دروست دەکرێ کە شارێکە وا لە یەمەن، وەك چۆن لەلای خۆمان دەگوترێ: کڵاشی هەورامی، یان فەرشی کاشان، یان چۆغەی شاربازێڕ.

١٣٣٤– وَعَنْ عَائِذِ بْنُ عَمْرٍو الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: { "اَلْإِسْلَامِ يَعْلُو، وَلَا يُعْلَى"} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ.

{حسن، صحيح الجامع: ٢٧٧٨}:

عائیذی کوڕی عەمری ئەلموزەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیسلام هەر سەربەرز دەبێ، قەت سەرشۆڕ نابێ!!).

بڕوانە ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٤١٨، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٩٦٢ کە دەفەرموێ:

ئەبو داوود (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: کە دوو برا، کە یەکێکیان موسوڵمان بووەو ئەوی تریان جوولەکە بووە، لەسەر کەلوپەلی باوکیان سکاڵا دەبەن بۆ یەحیای کوڕی یەعمەر، یەحیا کەلەپووری تەنیا بۆ موسوڵمانەکەیان دانا، وە گوتی: ئەبولئەسوەد گێڕایەوە بۆم، لەپیاوێکی ترەوە لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە، لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (الإِسْلاَمُ يَزِيدُ وَلاَيَنْقَصُ: ئیسلام زۆری دەبەخشێ، کەمی نابەخشێ!).

(ڕوونکردنەوە):

عائیذی کوڕی عەمری کوڕی هیلالی ئەلموزەنی، خۆیو ڕافیعی کوڕی عەمری برای هاوەڵی پێغەمبەرن، لە بەصرە دائەنیشتن، کەسناوی عائیذ: ئەبوهوبەیرە بوو، واتە: پێیان دەگوت: باوکی هوبەیرە، عائیذ یەکێ بوو لەبەشدارانی بەیعەتولریضوان، کە لەژێر درەختەکەدا پەیمانیان دا بە پێغەمبەر، لە ڕۆژی حودەیبییەدا عائیژ یەکێ بوو لەفرە باشەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر، لەبەصرە خانوویەکی کرد، هەتا مرد لەوێ دەژیا، لەسەردەمی عەبدوڵڵای کوڕی زیاد، لەبەصرە وەفاتی کرد، ئەو سەردەمە بوو کە یەزید جێنشین بوو، یان خۆی کردبوو بەجێنشین، ڕایسپارد کە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی بەرنوێژی نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی بکا، نەبادا عەبدوڵڵای

کوڕی زیاد نوێـژی لەسـەر بکـا، حەسـەنو موعاوییـەی قـوڕە گێڕانـەوەی لێـوە ئەنجام دەدەن.

٢- بەیعەتولـشەجەرە = پـەیمانی درەختەکـە = بەیعـەتولریـضوان = پەیمانی خۆشنوودی چییە؟

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەساڵی شەشی کۆچیدا، لەمانگی ذیلقەعـدەدا، کـە بـەکوردی پێـی دەگـوترێ: نـاو جـەژنان، لەگـەڵ دەوروبـەری (١٤٠٠) هـەزارو چوارسـەد کـەس لـەهاوەڵانی دەچـن بـۆ عـەمرە، کـە دەگەنـە حودەیبییە، کەناوی بیرێکە نزیکی مەککەیە، لەسەر ڕێگەی جیددەیـە، لـەوێ لادەدەنو پێغەمبەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێنـەرێکی خـۆی دەنێـرێ بۆلای قـوڕەیش لـە مەککە، نـاوی (خراشـی کـوڕی أمیـەی ئـەلخوزاعی) دەبـێ، سـواری وشـترێکی خـۆیی دەکـا، کـە وشـترەکە نـاوی (الثعلب) دەبـێ، هـەتا بـە ئاغاکـانی قـوڕەیش ڕابگەیـەنێ، کەئێمـە بـۆ عـەمرە هـاتووین، بـۆ شـەڕ نەهاتووین، ڕێگەمان پێ مەگرن.

بـەڵام قـوڕەیش وشـترەکە سـەردەبڕنو دەیانـەوێ کـە نوێنەرەکـەی پێغەمبـەریش بکـوژن، بـەڵام ئەحابیـشەکان نـاهێڵن، جا نوێنـەرەکە دێتـەوەو هەواڵەکە دەهێنێتـەوە بـۆ پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) دوا ئـەوە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) عوثمـانی کـوڕی عـەففان دەنێـرێ، قوڕەیش عوسمان حەپس دەکەنو قاوەیێ بڵاو دەبێتەوە کە عوثمان کـوژراوە، جا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەژێر درەختێکا، کـە دار سـەموورە بـووە، پـەیمان لـەهاوەڵان وەردەگـرێ، کـە هـەتا ئـاخر دڵـۆپی خـوێن پـشتی بەرنەدەن، بەو پەیمانە دەگوترێ: بەیعەتولریضوان، هەروەها پێـی دەگـوترێ: بەیعەتولـشەجەرە، بـەکوردی پێـی دەگـوترێ: پـەیمانی خۆشـنوودی، هـەروەك پێـی دەگـوترێ: پـەیمانی حودەیبییـە. کـەخودای گـەورە ئـەم پەیمانـەی

لەقورئانی پیرۆزدا، لەسوورەتی فەتحدا، لە ئایەتی (١٨ - ١٩) دەدا، ئاوا تۆمار کردووە:

{لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا، وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا – سورة الفتح/١٨ – ١٩}: {بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٧٨ - روونکردنەوە}.

١٣٣٥– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { " لَا تَبْدَؤُوا اَلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى بِالسَّلَامِ، وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ، فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ" } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٤، بەکوردی ژمارە: ١٤٣٢ چاپی یەکەم، لاپەڕە: ٧٨}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێوە لەپێشدا سڵاو لە جوولەکەو گاورەکان مەکەن، ئەگەر لە ڕێگەیش تووشی یەکێکیان بوون، ڕێگەکە تەنگەبەر بوو، ناچاری بکەن کە ئەو بکەوێتە تەنگە بەرییەکەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٥٢٩٤، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

لەپوختەی صەحیحی موسلیمدا، لە ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا، دەفەرموێ:

ئەم فەرموودەیە ڕوونکردنەوەیەکی باشی دەوێ، بەڵام من ئەم چەند خاڵە لەشەرحەکانەوە ڕاگوێز دەکەم:

١- بەهیچ شێوەیێ مەبەست لەم فەرموودەیە ئازاردانی جەستەیی، یان ئازاردانی دەروونی، یان سووکایەتی پێکردنی کۆمەڵایەتی نییە، چونکە شتی

وا، وەك قازی عەیاض‌و قورطوبی دەفەرموون: ئازاردانی بە بەلاشە، شتی وایش لە ئایینی ئێمەدا حەرامەو نابێ ببێ.

٢- كورت‌و پوخت، بەكوردی پەتی: (مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە، كە موسوڵمانان، لەوڵاتی خۆیانا، خۆیان گەورەو سەروەر بن‌و خلەو بلە نەبێ بە ئاغاو گەورەیان، دەنا بەهیچ شێوەیێ مەبەست ئەوە نییە كە تۆ لە هەموو ڕێگەو شەقامێكا، كارێكی وا بكەی كە ئەوان ناچار بكەی كە لەتەنگەبەری‌و سەر شۆستەو قەراخ ڕێگەكانەوە بڕۆن!).

آ- ئەوەتا عومەری كوڕی عەبدولعەزیز دەفەرموێ: (بەلامەوە قەیدی نییە، ئەگەر لەپێشا سلاو لەخاوەن نامەكان بكرێ، چونكە خودای گەورە دەفەرموێ: {فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ – سورة الزخرف/٨٩} . (فەتحولباری، ژمارە: ٦٢٥٤).

{يَجُوزُ ابْتِدَاءُ الكَافِرِ بالسَّلامِ لِقَولِ اللّهِ تَعَالَى: لا يَنْهَاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ} .

ب- لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: طەبەری لە طەریقی ئیبنو عویەینەوە فەرموودەیێ دەردەهێنێ، دەفەرموێ: {فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ} . {فەتحولباری، ژمارە: ٦٢٥٤}

٣- چونكە لە یاسانامەی ئێمەی گەلی ئیسلامدا، كۆمەڵێ بڕیارو ڕێنمایی هەیە، كە فەرمان دەكەن بە موسوڵمانان، كەبەشێوەی گشتی خێرخوا بن‌و ڕەفتار بەرز بن‌و ڕێزی دروستكراوانی خودایان لەلا هەبێ‌و هەموو خاوەن مافێ، مافی خۆیی پێ بدرێ، بەتایبەتی فەرمان كراوە بەچاكەكردن لەگەڵ ئەهلی ذیمەداو دروستە چاكوچۆنیان لێ بكرێ‌و هاموشۆیماڵیان بكرێ‌و لەخۆشی‌و ناخۆشیدا هاوبەشییان بكرێ‌و ڕێزی بیروباوەڕیان‌و ڕێزی جەژن‌و بۆنەو پەرستگاو نامەكانیان بگیرێ.... تەواو)).

وەكی تریش ئەم دەقە پیرۆزانە، پیویستە كەڕێزیان بگیرێو پشتگوێ نەخرێن، بەلاّم وەك چارەسەرێكی گشتی بۆ ئەم جۆرە كێشانە، جەمعە لەنێوانی دەقەكانا، ئێمە كۆمەڵێ دەقمان هەیە لەم بابەتە وەك:

{وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ}.

{وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً}.

جا واباشە بەپێی كاتو شوێنو بۆنەو بەرژەوەندی دینو دونیامان، ئەم دەقانە لەیەكتری موتوربە بكەینو بڕیارێ بدەین كەهەم خوداو هەم بەندەی خودا لەخۆمان ڕازی بكەین، ئەویش كاری سەرەكی ئەنجومەنی بالاّی زانایانو مامۆستایانە.

١٣٣٦- وَعَنْ اَلْمِسْوَرِ بْنُ مَخْرَمَةَ. وَمَرْوَانُ" { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) خَرَجَ عَامَ اَلْحُدَيْبِيَةِ. ..... فَذَكَّرْ اَلْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَفِيهِ: " هَذَا مَا صَالَحَ عَلَيْهِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اَللَّهِ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو: عَلَى وَضْعِ اَلْحَرْبِ عَشْرِ سِنِينَ، يَأْمَنُ فِيهَا اَلنَّاسُ، وَيَكُفُّ بَعْضُهُمْ عَنْ بَعْضٍ" } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ. وَأَصْلِهِ فِي اَلْبُخَارِيِّ.

{حسن، سنن أبی داود: ٢٧٦٦. تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٣٤ = بوخاری/٢٧٣١، ٢٧٣٢ + تەجرید/٢، ژمارە: ٧٩٩ = بوخاری/١٦٩٤}:

ئەم فەرموودەیە لەتەجریدی بوخاریدا هەر زۆر زۆر درێژە.

لێرەدا ئاوایە: میسوەری كوڕی مەخرەمەو مەڕوان دەگێڕنەوە، كە لەڕێكەوتننامەكەی ساڵی حودەیبییەدا ئەمە نووسرا بوو: (ئەمە ئەو ڕێكەوتننامەیەیە، كە موحەممەدی كوڕی عەبدوللاّ، لەگەڵ سوهەیلی كوڕی عەمردا، كەنوێنەری هۆزی قوڕەیشە، ڕێكەوتوون لەسەری، ڕێكەوتوون لەسەر ئەوە كە شەڕ بۆ ماوەی دە ساڵ، لەنێوانیانا ڕابگیرێو شەڕوشۆڕ لەبەینیانا نەبێ، خەڵك هێمن ببنەوەو لەسەر ماڵو گیانو سامانو ناموسی خۆیان دڵنیابن، وە كەسیان دەستدرێژی لەكەسیان نەكا).

١٣٣٧- وَأَخْرَجَ مُسْلِمٍ بَعْضِهِ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ، وَفِيهِ: { أَنَّ مَنْ جَاءَ مِنْكُمْ لَمْ نَرُدْهُ عَلَيْكُمْ، وَمَنْ جَاءَكُمْ مِنَّا رَدَدْتُمُوهُ عَلَيْنَا. فَقَالُوا: أَنَكْتُبُ هَذَا يَا رَسُولُ اَللَّهُ؟ قَالَ: "نَعَمْ. إِنَّهُ مِنْ ذَهَبٍ مِنَّا إِلَيْهِمْ فَأَبْعَدَهُ اَللَّهُ، وَمَنْ جَاءَنَا مِنْهُمْ، فَسَيَجْعَلُ اَللَّهُ لَهُ فَرَجاً وَمُخْرِجاً" }.

{صحيح مسلم ترقيم الشيخ مأمون شيحا/٤٦٠٨ = صحيح مسلم ترقيم محمد فؤاد: ١٧٨٤}: (بڕوانه: مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١١٧٧ = شيحا: ٤٦٠٧).

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، لەصەحیحی موسلیمدا:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: قوڕەیش ڕیٚکەوتننامەکەیان لەگەڵ پیٚغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بیٚ) لەحودەیبییە ئەنجام دا، نویٚنەرەکانی قوڕەیش سوهەیلی کوڕی عەمریان تیادا بوو، جا لەوکاتی نووسینی نامەی ڕیٚکەوتنەکەدا، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بیٚ) بەعەلی کوڕی ئەبو طالیبی فەرموو: (مەرجەکە لە نیٚوانمانا لەسەر ئەم شیٚوەیە بنووسە: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ = بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان).

سوهەیل نویٚنەری ناموسوڵمانەکان، ڕازی نەبوو، گوتی: ئیٚمە ئەم جۆرە{(بِسْمِ اللَّهِ} یەمان نەبیستووەو نازانین چییە، بەڵام وەك جاران بنووسە: {باسْمِكَ اللَّهُمَّ: بەناوی تۆ ئەی خودایە!}.

جا پاش ئەوە کە پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیٚ) ڕازی بوو، کە لەجیاتی {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ} بنوسن {باسْمِكَ اللَّهُمَّ}.

ئەوجا فەرمووی: (بنووسە: موحەممەدی پیٚغەمبەری خودا لەسەر ئەمە بڕیاری داوە.....) نویٚنەرەکانی بیٚباوەڕەکانی مەککە گوتیان: ئەگەر بزانین کەتۆ پیٚغەمبەری خودایت، ئیسلام دەبین و پەیڕەویت دەکەین، کەواتە شتی وا نابیٚ، بەڵام بنووسە: (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا، ناوی خۆت و

باوکت بنووسە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (باشە بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا......... تاد). جا بەمەرجیان گرت لەسەر پێغەمبەرو لەپەیماننامەکەدا نووسییان:

(لەسەر ئەوەیش کە هەرکەسێ لەئێوەی دەستەی موحەممەد هات بۆناو ئێمە، وەری دەگرین‌و نایدەینەوە بەئێوە، بەڵام بەپێچەوانەوە: هەرکەسی لەئێمە هات بۆ ناو ئێوەی دەستەی موحەممەد، دەبێ نەیگرنە خۆتان‌و بیدەنەوە بە ئێمە).

یارانی پێغەمبەریش (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یارانی بێ) فەرموویان: چۆن شتی وا زەق‌و ناقۆڵا بنووسین، ئایا شتی وا بنووسین؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ، بینووسین، چونکە ئەوەی کە لەلای ئێمەوە بچێ بۆ لای ئەوان، ئەوە خودا خەشمی لێ گرتووەو بێباوەڕبۆتەوەو خودا دووری خستۆتەوە، ئەوەی کەلای ئەوانەوە بێت بۆلای ئێمە ئەوە خودا دەرووی لێ دەکاتەوەو ڕێگەیەکی ڕزگاری بۆ دەسازێنێ!). {تاج/٤، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٤٥٥٤ - ٤٥٥٦}.

١٣٣٨- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو " عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "مِنْ قَتْلِ مُعَاهِداً لَمْ يَرَحْ رَائِحَةَ اَلْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لِيُوجَدَ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًّا"} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٨٠ = بوخاری: ٣١٦٦، ٦٩١٤}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ، یەکێ لەئەهلی ذیممە بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکات، وەلحاڵ بۆنی بەهەشت چل ساڵە ڕێگە دەڕوات!!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، لاپەڕە: ١٠، ژمارە: ٢٢٩٩ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

لە فەرموودەی تردا هەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: {مَنْ آذَى ذِمِّيًّا فَأَنَا خَصْمُهُ}.

جا لەڕوانگەی ئەم دەقانەوەو چەندین دەقی تر، کەفەرمان دەکەن بە باشبوون بۆ ئەهلی کیتاب، بەدڵنیاییەوە، دەڵێن: (ئیسلام چاکەخوازە، ئاشتیخوازە، دژی ئازاری دروستکراوانی خودایە، هەرکەس لەهەر میلەتێ بێ ئەگەر شەڕ بە موسوڵمانان نەفرۆشێ‌و حەزی لەدۆستی‌و برادەریی موسوڵمانان هەبێ، موسوڵمانان دەستی دۆستی‌و یارمەتی بۆ درێژ دەکەن‌و تۆڵەو پاداشی چاکە بەچاکەتر دەدەنەوە).

## ٨٤- باسی پێشبڕکێ‌و تیرەندازی
## باب: السَّبْقِ وَالرَّمْيِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: (٧٠٠) ژمارە: ٤٤٢٣ هەتا ژمارە: ٤٤٢٧ + زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٤٤٢٨ هەتا ژمارە: ٤٤٣٤ چاپی چوارەم + مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١١٠٨ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٧٦، لاپەڕە: ١٠١٥}.

١٣٣٩- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { سَابَقَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِالْخَيْلِ اَلَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ، مِنْ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةِ اَلْوَدَاعِ. وَسَابَقَ بَيْنَ اَلْخَيْلِ اَلَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ مِنْ اَلثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَكَانَ اِبْنُ عُمَرَ فِيمَنْ سَابَقَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ زَادَ اَلْبُخَارِيُّ، قَالَ سُفْيَانُ: مِنْ الْحَفْيَاءِ إِلَى ثَنِيَّةِ اَلْوَدَاعِ خَمْسَةِ أَمْيَالٍ، أَوْ سِتَّةَ، وَمِنْ اَلثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ مِيلٍ.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٦٠ = بوخاری/٤٢٠، ٢٨٦٨، ٢٨٦٩، ٣٨٧٠، ٧٣٣٦. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١١٠٨ = ٤٨٢٠. أبوداود. جهاد: ٢٥٧٥. نسائی. خیل: ٣٥٨٦. تحفة الأشراف: ٤٣٤٠}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێیەکی بە وڵاخی بـەرزە سـازدا، ئەسپ و ماینـەکانی کرد بەدوو تاقم، ئـەو ئەسـپ و ماینانـەی کـە قـاڵ بـوون و ئامـادە کرابـوون بـۆ قوشمـەپێکردن، ئەمـسەری مەیـدانی تەراتێنەکـەیان حـەیفاء بـوو، ئەوسـەری ثـەنییـەتول وەداع بـوو، ئـەو مـاین و ئەسپانەیـشی کـە ئامـادە نـەکرابوون بـۆ قوشمە، گۆڕەپانی پێشبڕکێکەیان کورتتر بـوو، لـە ثـەنییـەتول وەداعـەوە بـوو، هـەتا مزگـەوتی بـەنی زورەیـق، وەمـن خـۆم یـەکێك بـووم لـەو سـوارانەی کـە بەشداریمانکرد لەم پێشبڕکێیەدا، وەمن یەکەمیان بووم). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٤٤٢٣ چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- حەیفاء جێگەیەکە، لە کلکەی مەدینەی جارانەوەیە، پێنـج یان شـەش میل لە مەدینەوە دوورە.

٢- ثەنییـەتول وەداع (واتـە: ملـەی خواحـافیزی و بـەڕێکردن) شـوێنێکی ناسراوە، لەنزیك مەدینە، کەسێکی ئازیز کە لەمەدینە دەردەچوو هـەتا ئـەوێ لەگەڵی دەچوون بۆ خواحافیزی لێ کردن.

٣- مزگەوتی بەنی زورەیق دەوری میلێ لە ثەنییەتول وەداعەوە دوورە.

٤- ئیبنـو عومـەر خـۆی بەشـداری لـەم پێـشبڕکێیەدا کـردووە و بـراوەی یەکەم بووە.

٥- لـە ژمـارە: (٢٨٦٨ - بخـاری)دا، سـوفیان دەفـەرموێ: لەحـەیفاوە بـۆ ثەنییەتول وەداع، پێنـج میلە، یان شەش میلە لە ثەنییـەتول وەداعیـشەوە بـۆ مزگەوتی بەنی زورەیق یەك میلە.

١٣٤٠- وَعَنْهُ" (رضي الله عنه): { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) سَـبَّقَ بَيْنَ اَلْخَيْلِ، وَفَضَّلَ اَلْقُرَّحَ فِـي اَلْغَايَـةِ } رَوَاهُ أَحْمَـدُ، وَأَبُـو دَاوُدَ، وَصَـحَّحَهُ اِبْـنُ حِبَّانَ.

{صحيح أبي داود: ٢٢٤٧. أحمد. رقم: ٥٣٤٨. أبو داود: ٢٥٧٧}:

**دیـسان ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێیەکی بەوڵاخی بەرزە سازکرد، گۆڕەپانی غاردانی ئەسپو ماینە گەنجە گورجو گۆڵەکانی دوورتـر دانـا، لـەهی ئـەوانی ترا.**

١٣٤١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "لَا سَبْقَ إِلَّا فِي خُفٍّ، أَوْ نَصْلٍ، أَوْ حَافِرٍ" } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالثَّلَاثَـةَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح، إرواء الغليل: ١٥٠٦. الصحيح المسند: ١٣٩٤. أحمد ٢٥٦/٢. أبـو داود: ٢٥٧٤. ترمذي: ١٧٠٠. نـسائي/٢٢٦/٦. ابـن ماجـة: ٢٨٧٨. ابـن حبـان: ٤٦٩٠}:

**ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (دروسـت نییـە کـە پێشبڕکێ لەسـەر خـەڵات بکرێ، مەگەر بۆ وشترو وڵاخ وەك ئەسپو ماینو بە ڕمو پەیکانو شـتی تـری وا بکرێ، ئەوە دروستە).**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- پێشبڕکێ لەسەر ماڵو لەسەر خەڵات، ئەم چەند جۆرەی هەیە:**

**جۆری یەکەم: ئەوەیە کە دوو کەس، یان دوو تاقم، پێشبڕکێ بکەن کـێ، یان کام لایان براوە بوو، خەڵاتەکە بۆ ئـەو، یـان ئـەوان بـێ، وەخەڵاتەکـەیش لایەنێکی سێیەم دابینی بکا، دوولایەنی یاریکەر دابینی نەکەن، ئەم جۆرەیـان بەم سێ شێوەیەی کە گوتران، بەکۆی دەنگ دروستە.**

جۆری دووەم: ئەوەیە یەکێ لەدوو کەسەکە، بەهاوڕێکەی بڵێ، ئەگەر تۆ بردتەوە ئەوەندە پارەت دەدەمێ، وە ئەگەر من بردمەوە هیچم ناوێ، ئەمەیش دروستە، هەروا دوو لایەنیش شتی وا بکەن دروستە.

جۆری سێیەم: دوو کەس ڕێبکەون لەسەر ئەوە ئەگەر هەرکامێکیان بردیانەوە دۆڕاوەکە ئەوەندە ماڵ بدا بە براوەکە، ئەمە قومارەو نادروستە، هەروا دوو لایەنیش شتی وا بکەن هەر نادروستە، چونکە قومارە.

٢- پێشبڕکێ ئەگەر لەسەر ماڵ نەبێ، جۆرێکە لە وەرزش دروستە، بەمەرجێ سەرنەکێشێ بۆ بێ شەرعی، وەك رووت‌و قووتی.

١٣٤٢- وَعَنْهُ، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: { " مَنْ أَدْخَلُ فَرَساً بَيْنَ فَرَسَيْنِ - وَهُوَ لَا يَأْمَنُ أَنْ يَسْبِقَ - فَلَا بَأْسَ بِهِ، وَإِنْ أَمِنَ فَهُوَ قِمَارٌ" } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ.

{ضعيف الجامع: ٥٣٧١. أحمد ٢/٥٠٥. أبوداود: ٢٥٧٩. ضعيف الجامع: ٥٣٧٧}:

دیسان ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر سواری سێیەم هاوبەشی پێشبڕکێی نێوانی دوو سواری تری کرد، وەدڵنیا نەبوو لەوە کە کەس پێشی نەکەوێ، ئەوە دروستە، بەڵام ئەگەر سواری سێیەم دڵنیابوو لەوە کە کەس لەو پێشبڕکێیەدا پێشی ناکەوێ، ئەوە دروست نییە، چونکە قومارە).

١٣٤٣- وَعَنْ عُقْبَةِ بْنُ عَامِرٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اَللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَهُوَ عَلَى اَلْمِنْبَرِ يَقْرَأُ: وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اِسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِباطِ الخَيْلِ... الآية. أَلَا إِنَّ اَلْقُوَّةَ اَلرَّمْيُ، أَلَا إِنَّ اَلْقُوَّةَ اَلرَّمْيُ، أَلَا إِنَّ اَلْقُوَّةَ اَلرَّمْيُ }. رَوَاهُ مُسْلِمٌ .

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١٠٢ = شيحا: ٤٩٢٣ + رياض/٣، لاپەڕە: ٢٢٢، زنجيرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٣٢}:

عوقبـەی کـوڕی عـامیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: گـوێم لـە پێغەمبـەر بـوو (درودی خـودای لەسـەر بـێ) لەسـەر دوانگـە (مینبـەر) دەیفەرموو: (مەبەست لە (قُـوَّة) بۆ ئـەم سـەردەمەی ئێمـە، لـەم ئایەتـەدا کـە دەفـەرموێ: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ – سورة الأنفـال/٦٠} : مەبەست لـەم (قُـوَّة)یـە، لـەم ئایەتـەدا، تیرئەنـدازیو تیرهاویـشتنە، وە سێ جار ئـەم وشەیەی دووبارە کردەوە. {تاج/٤، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٤٤٢٨}.

(زنجیرە: ٨٨)

## ١٣- نامەی خواردەمەنییەکان
## كِتَابُ الأطعِمَةِ

{بڕوانـە: تـاجول ئوصـول بـەکوردی/ بـەرگی سـێیەم، لاپـەڕە: ١٩٠ لـە زنجیرە: ١٦ وە هـەتا زنجیرە: ٢٨ لـە ژمـارە: ٢٦٣٦ هـەتا ژمـارە: ٢٧٦٠ + مختـصر صحیح مـسلم/٣، زنجیرە: ١٠٣٤ لـە ژمـارە: ١٢٩٦ وە هـەتا ژمـارە: ١٣٣٤ + فیقهـی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٦٢، لاپەڕە: ٩٧٨ چاپی إیران. تەجریدی بوخـاری/٥، لاپـەڕە: ٧٧، زنجیرە: ٧٣ لە ژمارە: ١٨٠٠ وە هەتا ژمارە: ١٨٢١}.

١٣٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: { " كُلُّ ذِي نَابٍ مِنْ اَلسِّبَاعِ، فَأَكْلُهُ حَرَامٌ" } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٣١ = شیحا ٤٩٦٤ = مسلم/١٩٣٣ + تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٣٥ بخاری/٥٥٣٠}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـەموو دڕندەیـەکی کەڵبـەدار خـواردنی گۆشتەکەی حەرامە). {بڕوانە: تـاج/٣، زنجیـرە: ٣ + تـاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمـارە: ٢٥٧٣}. {فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٦٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- هەر گیانلەبەرێ کە گۆشتی نەخورێ، کەوڵەکەی بەخۆشە کردن پاك دەبێتەوە، بێجگە لە سەگو بەراز.

٢- زۆر لەو گیانلەبەرانەی کە گۆشتیان ناخورێ، دروستە بۆ مەبەستی ڕەوای تر سوودیان لێ وەربگیرێ، وەك سواریو جووتو پاسو ڕاوو پشکنینو جوانیو گەلێ سوودی تر، کە شەرع ڕێگەی پێیان داوە. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٢٩}.

١٣٤٥- وَأَخْرَجَهُ: مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) بِلَفْظِ: نَهَى. وَزَادَ: { " وَكُلُّ ذِي مِخْلَبٍ مِنْ اَلطَّيْرِ" }.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٣٢ = شيحا: ٤٩٧٠ = صحيح مسلم/١٩٣٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیو ڕێگری دەکرد لەخواردنی گۆشتی دڕەندەی کەڵبەدارو لەخواردنی گۆشتی باڵندەیێ کە چنگو چڕنووکی هەبێو ڕاوی پێ بکرێ، خواردنی گۆشتی ئەم دوو جۆرە جانەوەرەی قەدەغە کردووە. {تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٥٧٣ ج/٤}.

١٣٤٦- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم) يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ اَلْحُمُرِ اَلْأَهْلِيَّةِ، وَأَذِنَ فِي لُحُومِ اَلْخَيْلِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي لَفْظِ اَلْبُخَارِيِّ: { وَرَخَّصَ }.

{البخاری/٤٢١٩. بڕوانە: پوختەی صەحیحی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٣٢ + مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٢٩ = شيحا/٤٩٨٣ = صحيح مسلم/محمد فؤاد عبدالباقي/١٩٤١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی غەزای خەیبەردا، جڵەوگیری کرد

لەخواردنی گۆشتی کەری ماڵی، وەرێگەی خواردنی گۆشتی ماین‌و ئەسپی دا). {تاج/٣، زنجیرە: ١، لاپەڕە: ١٥١، ژمارە: ٢٥٥٣ ج/٤}.

١٣٤٧- وَعَنْ اِبْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: { غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَبْعَ غَزَوَاتٍ، نَأْكُلُ اَلْجَرَادَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختـەی صـەحیحی بوخـاری = تەجریـدی بوخـاری = مختـصر صـحیح البخاری/٥، ژمارە: ١٨٣١ = بوخـاری/٥٤٩٥. مختـصر صـحیح مـسلم/٣، ژمـارە: ١٣٢٥ = شیحا/٥٠١٩ = صحیح مسلم تـرقیم محمـد فـؤاد عبـدالباقی/١٩٥٢. أبـو داود. أطعمة/٣٨١٢. ترمذی. أطعمـة/١٨٢١. نـسائی. صـیدو ذبـائح/٤٣٦٧. تحفـة الأشراف/٥١٨٢}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـەبو ئـەوفا (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی بـێ) دەفـەرموێ: لەگـەڵ پێغەمبـەر خۆیـدا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) حـەوت غـەزا، یـا شـەش غـەزامان کـردووە، کـە لـەو غەزایانـەدا لەگـەڵ پێغەمبـەردا کوللەمان دەخوارد). {تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥٠ ج/٤}.

١٣٤٨- وَعَنْ أَنَسٍ - فِي قِصَّةِ اَلْأَرْنَبِ - { قَالَ: فَذَبَحَهَا، فَبَعَـثَ بِوَرِكِهَـا إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَبِلَهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٩٨ = بوخاری/٢٥٧٢، ٥٤٨٩، ٥٥٣٥. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٢٢ = شیحا/٥٠٢٢ = صحیح مسلم/ ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی/١٩٥٣}:

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەمـەڕو ظەهـران، کەروێـشکێکمان هەڵـسان، کـوڕ گـەل نیـشتنە سـەری، هـەتا مانـدوو بوون، بەڵام من نیشتمە سـەری هـەتا گـرتم، ئـەوجا بـردم بـۆ ئـەبو طـەلحەی زڕبابم، ئەبو طەلحە سەری بڕی‌و هەردوو سمتەکەی‌و هـەردوو ڕانەکـەی نـارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من بۆیم بـرد، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەری گرت). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٤٩، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥١}.

١٣٤٩- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنْ اَلدَّوَابِّ: اَلنَّمْلَةُ، وَالنَّحْلَةُ، وَالْهُدْهُدُ، وَالصُّرَدُ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح، إرواء الغليل/٢٤٩٠. أحمد. رقم: ٣٠٦٧. أبو داود/٥٢٦٧. ابن ماجة/٣٢٢٤}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی کوشتنی ئەم چوار گیانلەبەرەی نەداوە: مێروولەو هەنگو پەپووسلێمانکەو (صورەد). {تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢٥٧٧ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- رەنگ بێ (صورەد) بەکوردی باشووکەی پێ بگوترێ، فەرهەنگی خاڵ دەڵێ: باشووکە باڵندەیەکی دەنووك کەوانەییە، لەواشە پچووکترە، راوە چۆلەکەی پێ ئەکرێ.

٢- نادروستکردنی کوشتنیان نادروستکردنی خواردنی گۆشتەکەیانە، بەڵام هەرکاتێ ئەم جۆرە گیانلەبەرانە، کە پێشگیری کراوە لە کوشتنیان، بوون بەهۆی ئازارو کێشە بۆ کەسێ، ئەگەر بەهیچ شتێکی تر چار نەدەکران، بەکوشتنیان نەبێ، ئەوە دروستە کە بکوژرێن.

١٣٥٠- وَعَنْ اِبْنِ أَبِي عَمَّارٍ قَالَ: { قُلْتُ لِجَابِرٍ: اَلضَّبُعُ صَيْدٌ هِيَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: قَالَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: نَعَمْ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةَ وَصَحَّحَهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/٣/٢٩٧. أبو داود/٣٨٠١. ترمذي/٨٥١، ١٧٩١، ابن ماجة/٣٩٦٤، صحيح، إرْوَاء الغليل/٢٤٩٤}:

ئیبنو ئەبو عەممار دەڵێ: عەرزی جابیری کوڕی عەبدوڵڵام کرد ئایا: کەمتیار دائەنرێ بەنێچیرو گۆشتی حەڵاڵەو دەخورێ؟ فەرمووی: بەڵێ، کەمتیار دائەنرێ بە نێچیرو گۆشتەکەی حەڵاڵە. گوتم: ئایا ئەمە قسەو رای

خۆتـه، یـا فهرمایـشتی پێغهمبـهره؟ فـهرمووی: نـهء، قـسهو رای خـۆم نییـه، بهڵکوو فهرموودهو فهرمایشتی پێغهمبهره).

١٣٥١- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) " أَنَّهُ سُئِلَ عَـنْ اَلْقُنْفُـذِ، فَقَـالَ: قُلْ لَا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ...). فَقَالَ شَيْخٌ عِنْدَهُ: سَـمِعْتَ أَبَـا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: { ذُكِرَ عِنْدَ اَلنَّبِـيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) فَقَـالَ: إِنَّهَـا خَبِيثَـةٌ مِـنْ اَلْخَبَائِثِ} . فَقَالَ ابنُ عُمَرَ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ هذَا فَهُوَ كَمَا قَالَ: أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ.

{احمد/٢/٣٨١. أبو داود/٣٧٩٩. ضعيفُ أَبِي دَاوُد: ٨١٤}:

کهسێ لهبارهی خواردنی گۆشتی ژیشکهوه، پرسیاری لـه ئیبنـو عومـهر کرد، که ئایا حهڵاڵه، یا حهرامه؟

ئیبنـو عومـهر (رهزای خودایـان لێ بـێ) فـهرمووی: بـهپێی ئـهم ئایهتـه حهرام نییه، که دهفهرموێ: {قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَـيَّ مُحَرَّمًـا عَلَـى طَـاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْـسٌ أَوْ فِـسْقًا أُهِـلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ – الأَنْعَام – ١٤٥/٦}.

واته: جا تۆ ئهی موحهممهد، ئهی پێغهمبهری خودا! جلڕبدهو بڵێ: من لهو نیگاو سرووشهدا، که لهخوداوه بۆم دێ، نابینم کهشتێ حهرام بـێ لهسـهر خـۆراك خـۆرێ، مهگـهر ئهوشـته مـردارهوه بووبـێ، یـا خـوێنێکی رژاوبـێ، یـا گۆشـتی بـهراز بـێ، چـونکه بهڕاسـتی ئـهوه پیـسه، یـاخود گیانلهبـهرێکی سهربڕاوی دوور له یاسای ئیسلام بێ، بـهم رهنگـه لـهکاتی سـهربڕیندا، نـاوی غهیری خودای لهسهر برابێ).

پیـاوێکی پـیر لـهلای ئیبنـو عومـهر بـوو گـوتی: مـن بیـستم لـه ئـهبو هورهیره دهیفـهرموو: لهخزمـهتی پێغهمبـهردا، باسـی ژیـژوو کـرا، فـهرمووی: (پیسێکه لهپیسهکان).

ئیبنو عومەریش (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: (ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەهای فەرمووبێ، ئەوە چۆنی فەرمووە هەروەهایە). {تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٥٦٧}.

١٣٥٢- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلْجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةِ إِلَّا النَّسَائِيُّ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{أبو داود: ٣٧٨٦. ترمذی/١٨٢٤. ابن ماجة/٣١٨٩}:

لەتاجا ئاوایە: ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردنی گۆشتو شیری گیانلەبەری پێسی خۆری قەدەغە کردووە). لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغەی کردووە کە سواری بکرێ بە وشتری پیسی خۆر، یا لەگۆشتو شیری بخۆن). {تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٥٧١ چاپی چوارەم}.

(روونکردنەوە):

مەبەست لە گیانلەبەری پیسخۆر، کە گۆشتەکەی حەرامە، ئەو جۆرە گیانلەبەرانەیە، کە پیسایی مرۆڤ دەخۆنو بەزۆری لەسەر خواردنی شتی پیس دەژین، هەتا وەهایان لێ دێ، کە گۆشتەکەیان بۆنی ئەو پیسییەی لێ دێ کە دەیخۆن.

١٣٥٣- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {فِي قِصَّةِ اَلْحِمَارِ اَلْوَحْشِيِّ- فَأَكَلَ مِنْهُ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٣٨ = ١٨٢٢، ١٨٢١، ١٨٢٣، ١٨٢٤، ٢٥٧٠، ٢٨٥٤، ٢٦١٤، ٤١٤٩، ٥٤٠٦، ٥٤٠٧، ٥٤٩٠، ٥٤٩١، ٥٤٩٢. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ٦٨٠ = شیحا/٢٨٣٧ = مسلم/١١٩٦. نسائی. حج/٢٨١٨}:

ئەمە دەقی ئەم چیرۆکەیە لە تەجریدی بوخاریدا:

ئەبو قـەتادە (ڕەزای خـوداى لێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەمەدینـەو دەوروبەریـەوە، بـەرەو مەککـە دەرچووین بۆ عەمرە، ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە، لە عوسفان هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەشکرێکی دوژمن وا لـە غـەیق، کە شیوێکە وا لـەنێوانی مەککەو مەدینـەدا، جا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) دەستـەیەکی نـارد بـۆ سـۆراخی ئـەو دوژمنـە، مـن لـەو دەستـەیەدا بـووم، بـەرەو ئـەوان ڕۆیـشتین، هاوڕێکانم ئیحرامـی عـەمرەیان دابەسـت، مـن ئیحرامم دانەبەست، جا کاتـێ گەڕاینـەوە بـۆلای پێغەمبـەر، هاوڕێکانم کـەرە کێوییەکیان بینیو لەناو خۆیانا دەستیانکرد بە پێکەنین، کەوا هەلێکی وایـان بۆ هەلکەوتووە، بەڵام لەبەر ئیحرام بەستنەکەیان، دەستەڵاتی هیـچیان نییـە، منیش تەماشایم کردو بینیمو ئەسپەکەمم لێ تـاوداو، ڕمـێکم لێ داو چەسـپم کـرد لەجێگـەی خۆیـدا. جـا داوای یارمـەتیم لـە هاوڕێکـانم کـرد کـە لەگـەڵما هەڵیبگرن، بەڵام قایل نەبوون، کە هـیچ کۆمەکییـەکم بکـەن، لـەم لایەنـەوە، لەپاشـان لـە گۆشـتەکەیمان خـوارد، لـەڕێ کـە گەڕاینـەوە بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) مەترسـی ئـەوەمان هـەبوو، کـە دوژمـن بڕمـان بکەنو بنـەبڕمان بکـەن. جـا سـەرێ بـەغارو سـەرێ بـەڕەوت دەڕۆیـشتین، تـا لـەنیوە شـەودا گەیـشتین بـە پیـاوێ لـەخێڵی نـەوەی غیفـار، مـن لـێم پرسـی: لـەکوێ پێغەمبـەرت بـەجێ هێـشت؟ گـوتی: لـە تـەعهین بـەجێم هێـشت، کـە ئاوێکە سێ میل لەگوندی سوقیاوە دوورە، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) کەمن بەجێم هێشت دەیویست وچانی نیوەڕۆ لەگوندی سوقیا بگرێ، کـە گوندێکە وا لەنێوانی مەککەو مەدینەدا، لەوێ سەرخەوێ بشکێنێ.

ئەبو قـەتادە فـەرمووی: جـامن خـۆم گەیانـدە لای پێغەمبـەرو عـەرزیم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! هاوەڵەکانت کە لەگەڵ مندا بوون، عەرزی سڵاوو ڕەحمەتو بەرەکەتی خودایان هەیە لەخزمەتـدا، وە مەترسـی ئـەوەیان هەیـە

کـه دوژمـن بڕیـان بکـاو دوور لـەتۆو لـە سـوپاکەت قەلاچـۆیان بکـا، کەواتـە چاوەڕوانیان بکە، هەتا دێن، ئەویش لەویَ چاوەنواڕی کـردن، هـەتا هـاتن، جـا من عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمـە کـەرە کێوییـەکمان راوکـردووە، وە هەندیَ لە گۆشتەکەیمان لەلا ماوە، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بیَ) بە هاوڕێکانی خۆی کە لـە ئیحرامـدا بـوون، فـەرمووو: (لێـی بخـۆن، زیـانی نییە بۆ ئیحرامەکەتان).

لەگێڕانـەوەی ئێـرەدا دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خۆشی لەگۆشتی کەرە کێوییەکەی خوارد).

١٣٥٤- وَعَنْ أَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: { نَحَرْنَا عَلَـى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَرَساً، فَأَكَلْنَاهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریـد/٥، ژمـارە: ١٨٣٢ = ٥٥١١، ٥٥١٠، ٥٥١٢، ٥٥١٩. مختـصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٢٨}:

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێت) فەرمووی: لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەمەدینـە، ئەسپێکمان سەربڕیو گۆشتەکەیمان خوارد). {تـاج/٣، زنجیرە: ١، ژمـارە: ٢٥٥٤ ج/٤}.

(ڕوونکـردنەوە):

١- هـەر گیانلەبـەریَ لـە یاسـانامەی خـوادا، یـەکیَ لـە ڕەگـەزی نێـری، یـا یەکیَ لە ڕەگەزی مێی حەڵاڵکرابیَ، ئەوە هەردوو ڕەگەزەکەی بەشێوەی گشتی حەڵاڵـە، وەك: ئەسـپ حەڵاڵـە، کەواتـە مـاینیش بـەبیَ جیـاوازی حەڵاڵـە، یـا کەڵەشـێر گۆشـتی ئـەخوریَ، کەواتـە مریـشکیش گۆشـتی ئـەخوریَ، یـا دێـڵ گۆشتی حەرامە، کەواتە: گەماڵیش گۆشتی حەرامە، هەروەها.

٢- گەورەو بچوکیو تەمـەنو ڕەنـگو نەخۆشـیو ئـەم جـۆرە شـتانە بـۆ حـەڵاڵی، یـا حـەرامی گۆشـتی گیانلەبـەران ڕۆڵیـان نییـە، گەرچـی بەشـێوەی

گـشتی، دەبـێ هەنـدێ بڕیـاری ڕەواو شـیاو، ڕەچـاوبکرێ، وەك: مـەرجی تەندروسـتیو سـوودو قـازانجی گـشتی، وەك کەسـێ بـچێ لـەکاتی زاوزێـی گیانلەبەراندا ڕاویان بکاو بیان کوژێ، کەشتی وا ئەگەر گۆشتەکەیشی حەرام نەکات، تاوانێکی شەرعیو یاسایییە.

١٣٥٥- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { أُكِلَ اَلضَّبُّ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٩٩ = بوخاری/٢٥٧٥، ٥٣٨٩، ٥٤٠٢، ٧٣٥٨. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٢٣ = شيحا/٥٠٠٩ + ژمـارە: ١٣٢٤ = شيحا/٥٠١٨. مسلم/١٩٤٧}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێت) فەرمووی: پوورم ئـوم حەفیـد کـە خوشـکی دایکـم بـوو، کەشـكو ڕۆنو چـەند بزنمژەیـەکی بـەدیاری نـارد بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەرسێ دیارییەکانی پورمی وەرگرت، وەخۆی لـە کەشکەکەو لە ڕۆنەکەی خوارد، بەڵام قێزی کردەوە لـە بزنمژەکـە، لەبەرئـەوە لێی نەخوارد، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (بـەڵام گۆشـتی بزنمژە لەخزمەت پێغەمبەرداو لەسەر سفرەی پێغەمبەر خوراوە، دەی ئەگەر خواردنی گۆشتی بزنمژە حەرام بوایە، لەسەر خوانی پێغەمبەر نەدەخوراو لە هـەلو مـەرجی وادا دەیفـەرموو حەرامـە). {تـاج/٣/١٥٠، زنجـیرە: ١، ژمـارە: ٢٥٥٢}.

١٣٥٦- وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ اَلْقُرَشِيُّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ طَبِيبـاً سَأَلَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلضِّفْدَعِ يَجْعَلُهَا فِـي دَوَاءٍ، فَنَهَـى عَـنْ قَتْلِهَا } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ. وَأَخْرَجَهُ أبو داود والنسائِيّ.

{صحيح الجامع/٦٩٧١. المسند/٣/٤٥٣. أبو داود/٥٢٦٩. نـسائی/٧/٢١٠. حاكم/٣/٥٠٤}:

عەبـدوڕەحمانی کـوڕی عوثمـانی ئەلقوڕەیـشی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فەرمووی: پزیشکێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ): ئایا دروستە کە بۆق بکرێتە نـاو دەرمانـەوە؟ پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدا کە بیکوژێ، کە نەیشکوژرێ ناکرێتە ناو دەرمانـەوە!).
{تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢٥٧٦}.

## ٨٥- باسی نەچیرو کوشتنیو سەربڕاوەکان
## بَابُ: الصَّيْدِ وَالذَّبَائِحِ

{بڕوانـە: تـاجول ئوصـول بـەکوردی/٣، زنجـیرە: ١، لاپـەڕە: ١٤٨ چـاپی چـوارەم، ژمـارە: ٢٥٤٩ هـەتا ژمـارە: ٢٦٣٥ + مختـصر صـحيح البخـاری المـسمّیٰ ب(التجريـد الـصّريح)/٥، زنجـيرە: ٧٥، لـە ژمـارە: ١٨٢٦ هـەتا ژمـارە: ١٨٣٩ + مختصر صـحيح مـسلم/٣، لەژمارە: ١٢٣٩ هەتا ژمـارە: ١٢٦١ + فيقهـی ئاسـان/٢، زنجيرە: ٣٥٨ هەتا زنجيرە: ٣٧٥}.

١٣٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنِ اتَّخَذَ كَلْباً، إِلَّا كَلْبَ مَاشِيَةٍ، أَوْ صَيْدٍ، أَوْ زَرْعٍ، اِنْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجريدی بوخاری/٣، ژمـارە: ١٠٢١ = ٢٣٢٢، ٢٣٢٣ بوخـاری. مختـصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٤٤ = ٤٠٠٧ = صحيح مسلم/ محمد فؤاد/١٥٧٥}:

ئـەبو هـورەيرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـەر کەسـێ سـەگێ ڕابگـرێ، سـەگی پاسـی ئاژەڵو سەگی ڕاوو سەگی پاسی زەویو زارو مـەزراو کشتوکاڵ نـەبێ، هـەموو ڕۆژێ ئەندازەيێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

پێـشەوا زوهـری دەفـەرموێ: کاتـێ ئـەم فەرموودەيـەی ئـەبوهورەيرە باسکرا بۆ ئيبنو عومەر، کە ئەم ڕستەيەی واتيادا:

(سەگی پاسی زەوی‌و مەزرا نـەبێ) ئیبنـو عومـەر فـەرمووی: رەحمـەتی خودا لە ئەبوهورەیرە بێ، خۆی خاوەنی مەزرا بوو، بۆیە وا گرنگی داوە بـەم ڕستەی (سەگی پاسی زەوی‌و مەزرا نەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧١، ژمـارە: ١٩١٨ + تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٧ ج/٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٦، ژمارە: ١/١٦٨٨}.

(ڕوونکردنەوە):

بـەپێی یاسـانامەی ئیـسلام سـەگ پیـسە، وەزیـانی زۆرە لـەزۆر ڕووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا شەرعی پـیرۆز ڕێگـەی سـوود وەرگـرتن‌و کـەڵکوەرگرتنی لەسەگ داوە، بەهەموو چەشنەکانییەوە، بەڵام ئەو کەسەی کە سەگ ڕادەگـرێ دەبێ چەند خاڵێ ڕەچاو بکا، وەك پـاك‌و تـەمیزی‌و پاکژکردنی، لەسـەر ئـەم شێوەیە:

یەکەم: دروستە سەگ بۆ ئەم مەبەستانە ڕابگیرێ:

١- بۆ پاس‌و ئاگاداری، وەك پاسـی ڕان‌و سـامان‌و مـاڵ، لـەدزو جانـەوەری زیانەخرۆ، وەك گورگ‌و چەقەڵ‌و بەراز، یان بۆ پاسـی منـاڵی سـاوا وەك لەلـە، یا بۆ پاس‌و ئاگاداری پیاوو ژنی کەفتەکار لەماڵەوە.

٢- بۆ ڕاووشکار، وەك: تووولە‌و تانجی‌و سەگی ڕاوی تر.

٣- سەگی پۆلیسی، بـۆ دۆزینـەوەی تـاوان‌و بـۆ زۆر مەبەسـتی ڕەوای تـر، وەك لـە کـاتی بوومەلـەرزە‌و کارەسـاتی سروشـتیدا، تـەرمی ژێـر داروپـەردوو ئەدۆزێتەوە، یان مرۆڤی گیرخـواردووی ژێـر رووخـاوی‌و شـتی وا دەدۆزێتـەوە، یان ماددده سڕکەرەکان‌و بارووت‌و تەقەمـەنی شـاراوە بـەنیازی خـراپ ئاشـکرا ئەکا، یان لەزۆر رووی تری شەرعییەوە سوودو قازانج بەکۆمەڵگا دەگەیەنێ.

٤- سەگی چاوساغ لە ئەورووپاو لەزۆر وڵاتـانی تـر دەبـن بـە چاوسـاغ بـۆ کوێرو ئەمانـەو لەپێـشیانەوە دەڕۆن‌و ئـەوانیش بـەهۆی پەتێکـەوە شـوێنیان دەکەون، هەتا دەگەنـە شوێنی مەبەست.

٥- بۆ كاركردن، وەك دەبينين، لەولاتى ئالاسكا، لەناو ئەسكيمۆكاندا، لەبەر زۆرى ساردىو سەهۆلبەدان، سەگ بەكاردەهێنن بۆ ڕاكێشانى گاليسكەو عەرەبانەى سەربەفر، وە چەند سەگێ ڕايدەكێشن، وەك لەزۆر شوێن سەگ فێر دەكەن مەشقى پێ دەكەنو زەميلە دەكەنە ملىو دەچێ لەبازار لەلاى ماميل گۆشتو سەوزەو شتى تر دەكڕێو دەگەڕێتەوە بۆ مالى خاوەنىو خاوەنەكە ناوى شتەكە دەنووسێو دەيخاتە زەميلەكەى ملىو دەيبا بۆ ماميلەكەو ئەويش پێويست ئەنجام دەدا.

دووەم: سەگ لەم سەردەمەى ئێمەداو لەدێرينيشدا بۆ زۆر شتى تر بەكار دەهێنرێ، وەك:

١- سەگى گەمەو يارى، وەك مەيموونى لۆتى، وەك لەسێركو ئەمانەدا دەيبينين، وەك سەگ بۆ جوانى، وەك خولياو هيوايە.

٢- بۆ هەندێ كارى ناڕەوا، كەپێويست ناكا ناوى بەرين.

٣- بۆ شەڕە سەگو شتى ترى واو بۆ قومارو بۆڕبۆڕێن.

٤- كێلگەى سەگ هەيە، لەكۆرياو ئەو ولاتانەى كە سەگ دەخۆن، بۆ خواردنى گۆشتەكەى، وەك كێلگەى پەلەوەرو ئاژەلى ولاتى خۆمان. وە بۆ زۆر مەبەستى تريش سەگ ڕائەگيرێ.

سێيەم: جا ئەوەى كە ئەركى موسولمانە ئەمەيە:

١- بەپێى توانا، خۆى لەسەگ دوور بگرێ، وە بۆ ناچارى نەبێ، بەپێى بڕگەى (يەكەم) بەكارى نەهێنێ.

٢- لەپێشدا بيكوتى، بە لقاحى دژى هارى.

٣- ئەگەر ناچار بوو، وەك ئەوە لەكێلگەى سەگا ئيش بكا، يان سەگى پۆليسى پەروەردە بكا، دەستێ جلى تايبەتى هەبێ، بەپێى كاتى پێويست، وەك بەدلە عەمەل، بەكارى بهێنێو لەپاشا دايكەنێ. وەهەر كاتێ شوێنێكى بەتەڕى بەر سەگ كەوت گلاوى دەر بكا، وە ئەوندەى دەتوانێ، جێگەى سەگو

کولانەکەی‌و شوێنەکەی، پاك‌و پوخت ڕابگرێ، وەبرسی‌و توونی نەکات‌و بەخۆڕایی ئازاری نەدات، چونکە لە فەرموودەدا هەیە: (ژنێ بەهۆی تێراوکردنی سەگێکەوە دەچێتە بەهەشت، وە ژنێ تر بەهۆی ئازاردانی پشیلەیەکەوە دەچێتە دۆزەخەوە).

٤- جا بەنیازی سوود وەرگرتنی ڕەوا لەسەگ، دروستە پەروەردەیش بکرێ‌و بەتوتکەیی گەورە بکرێ، وە لەڕووی یاسانامە (شەرع)ەوە، ئەم جۆرە کردارانە دروستەو قەیدی نییەو بەر ئەو نەهیە ناکەوێ کە لەڕاگرتنی سەگ کراوە، بەڵام ئەوەندە هەیە کارکردن بەو سەوداو مامەڵەی کە سەگ ئەنجامی دەدا، یا کردنی هەندێ تەصەڕوفاتی سەگ بە بەڵگەو نیشانە لەسەر هەندێ بڕیار ئەوە باسێکی دوورو درێژەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی پسپۆڕان هەیە لەهەموو روویەکەوە.

چوارەم:

١- حەنەفییەکان دەڵێن سەگ پاکە، پیس نییە، بەڵام بەرماوەکەی لیکەکەی‌و ئارەق‌و هەموو تەڕییەکی پیسە، وەك بەدەق دەڵێن: {إِنَّ الكَلْبَ لَيْسَ بِنَجِسِ العَيْنِ، ولِكنْ سؤْرُهُ وَرُطُوبَاتُهُ نَجِسَةً} (حاشينة ابن عابدين ١/٢٠٤).

٢- مالیکییەکان دەڵێن: سەگ خۆی‌و ئارەقی‌و فرمێسکی‌و لیکی‌و هەمووی پاکە، طاهرولعەینە. بەڵام لەپاش تۆپین پیسە. بەدەق دەڵێن: {الكَلْبُ طَاهِرُ العَيْنِ} (الشرح الصغير على أقرب المسالك إلى مذهب مالك – ١/٤٣ – ٤٤).

٣- شافیعی‌و حەنبەلییەکان دەڵێن: سەگ نەجیسولعەینە {يرى الشَّافِعِيَّةُ وَالحَنَابِلَةُ: أَنَّ الكَلْبَ نَجِسُ العَيْنِ} (الأم ١/٨، والقلوبى وعميرة ١/٦٩، والمغنى لأبن قدامة ١/٣٣). بۆ موسوڵمان هەیە کە پەیڕەوی یەکێ لەم مەزهەبانە بکات.

١٣٥٨- وَعَنْ عَدِيِّ بنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { "إِذَا أَرْسَلَتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اَللَّهِ عليه، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيًّا فَاذْبَحْهُ، وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قُتِلَ وَلَمْ يُؤْكَلْ مِنْهُ فَكُلْهُ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ وَقَدْ قُتِلَ فَلَا تَأْكُلْ: فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَيُّهُمَا قَتَلَهُ، وَإِنْ رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اَللَّهِ، فَإِنْ غَابَ عَنْكَ يَوْماً، فَلَمْ تَجِدْ فِيهِ إِلَّا أَثَرَ سَهْمِكَ، فَكُلْ إِنْ شِئْتَ، وَإِنْ وَجَدْتَهُ غَرِيقاً فِي اَلْمَاءِ، فَلَا تَأْكُلْ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ.

{تەجرید/٥، زنجیره: ٧٥، ژماره: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥، ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، تەجرید/٥، ژماره: ١٨٣٠ = ٥٤٨٤، ٥٤٧٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٢٤١ = شیحا ٤٩٥٤ = صحيح مسلم (محمد فؤاد): ١٩٢٩}:

**له موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایه:**

**عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەی پێغەمبەری خودا! من ڕاو دەکەم، جاری وا هەیە تیرەکۆڵە، یا نەقیزە، کە بەعەرەبی پێی دەڵێن: (میعراض) دەگرمە نەچیرو دەیپێکم، ئەم جۆرە ڕاوە حەڵاڵە یان نا؟**

**فەرمووی: (ئەگەر تیرە کۆڵەت گرتە نەچیرو بەباری تیژییەکەیدا پێکای و تێی هەڵچەقی و زاماری کرد، ئەوە بیخۆ، چونکە حەڵاڵە، تەنانەت کاتێ دەگەیتە سەری مردبوو هەر حەڵاڵە، بەمەرجێ نەگەنی بێ، بەڵام ئەگەر لەسەر باری پانی ئەنگاوتی و کوشتی و فریای سەربڕینی نەکەوتی و بەو تیرە مردار بوویەوە، ئەوە مەیخۆ، چونکە ئەوە بەزەبر مردارەوە بووەو بەر ئەو مەوقووزەیە دەکەوێ کە خودا لە قورئاندا نادروستی کردووە، کەناسراوە بە (مَوْقُوذَة). وەلێشم پرسی لەبارەی نەچیری ڕاوکراو بەسەگی فێرەڕاو، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من سەگی فێرەڕاوم هەیە کە دەیانکەمە نەچیر دەیگرن بۆمن، وە لەکاتی بەرەڵلا کردنیاندا، کە دەیانکەمە نەچیرەکە**

ناوی خودا دەهێنم، ئەی ئەمە چۆنە؟ فەرمووی: (کاتێ سەگی فێرمڕاوی خۆتت بەرەڵلاکردە گیانی نەچیرو ناوی خودات لێ هێنا، ئیتر لەگۆشتی ئەو نەچیرە بخۆ، بەمەرجێ سەگەکە لێی نەخواردبێ، دەنا لێی مەخۆ چونکە لەکاتی وادا سەگەکە راوی بۆ خۆی کردووە نەوەك بۆ تۆ).

عەرزیمکرد: قوربان! ئەگەر وا رێکەوت، سەگێ تریش لەگەڵ سەگەکەی مندا، لەسەر نێچیرەکە بوو، وەنەم دەزانی کە کامیان لەپێشا گرتوویەتی، ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: (لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خودات لە سەگەکەی خۆت هێناوە، وەناوی خودات لەسەگی تر نەهێناوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩}.

(ڕوونکردنەوە):

١- عەدی کوڕی حاتەمی تائی، کەناسراوە بەجوامێری و بەخشندەیی، وەك دەڵێن: فیسار ئەوەندە بەخشەرو چاکەکارە دەڵێی حاتەمی تائییە. لەساڵی نۆی کۆچیدا عەدی ئیسلام بووە، لەپێشا مەسیحی بووە، لەسەر ئایینی عیسای کوڕی مەریەم بوو، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی عێراق بوو، لەپاشا لەکووفە نیشتەجێ بوو، لەجەنگی صەفیندا لەگەڵ ئیمامی عەلی بوو، خۆی دەیفەرموو: (ئەوەتی موسوڵمان بووم، هەموو کاتێ کەبانگی داوە دەستنوێژم بووە!)

لەدوا ساڵی شەستی کۆچی مردووە، دەڵێن: تەمەنی دەیدا لەسەدو بیست ساڵ، هەندێ تر دەڵێن: سەدو هەشتا ساڵ ژیاوە، پیاوێکی زۆر سەخی بوو، هەمیشە بەشەوقەوە چاوەڕوانی هاتنی نوێژەکانی دەکرد، لەبوخاری و موسلیمدا فەرموودەی هەیە. (بڕوانە: تەجرید/٥، لاپەڕە: ١١٧، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥ بخاری + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤١٢، لاپەڕە: ٤٨٤ چاپی یەکەم).

٢- ئەمەیش وەرگەڕاوی گێڕانەوەی کتێبەکەیە.

عــەدی کــوڕی حاتــەم (ڕەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (کاتێ سەگەکەت دەکەیتە نەچیر، نـاوی خـودای لێ بهێنــەو لـەو کاتــەدا کـە بـەرەڵلای دەکـەیت بڵـێ: (بســم الله: بـەناوی خـودا) جـا ئەگـەر سـەگەکە نەچـیرەکەی گـرتو بەزینـدوویی فریـای کـەوتیت ئـەوا سـەری ببـڕە، وە ئەگــەر چـوویتە سـەر نەچـیرەکەو روانیـت کـوژراوە، وەلێـی نـەخوراوە، ئـەوا بیخـۆ، بـەڵام ئەگـەر کاتـێ دەچـیتە سـەر نەچیرەکەو بینیـت سـەگی تـر لەگـەڵ سـەگەکەی تـۆدا لەسـەریەتی، لەهـەمان کاتدا کوژراویشەو گیانی تیادا نەماوە، ئـەوە لێـی مـەخۆ، چونکە تـۆ نازانیـت سەگەکەی تۆ کوشـتوویەتی، یـان سـەگەکەی تـر کـەهی تـۆ نییـە. وەکاتـێ تـیر دەهاوێژیت بۆ نەچیر، ناوی خودا بهێنەو لەکاتی تێگرتنەکەدا بڵێ: (باسم الله: بەناوی خودا) تەنانەت ئەگەر لەپاش شەوو ڕۆژێکیش نێچیرەکەت دۆزیـەوەو تەنیا شوێنی تیرەکەی تۆی پێوە بوو وە مردبوو ئەوا بیخۆ، ئەگـەر گیـانی تیـا مابوو، ئەوا سەری ببڕەو بیخۆ، بەڵام ئەگەر دینیت لەناو ئاوا بوو ئەوا مەیخۆ، مەبادا بەئاوەکە خنکابێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩}.

١٣٥٩- {وَعَنْ عَدِيٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ صَيْدِ اَلْمِعْرَاضِ فَقَالَ: "إِذَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ، فَقُتِلَ، فَإِنَّهُ وَقِيذٌ، فَلَا تَأْكُلْ" رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ}:

له ژمارەی پێشەوە کە ژمـارە: (١٣٥٨) بـوو بەتـەواوی‌و بـەدوورو درێـژی ڕابووورد.

١٣٦٠- {وَعَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: " إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ، فَغَابَ عَنْكَ، فَأَدْرَكْتَـهُ فَكُلْـهُ، مَـا لَـمْ يُنْـتِنْ"} أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ:

له ژمارەی (١٣٥٨)دا بەتەواوی ڕابورد.

١٣٦١- وَعَنْ عَائِشَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)): { أَنَّ قَوْمًا قَالُوا لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِنَّ قَوْماً يَأْتُونَنَا بِاللَّحْمِ، لَا نَدْرِي أَذُكِرَ اِسْمُ اَللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا؟ فَقَالَ: " سَمُّوا اَللَّهَ عَلَيْهِ أَنْتُمْ، وَكُلُوهُ" } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٣٦ = ٢٠٥٧، ٥٥٠٧، ٧٣٩٨}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جاری وا هەیە ڕێ دەکەوێ هەندێ کەسی نۆموسوڵمان، کە هێشتا بە باشی فێری یاساکانی ئیسلامەتی نەبوون، وا دەبێ ئەو جۆرە تازە موسوڵمانانە، گۆشتمان بۆ دێنن، نازانین لەکاتی سەربڕیندا، ناوی خودایان لێ هێناوە، یان نا، جا ئایا لێی بخۆین یان نا؟

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (خۆتان لەکاتی دەستکردن بەخواردنی، ناوی خودا بهێنن‌و بیخۆن). {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٢٦٠٠ ج/٤}.

١٣٦٢- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنِ اَلْخَذْفِ، وَقَالَ: "إِنَّهَا لَا تَصِيدُ صَيْدًا، وَلَا تَنْكَأُ عَدُوًّا، وَلَكِنَّهَا تَكْسِرُ اَلسِّنَّ، وَتَفْقَأُ اَلْعَيْنَ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریدی بوخاری/١٨٢٨ = بوخاری/٥٤٧٩. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٤١ = شیحا: ٥٠٢٦ = مسلم/ محمد فؤاد/١٩٥٤}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی خزمی عەبدوڵلای کوڕی موغەففەلی ئەلموزەنی، پەلەپیتکەی دەتەقاند، عەبدوڵلا پێی فەرموو: پەلەپیتکە مەهاوێژە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی نەداوە، وە دەیفەرموو: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوە نە نەچیری پێ ڕاو دەکرێ‌و نە دوژمنی پێ کۆڵەوار دەکرێ،

بەڵام بەپێچەوانەوە دوور نییە کە ددانی کەسێ بشکێنێ، یان چاوی دۆستێ کوێر بکا).

فەرمووی: جا ماوەیێ لەوە دوا، دیسان عەبدوڵڵای دییەوە کەکابرای خزمی پەلەپیتکەی دەهاویشتەوە، جا عەبدوڵڵا بەکابرای فەرموو: من فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ تۆ دەگێڕمەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگە بە پەلەپیتکە هاویشتن نادات، کەچی تۆ هەر واز ناهێنیت، جا کەوای لێ هات، هەرگیزاو هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەم. {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٩٥}.

١٣٦٣- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "لَا تَتَّخِذُوا شَيْئاً فِيهِ اَلرُّوحُ غَرَضًا" } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٤٨ = شيحا: ٥٠٣٥ + ١٢٤٧ = شيحا: ٥٠٣٠ = مسلم/ترقيم محمد فؤاد عبدلباقي/١٩٥٧}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا بووم، لەلای تاقمێ لاوی قوڕەیشەوە ڕەت بووین، باڵندەیەکیان نابۆوە بەنیشانەو تیریان تێدەگرت، ئەو تیرانەی کەلێی نەدەدا دەیاندا بەخاوەنی مریشکەکە.

جا لاوەکان کەچاویان کەوت بە ئیبنو عومەر، لەشەرمانا هەڵهاتن‌و بڵاوەیان لێ کرد، ئیبنو عومەر کەحاڵەکەی بینی، فەرمووی: کێ ئەمەی کردووە؟ ئەمە ئیشی چی بێ ویژدانێکە، دەك نەفرینی خودای لێ بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرەت‌و لەعنەتی کردووە لەو کەسەی کە گیانلەبەر، هەر گیانلەبەرێ بێ، دەنێتەوە بەنیشانە. {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٢٦٠٢ ج/٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠١ چاپی دووەم}. {تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٢}.

١٣٦٤- وَعَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ امْرَأَةً ذَبَحَتْ شَاةً بِحَجَرٍ، فَسُئِلَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عَنْ ذَلِكَ، فَأَمَرَ بِأَكْلِهَا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ:

**لەتاجول ئوصولا ئاوایە:**

**رۆژێ کەنیزەکێکی کەعبی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) لەسەلع ڕان دەلەوەڕێنێ، کە سەلع لەوەڕگایەکە لە مەدینە، مەڕێ لەڕانەکە دەئەنگێورێ، کچەیش فریای دەکەوێو بە بەردێ سەری دەبڕێ، کە ئەمەیان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسی فەرمووی: (بیخۆن).**
**{تاج/٣، زنجیره: ٧، ژماره: ٢٥٩٧. بخاری. ذبائح: ٥٥٠٥}.**

١٣٦٥- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: { "مَا أُنْهِرَ اَلدَّمُ، وَذُكِرَ اِسْمُ اَللَّهِ عَلَيْهِ، فَكُلْ لَيْسَ اَلسِّنَّ وَالظُّفُرَ" أَمَّا اَلسِّنُّ" فَعَظْمٌ" وَأَمَّا اَلظُّفُرُ: فَمُدَى اَلْحَبَشِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٧٧ = بوخاری/٢٤٨٨، ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٨، ٥٥٠٣، ٥٥٠٦، ٥٥٠٩، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤}:

**لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:**

**رافیعی کوڕی خەدیج (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە زولحولەیفە، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، لەشکرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تووشی برسێتی بوون، جا وشترو ئاژەڵی تالآنیان وەدەست کەوت، فەرمووی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوای سوپاکەوە بوو، خەڵکەکەیش پەلەیان بوو، دەستیان کرد بەئاژەڵ سەربڕینو مەنجەڵیان خستە سەر ئاگر، هەتا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە بەرەوە، بەم حاڵەی زانی، وەك تەمێ کردنێ بۆیان، فەرمانی دا مەنجەڵە گۆشتو مەرگەکانیان قلْپ کردەوە، ئەوجا پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستکەوتەکەی دابەشکرد، وە دە سەر پەزی دانا بەیەك وشتر، جا لەم نێوانەدا، وشترێ بەلەسە بوو، تەرا بوو خەڵکەکە کەوتنە**

شوێنی، چاریان نەکرد، ماندووی کردن، لەناو لەشکرەکەدا چەند وڵاخێکی بەرزەی کەم هەبوو، جا پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تیرێکی پێوە ناو خودا بەو تیرە گلی دایەوە.

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەندێ لەم ئاژەڵانە سڵو سرکو تورەن، وەك جانەوەری کێوی سرکو بەلەسەن، جا ئەگەر شتی وا رووی‌داو چارتان نەکرد، کەبەشێوەی ئاسایی سەری ببڕن، ئەوە وەك ئەمە ئاوای لێ بکەن، ئەوە بریتی سەربڕینەکە دەکەوێ).

عەبایەی کوڕی ریفاعەی کوڕی رافیعی کوڕی خەدیج فەرمووی: رافیعی باپیرەم فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەشەڕداین‌و لەگەڵ دوژمندا جەنگ دەکەین‌و دوور نییە کەسبەینێ بەرەنگاری یەکتر ببین، جا ئەگەر ویستمان ئاژەڵ سەربڕین، چەقۆو کێردی پێویستمان پێ نییە، ئایا بە تەڵەقامیشی تیژو چەقۆی بەردین ئاژەڵ سەربڕین؟

فەرمووی: (گورجبەو دەستوبردی لێ بکەو بەشتی زۆر کول مرداری مەکەرەوە، ئیتر بەهەرچی سەری دەبڕی باشە، بەمەرجێ فیچقە بەخوێنەکە بکاو لەکاتی سەربڕیندا، خوێنەکە پەلەمیزکە ببەستێ، وەناوی خودای لێ ببرێ، وە بەمەرجی ئەوەیش، ئەو شتە کەپێی سەردەبڕێ، ددان‌و نینۆك نەبێ، ئیتر لێی بخوا، چونکە ئەوە حەڵاڵە، پێشت بڵێم کە لەبەرچی دروست نییە کە شت بەددان‌و بەنینۆك سەربڕێ، چونکە ددان ئێسقانەو ئێسقانیش کولەو تیژ نییە، بەزۆری گیانلەبەرەکە مردار دەکاتەوە، نینۆکیش چەقۆی حەبەشییە ناموسوڵمانەکانە، ئەوان دەستووریان وایە، زۆرینەی کات ئاژەڵ بەنینۆك دەخنکێنن‌و دەیخۆن، دەی چاولێکردنیان لەم بێ شەرعییەدا نادروستە).

(ڕوونكردنەوە):

١- لەم جۆرە كاتانەدا، ئەگەر پاش پێكانی ئاژەڵە بەلەسە بووەكە، بە ئاسانیو بەئاسایی دەتوانرا سەربڕێ ئەوە دەبێ بە سەربڕین حەڵاڵ بكرێ، بەڵام ئەگەر مەودای سەبڕین نەبوو، ئەوە پێكانەكەی بریێتی سەربڕینەكەی دەكەوێو بەوە حەڵاڵ دەبێ، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ تیرەكەدا، یان گوللەكەدا ناوی خودای لێ بهێنرێ.

٢- هەندێ شت هەیە، هەڵەیەكی بڵاوە، وەك ملهەڵكێشانی چۆلەكەو شتی وا، كە هەندێ كەس ملی هەڵدەكەنێو دەڵێ لەنێتی چەقۆ، ئەوە نادروستو حەرامە، بەوە حەڵاڵ نابێ.

١٣٦٦- وَعَنْ جَابِرِ بنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يُقْتَلَ شَيْءٌ مِنَ اَلدَّوَابِّ صَبْرًا } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٤٧ = شيحا ٥٠٣٠ = مسلم/١٩٥٩}:

له موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

هیشامی كوڕی زەیدی كوڕی ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی ئەنەسی كوڕی مالیكی باپیرەما چووم بۆ ماڵی حەكەمی كوڕی ئەییوب، ڕوانیمان وا كۆمەڵێ كەس، مریشكێكیان ناوەتەوە بەنیشانەو تیریان تێ دەگرت، ئەو تیرانەی كە لێی نەدەدا، دەیاندا بەخاوەنی مریشكەكە، فەرمووی: جا باپیرەم ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدەدا كە ئاژەڵو گیانلەبەر بنرێتەوە بەنیشانەو لەسەر ئەو شێوەیە بكوژرێت. {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠١، لاپەڕە: ٥٤، ج/٢ + ١٦٠٢/١٣ - ٦٧}.

١٣٦٧- وَعَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَللَّهَ كَتَبَ اَلْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ

فَأَحْسِنُوا اَلْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا اَلذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٢٤٩ = شيحا ٥٠٢٨ = مسلم/١٩٥٥}:

شەددادی کوڕی ئەوس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو شتم لە پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر کردووە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (خودا چاکەی لەسەر هەموو شتێ نووسیوە، وەفەرمانی کردووە کەهەموو شتێ بەڕێكو پێکیو لەسەر شێوەیەکی جوانو ڕەوا بکرێ، جا کەوابوو ئەگەر کەسێکتان لەتۆڵەی کەسێکی کوژراودا کوشتەوە، یا بەحەددی شەرعی کوشتتان، ئەوە لەسەر شێوەیەکی باش بیکوژنەوەو، لەو کاتەدا بەنەزاکەت بن لەگەڵیاو، ئەگەر داوای ئاوو شتێکی کرد لەپێش کوشتنیدا ئەوا بیدەنێو شایەتمانی پێ بهێنن، تا لەسەر ئیسلامەتی بمرێ، وەهەروەها ئەگەر شتێکتان سەربڕی، لەسەر شێوەیەکی باش سەری ببڕن، وە تیغەکەتان تیژ بکەنو پشووی سەربڕاوەکەتان بدەنو زیادە ئازاری مەدەن!). {تاج/٣/١٦، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٥}.

(ڕوونکردنەوە):

یەکەم: ئەم شتانە لەکاتی مردنی کەسێکا یان لەکاتی جێبەجێ کردنی حەددی کوشتنەوەو لەسێدارەداندا، بەکورتی سوننەتن:

١- ئاوو نانداند بەو کەسەی کە دەکوژرێ، یا لەسێدارە دەدرێ، لەپێش کوشتنیدا، وەهەروەها دەم تەڕکردنی کەسێ کە لەگیانەڵادا بێ، هەروا شایەتمان پێیانو بەر لەوەی کە کەسەکە بەحەددی شەرعی بکوژرێ تەوبەی پێ بکرێو بخرێتە سەردەمی کەهەتا دوا هەناسە (لا إلهَ إلا الله) لەسەر زمانی بێت، هەروەها لەم کاتانەدا ڕاسپێری کردنو وەسێت کردن سوننەتە، وەك ئەوە چی خێرێکی بۆ بکەنو قەرزی کێی لەسەرەو قەرزی لەسەر کێیەو

داوای چی دەکاو داوای گەردن ئازادی لەخەڵك‌و فیسارەکەس نوێژی تەرمی لەسەر بکاو فیسارەکەس بیشۆرێ‌و حەج‌و عەمرەی بۆ بکەن‌و نوێژەکانی بۆ بگێڕنەوەو هەروا ڕۆژوو، ئەگەر نوێژ، یان حەج، یان عەمرە، یان ڕۆژوو قەرزار بوو، یان هەروەسیێتێکی تر کە ڕەواو شەرعی بێت.

٢- سوننەتە کە بەپێی بواری گونجاو، ڕێگەی پێ بدرێ کە کەسوکاری خۆی ببینێ‌و لەگەڵیان دابنیشێ، لەپێش کوشتنەوەیدا.

٣- ئەگەر سپاردەیێ، یان نامەیەکی هەبوو بدرێ بەخاوەنی‌و بدرێ بەکەسی پەیوەندیدار.

٤- بەپێی ڕۆژو شوێن، هەوڵ بدرێ کوشتنەوەکەی بەپێی شەرع بێ‌و ئازاری کەم بێ‌و جەستەی نەشێوێنرێ‌و تەرمەکەی بدرێتەوە بەخاوەنی، یان بەکەسوکاری‌و بشۆرێ‌و کفن بکرێ‌و نوێژی مردووی لەسەر بکرێ‌و لەگۆڕستانی موسوڵمانان بنێژرێ، ئەگەر خۆی موسوڵمان بوو، وە سێ ڕۆژ پرسەی بۆ دابنرێ، وە سێ ڕۆژ پرسەو سەرەخۆشی لەکەسوکاری بکرێ‌و دێنی‌و سەردانی گۆڕی بکرێ لە لایەنی کەسوکارییەوە، وە ئەگەر ژنی هەبوو، ژنەکەی چوار مانگ‌و دە شەو ڕەشپۆشی بۆ بگرێ‌و ئازاری هەستی کەسوکاری نەدرێ، بە باسکردنی جۆری تاوانەکەی، بەتایبەتی ئەگەر لەو جۆرە تاوانانە بوو، کەشەرماوەرو شەرمەزارکەر بوون، وەك دزی‌و حیزی، وە ژنەکەی لەماوەی تازێباریدا نابێ تازێ بشکێنێ‌و نابێ لەو ماوەیەدا شوو بکاتەوە، یان خۆی بڕازێنێتەوە، ئەگەر ژنەکەی سکی هەبوو، هەتا سکەکەی دادەنێ تازێ نەشکێنێ‌و شوو نەکاتەوە.

**کورت‌و پوخت:** (ئەوەی کە بۆ مردووی ئاسایی، پێویستە بکرێ، یان سوونەتە بکرێ، بۆ کوژراوی بەداری حەددیش، پێویستە بکرێ، یان سوننەتە بکرێ). تەنانەت دروستە کە کەسوکاریان مزگەوت بەناویان بکەن، یان بیرو باخ‌و شتی وایان بۆ وەقف بکەن.

٥- ئەو کەسەی دەکوژرێ، یان لەسێدارە دەدرێ، یان گوللەباران دەکرێ، لەپێش جێبەجێ کردنی کوشتنیدا، یان لەسێدارەدانیدا، یان لەپێش گوللەبارانیدا، سوننەتە ڕێگەی پێ بدرێ، کە دوو رکات نوێژی سوننەتی سەرەمەرگ بکات.

بۆ باسی ئەم نوێژی سەرەمەرگە بڕوانە: {تاج/٤، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٤٦٤٣}.

٦- بەشێوەی کۆگیرێکی گشتی: هەموو کەسێ کە دەمرێ، یان دەکوژرێ، یان لەسێدارە دەدرێ، یان لەبەر هەر هۆیەك دەمرێ، وەك ئەوەی خۆی خۆی بکوژێ، یان کەسێ تر، بەهەق، یا بەناهەق دەیکوژێ، یان بەدەردی خودا دەمرێ، ئەمانەی سەرەوەی بۆ دەکرێ، منالّ بێ، یان گەورە بێ، ژن بێ یان پیاو، نێر بێ، یان مێ، یان نێرومێ بێ، بەمەرجێ موسوڵمان بێ، شەهیدی مەعرەکەی بێباوەڕان نەبێ، کەشەهید واباشە بەجلەکانی خۆیەوە بنێژرێ، بەلاّم موسوڵمانێ بەحەددی هەڵگەڕانەوە لەئیسلام بکوژرێ، نە دەشۆرێ، نەکفن دەکرێ، نە پرسەی بۆ دادەنرێ، نە لەگۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێ، نە خێری بۆ دەکرێ، بەلاّم دەکرێ بەژێر خۆڵەوە لەجێگەیەکی شیاودا، بۆ پێشگیری لەرووداوی ناشیاو، وەك بۆگەنو داکەوتنی پەتا.

٧- هەرکەسێ بە موسوڵمان ناسراو بێ، وەك ئەوە لە دایكو باوکێکی موسوڵمان بووبێ، یان لەپێناسەو ناسنامە فەرمیەکەیدا، بە موسوڵمان لەقەڵەم درابێ، ئەوە لەم دوو کاتەدا، بڕیارەکانی موسوڵمانانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، با کەسێکی زۆر خراپو باوەڕ خراپ بێ.

یەکەم: لەژیانیدا، ژنی لێ مارە دەکرێ، سەرفیترەی بۆ دەدرێ، تەلاّقی دەکەوێ، سوێندی دەکەوێ، سەوداو مامەڵەو شایەتیدانی دادەمەزرێ، مامەڵەی موسوڵمانی بۆ دەکرێ، لەهەموو روویەکەوە.

دووەم: لەپاش مردنیش بە موسوڵمان دائەنرێو ئەو شتانەی کە بۆ مردووی موسوڵمان دەکرێ، بۆ ئەویش دەکرێ، گەرچی لەژیانیدا سەربەلایەنێکی زەندیق بووبێ، چونکە وەك مەولەوی دەفەرموێ:

راستە کرداری قیزاوی زۆر کرد

بەڵام چووزانی: ئیمانی نەبەرد!!

مەڵێ: کرداری لەکەرێتی فوول

پەنهانە ئیمان، ڕازێکە مەجهوول!!

ئەوەندە هەیە: هەرکاتێ بەپێی شەرع چەسپا کە موسوڵمانێ کافر بووە، وەك ئەوە بووە بەگاورو جاڕی گاوری خۆی داوەو صەلیب هەڵدەگرێو لەناسنامەکەی نووسراوە: ئایین گاور، یان قازیو دادگای شەرعی بڕیاری إرتدادی بەسەردا چەسپاندووە ئەوە بە زەندیق دادەنرێو مامەڵەی زەندیقی بۆ دەکرێ وەك لەپێشەوە باس کرا، لە بڕگەی شەشدا، کەوا لەپێش ئەم بڕگەیەوە.

دووەم: شەددادی کوڕی ئەوسی کوڕی ثابیتی ئەلخەزرەجی، برازای حەسسانی کوڕی ثابیتە، خۆیو ئەوسی باوکی، موسوڵمان بوون، باوکی ئامادەی جەنگی بەدر بووە، لەئوحوددا شەهید بووە، پیاوێکی زاناو دانا بوو، لەشام نیشتەجێ بوو، تا بڵێی قسەزانو ڕەوانبێژ بوو، لەکاتی توڕەبووندا، ڕقی خۆی قووت ئەدایەوە، شەدداد لە زانایانی هاوەڵانی پێغەمبەر بوو، شامییەکان فەرموودەکانی ئەو دەگێڕنەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی پێ دەدا: (کە خۆیو منداڵەکانی دەبن بەپێشەوایانی خەڵکی شام). لەسەردەمی موعاوییەدا، لەتەمەنی (٧٥) حەفتاو پێنجساڵیدا، لەفەلەستین دەمرێ، لەساڵی (٥٨) پەنجاو هەشتی کۆچیدا، لەبەیتولمەقدیس نێژراوە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە شەددادو لەباوکیو لەهەموو هاوەڵان بێ).

١٣٦٨- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "ذَكَاةُ اَلْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ" } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٣٤٣١}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێ دەکەوێ کە وشتری مێنگەو مانگاو مەڕو بزنو شتی تری وا، سەردەبڕین، بەچکەیان وا لەناوسکدا، ئایا ئەو بەچکانە فڕێ بدەین یان بیانخۆین؟ فەرمووی: (ئەگەر ئارەزوو دەکەن بیانخۆن، چونکە سەربڕینی دایکەکەیان بڕێتی سەربڕینی ئەوانیش دەکەوێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٢٥٩٩ — د/ئەحمەد/ ترمذی — سند حسن}.

(ڕوونکردنەوە):

١- گەلێ جار کەمریشكو باڵندە سەردەبڕدرێ، ولەو هێلکە وا لە گەرادانیدا، ئەوە ئەو ولەو گەراو هێلکانە حەلاڵنو دەخورێن.

٢- کاتێ ئاژەڵێ، یان گیانلەبەرێ سەردەبڕێ، ئەگەر بەچکەکەی لەناو سکیدا مردبوو، ئەوە پێویست بەسەربڕینی ناکاو ئەو بەچکەیە لەهەر تەمەنێکا بێ حەلاڵەو دەخورێ.

٣- ئەگەر بەچکەکەی بەزیندوویی لەناو سکی دەرهێنرا، ئەوە دەبێ سەرببڕێ، دەنا خواردنی گۆشتەکەی نادروستە.

٤- جۆرێ لە گیانلەبەرانی ئاوی، کەڕاودەکرێن، هێلکەو گەراو بەچکە وا لەناو سکیاندا، وەك جۆرێ لە ماسیو نەهەنگ، ئەوە نەخۆیانو نە بەچکەی ناوسکیان پێویستی بەسەربڕین نییە.

١٣٦٩- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {" اَلْمُسْلِمُ يَكْفِيهِ اِسْمُهُ، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يُسَمِّيَ حِينَ يَذْبَحُ، فَلْيُسَمِّ، ثُمَّ

لِيَأْكُلْ"} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَفِي إِسْنَادِهِ مُحَمَّدُ بنُ يَزِيدَ بنِ سِنَانٍ، وَهُوَ صَدُوقٌ ضَعِيفُ اَلْحِفْظِ.:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆ سەربڕینی شەرعی ئاژەڵو حەڵاڵبوونی گۆشتەکەی ئەوەندە بەسە، بۆ سەربڕ کەناوی موسوڵمانە، جا ئەگەر دنیابوو لەبیری چوو، کاتێ شتێ سەردەبڕی (بِسْمِ الله) بکا، با لەوەدوا (بِسْمِ الله) بکا، ئیتر لەگۆشتی سەربڕاوەکەی بخوات).

(ڕوونکردنەوە):

١- بەپێی ئەم فەرموودەیە، مەرجی سەربڕ تەنیا ئەوەیە کە موسوڵمان بێ، هەر گیانلەبەرێ گۆشتی بخورێ، موسوڵمان سەری ببڕێ، با (بسمِ الله)یش نەکا گۆشتەکەی حەڵاڵەو سەربڕینەکەی تەواوە.

٢- جۆری ناوهێنانی خودا، لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا، سوننەتە ئاوابێ (بِسْمِ اللهِ وَاللّهُ أَكْبَرُ) یا بڵێ: (بِاسْمِ اللّهِ) وە ناوهێنانی خودا لەم کاتەدا مەرج نییە هەر بە عەرەبی بێ، بەکوردی، یا فارسی، یا تورکی، یا ئینگلیزیش دەبێ، بۆ نموونە ئەگەر سەربڕ لەکاتی سەربڕیندا بەکوردی بڵێ: (بەناوی خودا، یا بڵێ: (بیسمیللا) دەبێو دروستە، بەڵام نزاو دوعاو سوپاسو زیکر بە دەقە عەرەبییەکە بێ باشترە کەپێی دەگوترێ: (الذكر بالمأثور).

١٣٧٠ - وَأَخْرَجَهُ عَبْدُ اَلرَّزَّاقِ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ إِلَى اِبْنِ عَبَّاسٍ، مَوْقُوفًا عَلَيْهِ.

بەپێی دەقی ئەم ژمارەیە بێ ئەم فەرموودەیە قسەی ئیبنو عەباسە، مەرج نییە کە قسەی پێغەمبەر بێ.

١٣٧١ - وَلَهُ شَاهِدٌ عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ فِي "مَرَاسِيلِهِ" بِلَفْظِ: { "ذَبِيحَةُ اَلْمُسْلِمِ حَلَالٌ، ذَكَرَ اِسْمَ اَللَّهِ عَلَيْهَا أَوْ لَمْ يَذْكُرْ" } وَرِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ.

{ضعيف الجَامِعِ: ٣٠٣٩}:

**دانەر دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی تری هەیە، کەدەبێ بەشایەتی دروستی ئەم فەرموودەیە، کە ئەبو داوود، لەپەڕاوی (مَرَاسِيلُ أَبِي دَاوُدَ)دا گێڕاویەتیەوە، بەم لەفظە:**

**(راشیدی کوڕی سەعد دەڵێ: سەربڕاوی موسوڵمان حەڵاڵە، چی ناوی خودای لێ بهێنێ، وەچی ناوی خودای لێ نەهێنێ!).**

## ٨٦- باسی قوربانی
## بَابُ: الأَضَاحِي

**{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٦٧ هەتا زنجیرە: ٣٧٥ لە لاپەڕە: ٩٩١وە هەتا لاپەڕە: ١٠١٣ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ١٣٥، زنجیرە: ٧٦، لە ژمارە: ١٨٣٨وە هەتا ژمارە: ١٨٣٩ + مختصر صحيح مسلم/٣، لاپەڕە: ٣٠٨ چاپی یەکەم، زنجیرە: ٣٦، لە ژمارە: ٩٩٦وە هەتا ژمارە: ١٢٦١ + تاجول ئوصول/٣، لاپەڕە: ١٩٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٦ هەتا لاپەڕە: ٢٤٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٣٧٦١ + ریاضی صالحين/٢، زنجیرە: ١١١ هەتا زنجیرە: ١١٦ لە ژمارە: ٧٥٧وە هەتا ژمارە: ٧٧٨، زنجیرە: ١١٦}.**

١٣٧٢- عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ، أَقْرَنَيْنِ، وَيُسَمِّي، وَيُكَبِّرُ، وَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا. وَفِي لَفْظٍ: ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي لَفْظٍ: {سَمِينَيْنِ} وَلِأَبِي عَوَانَةَ فِي "صَحِيحِهِ" : {ثَمِينَيْنِ}. بِالْمُثَلَّثَةِ بَدَلَ اَلسِّينِ وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ، وَيَقُولُ: {بِسْمِ اَللَّهِ. وَاَللَّهُ أَكْبَرُ}.

{بخاري. أضاحي/٥٥٥٨، ٥٥٦٥. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٥٦ = شيحا/٥٠٦١ = مسلم/فؤاد/١٩٦٦. نسائي. ضحايا/٤٤٢٧. ابن ماجة. أضاحي/٣١٢٠. تحفة الأشراف/١٢٥٠}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: ڕۆژی جەژنی قوربان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوو بەرانی تەوی شاخداری کرد بەقوربانی، بەدەستی خۆی سەری بڕین، فەرمووی: وە ناوی خودای هێناو ئەڵڵاهوئەکبەری کرد بەم شێوەیە: (بِاسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) وەقاچی ڕاستی دانا لەسەر لاملیان، وەلەسەر لای چەپ پاڵی خستن و بەدەستی چەپی سەری بەرانەکانی گرت و بەدەستی ڕاستی چەقۆکەی گرت، ئەنجا سەری بڕین. {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٣} .

(ڕوونکردنەوە):

١- زاناکان دەفەرموون: ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

آ- بەران کردن بەقوربانی باشترە لەمەڕ، واتە: بەشێوەی گشتی نێر لەمێ باشترە بۆ قوربانی.

ب- هەتا قەڵەوتر بێ خێرترە، چونکە لەهەندێ گێڕانەوەدا: (دوو بەرانی قەڵەوی کرد بەقوربانی).

ج- ئەو شتەی کە دەکرێ بەقوربانی بەهادار بێ، چونکە لەهەندێ گێڕانەوەدا دەفەرموێ: (ثمینین = دوو بەرانی بەنرخ).

١٣٧٣- وَلَهُ: مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)): { أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ، يَطَأُ فِي سَوَادٍ، وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ، وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ" لِيُضَحِّيَ بِهِ، فَقَالَ: "اِشْحَذِي اَلْمُدْيَةَ" ، ثُمَّ أَخَذَهَا، فَأَضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ، وَقَالَ: "بِسْمِ اَللَّهِ، اَللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ" } .

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٥٧ = ٥٠٦٤ شيحا = مسلم فؤاد: ١٩٦٦، ١٩٦٧}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەرانێکی شاخداریان بۆ هێنا، کە بیکا بەقوربانی،

هەرچوار پەل‌و دەموچاوو ژێرسكی بەرانەكە، بۆرەلووكێكی ڕەشباو بوو، فەرمووی: ئەی عائیشە! كێردەكە بهێنە، بەهەسانێ، بە بەردێ تیژی بكە، منیش فەرمانەكەیم بەجێ هێناو وام كرد، ئینجا كێردەكەی هەڵگرت‌و بەرانەكەی پاڵ خست‌و سەری بڕی‌و لەكاتی سەربڕینەكەدا فەرمووی:

{بسمِ اللّٰهِ اللّٰهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مَحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ} . واتە: (بەپیرۆزیی ناوی خودا، ئەی خودایە! ئەی پەروەردگارم! ئەم قوربانییە قەبووڵ بفەرموو لە موحەممەدو لەخانەوادەی موحەممەدو لەگەلی موحەممەد). ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە بەرانەكەی كرد بەقوربانی.

(ڕوونكردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: كە موسوڵمان لەپاش ئەوە كە كارێكی خێر ئەنجام دەدا، وەك ئەوە قوربانییەك دەكا، یان خەتمەیەكی قورئان دەكا، موسوڵمانێ تریش لەپاداشەكەیدا بكا بەهاوبەش. تەماشای (فتح الملهم شرح صحيح مسلم) بكە، (ژمارە: ٥٠٦٤) هەروەها بڕوانە: (مختصر صحيح البخاری المسَمىٰ بالتجريد الصريح – الترجمة الكردية، المجلد لأول – لاپەڕە: ١٨٤).

ڕوونكردنەوەی فەرموودەی ژمارە: (١٥٩ = بخاری/٢١٦ وَأَطْرَافُهُ).

٢- پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: هەموو جارێ، كەسێ كە دەیەوێ گیانلەبەرێ سەر ببڕێ، با لەپێشا ئاژەڵەكە، یا پەلەوەرەكە، بەرەو ڕووگە، لەسەر لای چەپ پاڵ بخات، ئەگەر بزن‌و مەڕو شتی تری وابوو، سەری ئاژەڵەكە بەدەستی چەپی بگرێ وەقاچی ڕاستی دابنێ لەسەر لاملی لای ڕاستی، لەكاتی دەستكردن بەسەربڕینی، ناوی خودا بهێنێ‌و باش وایە كە بڵێ: (بسمِ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أكبرُ). وە بەجوانی سەری ببڕێ بەچەقۆیەكی تیژ، هەتا زیادە ئازاری نەدات. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٢٦١٦} .

٣- جێگەی داخە کە ئەمڕۆ بەناوی سەلەفییەتەوە ئیسلام ناشیرین دەکرێو رووە جوانەکەی دەشێوێنرێ، نرخو بایەخو بەها بۆ هیچ سەرچاوەیەکی مەزهەبی ئیسلامی نەماوە، مەگەر بۆ حەزبەنەو مەزبەنە، بۆئەوەی کەتۆ بیسەلمێنی کە سەلەفیت، دەبێ هەرچی راو بۆچوونو قسەی سەلەفی صالح هەیە، تۆ هەمووی بە بیدعە بزانی، ئەمە دروشمی ئەم سەلەفییانەی ئاخرزەمانە:

(هەرچی مەزهەبەکان دەیلێن، تۆ پێچەوانەکەی بگرە).

جا من لەبەرئەوەی کە ئەم پەڕاوە، پەڕاوی بڕیارە شەرعییەکانە، وەبۆ سوودو بەرژەوەندی خەڵکە پەرۆشەکە بۆ ئەم بابەتە گرنگە، لەپەڕاوی (سُبُلُ السَّلامِ شَرْحُ بُلوغِ المَرَامِ)ەوە، ئەم دەقە بە عەرەبی راگوێز دەکەم، هەتا بزانرێ، کە بەخشینی پاداشی کاری باش، بە موسوڵمانی تر، قەولی راجحەو گوتەی پەسەندە، ئەمەیش ئەو دەقەیە، کە شارح ئیمامی صەنعانی دەفەرموێ:

(وَفِيهِ إِشَارَةٌ إِلى أَنَّ الإنْسَانَ يَنفَعُهُ عَمَلُ غَيْرِهِ.. إنَّ الأَدْعِيَّةِ وَنَحْوَهَا نَافِعَةٌ لِلْمَيّتِ بِلاَ خِلاَفٍ، وَأَمَا غَيْرُهَا مِنْ قِرَاءَةِ القُرْآنِ لَهُ، فالشَّافِعِيُّ يَقُولُ: (لاَ يَصِلُ ذلِكَ إِلَيْهِ، وَذَهَبَ الإمامُ أَحمدُ وَجَمَاعَةٌ مِنَ العُلَمَاءِ إِلى وصُولِ ذلِكَ إِلَيْهِ. وَذَهَبَ جَمَاعَةٌ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَ الحَنَفِيَّةِ إِلى أَنَّ لِلإِنْسَانِ أَنْ يَجْعَلَ ثوابَ عَمَلِهِ لِغَيْرِهِ، صَلاَةً كَانَ أَوْ صَوْماً، أَوْ حَجّاً أَوْ صَدَقَةً أَوْ قِرَاءَةَ قُرْآنٍ أَوْ ذِكْرٍ، أَوْ أَيَّ أَنْوَاعِ القُرَبِ.

هَذَا هُوَ القَوْلُ الأَرْجَحُ دَلِيلاً، وَقَدْ أَخْرَجَ الدَّارَقُطْنِيُّ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَيْفَ يَبِرُّ أَبَوَيْهِ بَعْدَ مَوْتِهِمَا، فَأَجَابَهُ: بِأَنَّهُ يُصَلِّي لَهُمَا مَعَ صَلاَتِهِ وَ يَصُومُ لَهُمَا مَعَ صِيامِهِ).

وَأَخْرَجَ أَبودَاوُدَ مِنْ حَدِيثِ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ عنه (صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّمَ): (اقْرَءُوا عَلَى مَوْتَاكُمْ يس). وَهُوَ شَامِلٌ للمَيّتِ، بَلْ هُوَ الحَقِيقَةُ فِيهِ. وَأَخْرَجَ

الشَّيْخَانِ: (أَنَّهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيه وَسَلَّمَ) كَانَ يُضَحِّي عَنْ نَفْسِهِ بِكَبْشٍ وَعَنْ أُمَّتِهِ بِكَبْشٍ). وَفِيهِ إِشَارَةٌ إِلى أَنَّ الإِنْسَانَ يَنفَعُهُ عَمَلُ غَيْرِهِ...).

جا ئەوەی لەم پوختەی رای زانا گەورەکانی یاسانامەی ئیسلام وەردەگیرێ ئەمەیە: {بڕوانە: ژمارە: ١٤٠٤}:

١- نزاو پاڕانەوەو نوێژو رۆژوو وحەجو عەمرە، سوننەتە قەزا بکرێنەوە بۆ مردوو، یا دروستە کەبۆ مردوو بکرێن، وەك ئەوە بچێ بۆ حەج یا بۆ عەمرەو بڵێ نێتمە حەجێ بۆ باوکم دەکەم، یا عەمرەیەك بۆ دایکم دەکەم، وە هەروەها سوننەتە وەقفو خێرو صەدەقە بۆ مردوو بکرێو سڵاو لەگۆڕی بکرێو نزای باشی بۆ بکرێو ناوی بە باشە ببرێو لەپاش مەرگی شایەتی باشیی بۆ بدرێ، وە لەپاش مەرگی باسی خراپەی نەکرێ (بۆ بەڵگەی ئەم بابەتانەی لەم بڕگەیەدا باسکران، بڕوانە: {تەجرید/٥، ژمارە: ٢٠٥٥ + تاج/١، زنجیرە: ١٩٢ لە ژمارە: ١٠١٤وە هەتا ژمارە: ١٠١٨ + زنجیرە: ١٩٩، ژمارە: ١٠٤٦، ١٠٤٧، ١٠٤٨ + زنجیرە: ٢٠٧، ژمارە: ١٠٨١ هەتا ژمارە: ١٠٨٤ + زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٥، ١٠٨٨، ١٠٨٩، ١٠٩٠، ١٠٩١، ١٠٩٢ + زنجیرە: ٢١٢، ژمارە: ١١٠١، ١١٠٢ + زنجیرە: ٢١٤ + زنجیرە: ٢١٤، ژمارە: ١١٠٦، ١١٠٧ + زنجیرە: ٢١٥، ژمارە: ١١٠٩ و ١١١٠ + زنجیرە: ٢٢٥، ژمارە: ١١٥٥ + زنجیرە: ٢٢٦ + زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٢، ١١٦٣، ١١٦٥ + زنجیرە: ٢٢٩، ژمارە: ١١٦٨، ١١٦٩، ١١٧٠، ١١٧١ + زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٣٤و ١٣٥ + زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٥٢ + بەرگی دووەم تاجول ئوصول زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥، ١٤٨٦ + تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ١٤٨٨، ١٤٨٩، ١٤٩٠} + {مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠١، ١٠٠٣ + زنجیرە: ٧٨٥، لاپەڕە: ٢١٢ = ژمارە: ٥٣٢، ٥٣٣، ٦٠٥، ٤٩٧...تاد}.

وەهەروەها بڕوانە: {مختصر صحیح مسلم/٣، زنجیرە: ١٠٠٦، ژمارە: ١٢٦١ هەتا کۆتایی روونکردنەوەکە}.

١٣٧٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنْ كَانَ لَهُ سَعَةٌ وَلَمْ يُضَحِّ، فَلَا يَقْرَبَنَّ مُصَلَّانَا" } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ مَاجَه، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، لَكِنْ رَجَّحَ اَلْأَئِمَّةُ غَيْرُهُ وَقْفَهُ.

{حسن، صحيح ابن ماجة/٢٥٣٢. أحمد/٢/٣١٢. ابن ماجة/٣١٢٣. حاكم/٤/٢٣٢}:

ئەبو هورەیره (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ توانای قوربانی هەبێو قوربانی نەکا، با نزیکی مزگەوتەکەمان نەکەوێ!).

١٣٧٥- وَعَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {شَهِدْتُ اَلْأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ بِالنَّاسِ، نَظَرَ إِلَى غَنَمٍ قَدْ ذُبِحَتْ، فَقَالَ: "مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ اَلصَّلَاةِ فَلْيَذْبَحْ شَاةً مَكَانَهَا، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ ذَبَحَ فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اَللَّهِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بخارى. عيدين/٩٨٥، ٥٥٠٠، ٥٥٦٢، ٦٦٧٤، ٧٤٠٠. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٥٢ = شيحا/٤٠٣٧. مسلم/فؤاد/١٩٦٠. نسائى. ضحايا/٤٣٨٠، ابن ماجة. أضاحى:٣١٥٢. تحفة الأشراف/٣٢٥١}:

جوندوبی کوڕی سوفیان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان، لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، هەرکە لە نوێژی جەژن بوویەوە، یەکسەر بەبێ دواکەوتن سڵاوی دایەوە، کەچی چاوی بەگۆشتی قوربانی کەوت، کە بەرلەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر نوێژیی نوێژی جەژن ببێتەوە، سەربڕابوون، فەرمووی: (هەرکەسێ قوربانی سەربڕێ پێش ئەوە کە نوێژی جەژنی کردبێ، با لەجێگەی ئەوە ئاژەڵێ تر سەربڕێ) یان فەرمووی: (بەرلەوە کە ئێمە نوێژی جەژنمان ئەنجام دابێ، با لەباتی ئەوە قوربانییەکی

تر بكا، بەڵام ئەوەی کەهەتا دوا تەواو بوونی نوێژی جەژن سەری نەبڕیوە، باناوی خودای لێ بێنێو سەری ببڕێ).

(ڕوونکردنەوە):

١- لەمەزهەبی وڵاتی کوردەواری خۆمانا، کە مەزهەبی ئیمامی شافیعییە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کاتی قوربانی دەست پێ دەکا، لەپاش خۆرکەوتنی یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانو تێپەڕبوونی ئەوەندە کە بەشی کردنی نوێژی جەژنو دوو وتار بکا، وە هەتا ڕۆژی چوارەمی جەژنی قوربان، کاتەکەی بەڕۆژو بەشەو بەردەوامە، هەتا بانگی شێوانی شەوی چواردەی مانگ، ئیتر لەوکاتەدا نوێژی جەژن کرابێ، یا نەکرابێ، شاربێ یا گوندبێ جیاوازیی نییە.

٢- جوندوبی کوڕی سوفیان، ناوی تەواوی جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سوفیانی بەجەلییە، بەدوو شێوە گێڕانەوەی لێوە دەکرێ: جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵا بەناوی باوکیەوە، جوندوبی کوڕی سوفیان بەناوی باپیریەوە، لە کۆفە دادەنیشت، لەپاشا لە بەصرە، ناوداربوو بە جوندوبی خێر. لەبوخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، لە موسلیما دیسان فەرموودەی هەیە، لە هاوەڵە پاشینەکانی پێغەمبەرە، خۆی دەفەرموێ: بەسەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من جەهێڵێکی تەواو بووم، هەوەڵی دەمم بوو). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٥٤ = بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٢٨٥ + موختەصەری صەحیحی موسلیم/٣، ژمارە: ٨}.

١٣٧٦- وَعَنِ اَلْبَرَاءِ بنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: { "أَرْبَعٌ لَا تَجُوزُ فِي اَلضَّحَايَا: اَلْعَوْرَاءُ اَلْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ اَلْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ اَلْبَيِّنُ ظَلْعُهَ وَالْكَسِيرَةُ اَلَّتِي لَا تُنْقِي" } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ. وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّان.

{صحيح، إرواءُ الغليل/١١٤٨. مسند/٤/٢٨٤. أبو داود/٢٨٠٢. ترمذی/١٤٩٧. نسائی/٢١١٥. ابن ماجة/٣١٤٤. ابن حبان/٥٩١٩. حاكم/١/٦٤٠}:

بەڕائی کوڕی عازیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم لە تەنیشتی پێغەمبەرەوە دانیشتبووم، تەماشام کرد پەنجەو سەرپەنجەکانی من کورتترن لە پەنجەو سەرپەنجەکانی ئەو، لەوکاتەدا هەڵسایەوە وتارێکی بۆماندا، فەرمووی: ئەم چوار شتەبەکاری قوربانی نایەن: ئاژەڵی کوێری دیاری‌و ئاژەڵی نەخۆش کە نەخۆشییەکەی پێوە دیاربێ‌و ئاژەڵی شەلی تەواو لەنگ‌و ئاژەڵی لەرك‌و لاوازی بێ مۆخ). {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٩}.

١٣٧٧- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "لَا تَذْبَحُوا إِلَّا مُسِنَّةً، إِلَّا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ اَلضَّأْنِ" } رَوَاهُ مُسْلِمُ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٥٤ = شيحا/٥٠٥٥ = مسلم، فؤاد/١٩٦٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاژەڵی سەرە بکەن بە قوربانی، بەڵام ئەگەر دەستتان نەدەڕۆیشت کاوڕو گێسکیش بکەن بەقوربانی!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٦}.

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی مەزهەبی ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) (جەزەعە) لەبزنا ئەوەیە: کە ساڵێکی تەواوکردبێ‌و پێی نابێتە دوو ساڵ، گێسك بەم واتایە، لەلای شافیعییەکان بەکۆی دەنگ، دەست نادات بۆ قوربانی.

(جەزەعە) لەمەڕدا، ئەوەیە کە یەك ساڵی تەواو کردبێ‌و پێی نابێتە ساڵی ددووەم، کاوڕ بەم واتایە، لەلای شافیعییەکان دەست دەدات بۆ قوربانی

بـەكۆی دەنـگ. واتـە: بـزن كاتـێ دەسـت دەدات بـۆ قوربـانی كـە دوو سـاڵی تەواوكردبێو پێی نابێتە ساڵی سێیەم یا لـەوە بەتەمـەنتربێت، مـەڕیش كاتـێ دەست دەدا بۆ قوربانی كە ساڵێكی تەواو كردبێو پێی نابێتە سـاڵی دووەم، یـا لەوە گەورەتر بێ بە تەمەن.

١٣٧٨- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { أَمَرَنَا رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ نَسْتَشْرِفَ اَلْعَيْنَ وَالْأُذُنَ، وَلَا نُضَحِّيَ بِعَوْرَاءَ، وَلَا مُقَابَلَةٍ، وَلَا مُدَابَرَةٍ، وَلَا خَرْمَاءَ، وَلَا ثَرْمَاءَ" } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَة. وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّـانَ، وَالْحَاكِمُ.

{ضـعيف، المـشكاة/١٤٦٣. أبـو داود/٢٨٠٤. ترمـذى/١٤٩٨. نسائى/٢١٧/٧. ابن ماجة/٣١٤٢}:

عـەلی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان كـردووە: كـە بەباشـی سـەرنجی چـاوو گـوێی ئـەو ئاژەڵە بدەین، كە دەمانەوێ بیكەین بە قوربـانی: ئـاژەڵی یەكەڵەچاو نەكـەین بە قوربانی، هەروا ئاژەڵێ گوێچكەی لەپێشەوە لەباری پـانی هەڵدڕاو نەكـەین بە قوربانی، هەروا ئاژەڵێ گوێچەكەی لەباری پانی لەدواوە هەڵدڕابێ نەكـەین بە قوربانی، هەروا ئاژەڵی ددان كەلیش نەكـەین بـەقوربانیو ئاژەڵـێ نەكـەین بە قوربانی كە ددانـی كەوتبێ). (ئـەم وەرگەڕانـە بـەپێی شـەرحی (فتح ذى الجَلاَلِ والإكرام بشرح بُلُوغِ المَرَام)ە. بەڵام ئەم فەرموودەیە لە تـاجول ئوصـول دا ئاوا كراوە بەكوردی:

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمانی پـێ كـردین، كـە سـەرنجی چـاوو گوێچكەی قوربـانی بـدەین، وە ئـاژەڵی كـوێرو قـوتو كەڕیلـەو گـوێ كـون تـێ بـوو، وە گـوێ داقەڵەشـاویش نەكـەین بـە قوربـانی. گـوتم: ئـاژەڵی قـوت كامەیـە؟ گـوتی: ئەوەیـە كەسـەری گوێچكەی قرتابـێ، گـوتم: ئـەی كەڕیلـە كامەیـە؟ گـوتی: ئـەوەتا كـە لـەبنا

گوێچکەی خرپ کرابێ. گوتم: ئەی گوێ داقەڵشاو کامەیە؟ گوتی: ئەوەیە کە گوێچکەی تابن داتلێشابێ، گوتم: ئەی گوێ کون تێ بوو کامەیە؟ گوتی: ئەوەیە کەبۆ نیشانەو دیاری کردن، گوێی دەسمن، یا یەکێ لەمانەی کە گوتمان دەیکەن لەگوێی بۆ نیشانەی ناسینەوە). {تاجول ئوصول، بەرگی سێیەم لاپەڕە: ١٨٦، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٣٠، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٣٧٩- وَعَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {أَمَرَنِي اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّ أَقْوَمَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أُقَسِّمَ لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلَالَهَا عَلَى اَلْمَسَاكِينِ، وَلَا أُعْطِيَ فِي جِزَارَتِهَا مِنْهَا شَيْئاً} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٨٠١ = ١٧٠٨، ١٧١٦، ١٧١٦م، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٤٢ = شيحا/٣١٦٧ = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/١٣١٧. أبو داود. حج/١٧٦٩. ابْنُ مَاجة. أضاحى/٣١٥٧. تحفة الأشراف/١٠٢١٩}:

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم کرد: کە ڕابوەستم بەسەر وشترە دیارییەکانی بەیتیەوە، کە سەد وشتر بوون، سەرپەرشتیان بکەم، وە گۆشتو پێستەوو جلو کۆپانەکانیان، گشتی ببەخشمەوە، وە هیچیان لێ نەدەم بە قەسابەکە لەباتی کرێی قەسابییەکەی، بەڵام لەجیاتی پشکی ئاسایی قەیناکا کەبەشی قەسابەکە بدەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆمان شتێکی تری دەدەینێ لەباتی قەسابییەکەی!!). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ١٦٠٢ + زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٥}.

١٣٨٠- وَعَنْ جَابِرِ بن عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {نَحَرْنَا مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَامَ اَلْحُدَيْبِيَةِ: اَلْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٧٣٩ = شيحا/٣١٧٣ = ترقيم محمد فؤاد/١٣١٨}:

جـابيرى كـوڕى عەبـدوڵلا (ڕەزاى خـودا لـەخۆىو لـەباوكى بـێ) فەرمووى: لەخزمەت پێغەمبـەردا (دروودى خوداى لەسـەر بێ) دەرچووينو حـەجمان دابەست، پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بێ) فـەرمانى پێمـان كرد: كە هەر حەوت كەسێ، بە هاوبەشى، وشترێ يان ڕەشـە وڵاخـێ، مانگابـێ، يـا گابـێ، لـەباتى ديـاريى (هـەديى) بـەيت سـەربـبڕين). {تـاج/٢، زنجـيرە: ١٠٩، ژمارە: ١٥٩٤ چ/٤}.

## ٨٧- باسى حەوتم
## بَابُ: العَقِيقَةِ

{بڕوانە: تەجريدى بوخارى. بەرگى پێنجەم، لاپـەڕە: ١٠٠، زنجـيرە: ٧٤، لـە ژمـارە: ١٨٢٢وەوە هـەتا ژمـارە: ١٨٢٥ = بوخـارى/٥٤٦٧، ٢٢٢، ٦٠٠٢، ٦٣٥٥ + فيقهـى ئاسـان/٢، لاپـەڕە: ١٠١١ چـاپى ئێـران زنجـيرە: ٣٧٤ + تـاجول ئوصـول بەكوردى، بەرگى سێيەم، زنجيرە: ١١، لە ژمارە: ٢٦٠٤وە هەتا ژمارە: ٢٦١٠}.

١٣٨١- عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَـا)" { أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) عَقَّ عَنْ اَلْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشًا كَبْـشًا } رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ، وَصَـحَّحَهُ اِبْـنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ، وَعَبْدُ اَلْحَقِّ. لَكِنْ رَجَّحَ أَبُو حَاتِمٍ إِرْسَالَهُ.

{صحيح أبي داود: ٢٤٦٦}:

ئيبنـو عـەبباس (ڕەزاى خـودا لـەخۆىو لـەباوكى بـێ) فـەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كاتێ حەسـەن لـەدايك بـوو، بـەرانێكى كرد بە حـەوتم بـۆى، وەكـاتێكيش حوسـەين لـەدايك بـوو، بـەرانێكى كـرد بـە حەوتم بۆ ئەويش). {تاج/٣، زنجيرە: ١١، ژمارە: ٢٦٠٧ — د/ت/ن- سند حسن}.

١٣٨٢- وَأَخْرَجَ اِبْنُ حِبَّانَ: مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ نَحْوَهُ.

{صحيح ابن حبان/٥٣٠٩}:

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، کە دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژەی بۆ دەکا:

قەتادە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ حەسەنو حوسەین لەدایك بوو، هەریەکی سەرو بەرانی بۆ کردن بە حەوتم). {صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان – باب العقيقة}.

١٣٨٣– وَعَنْ عَائِشَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)): { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَهُمْ" أَنْ يُعَقَّ عَنْ اَلْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنْ اَلْجَارِيَةِ شَاةٌ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{صحيح، إرواء الغليل للألباني/١١٦٦}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە هاوەڵانی کرد کەبۆ کوڕ دوو مەڕ، یا دوو بەران، یا دوو بزن، یا دوو سابرێن کە هاوتای یەکتری بن، لە تەمەنو قەڵەویو باشیدا، بکرێن بە حەوتم، بۆ کچیش مەڕێ، یا بەرانێ، یا بزنێ، یا سابرێنێ بکەن بە حەوتم!). {فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ١٠١٢، زنجیرە: ٣٧٤ + تاج/٣، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٢٦٠٥}.

لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

ئوم کورزی ئەل‌کەعبییە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دوو مەڕ یان دوو بزن، کە بۆ قوربانی دەست بدەن، دەکرێن بەحەوتم بۆ کوڕ، وەکچیش یەك مەڕ، یان یەك بزن دەکرێ بەحەوتم بۆی.

١٣٨٤– وَأَخْرَجَ اَلْخَمْسَةُ عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ نَحْوَهُ.

{صحيح الجامع: ٤١٠٥}:

دەقی ئەم ژمارەیە وا لەکۆتایی ژمارە: (١٣٨٣)دا.

١٣٨٥- وَعَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {"كُلُّ غُلَامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى"} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح الجامع: ٤١٨٤، الصحيح المسند/٤٥٤}:

**له تاجول ئوصولا ئاوایه:**

**له سەمووڕەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو کوڕێ ڕێگەی نادرێ کە تکاو شەفاعەت بکا بۆ باوکیو دایکی، ئەگەر بەمناڵی بمرێ، هەتا حەوتمی بۆ نەکرێ، هەق وایە کە لەرۆژی حەوتەیدا، حەوتمی بۆ سەربڕنو سەری بتاشنو ناوی بنێن).**

**{تاج/٣، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٢٦٠٦ ج/٤}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- حەوتم کردن بۆ مناڵ کە لەدایك دەبێ سوننەتێکی گەورەیە.**

**٢- هەق وایە لەرۆژی حەوتەیدا حەوتمی بۆ بکەنو سەری بتاشنو ناوی بنێن، ئەگەر لەوە پێشیش بێ، یان لەوە پاشیش بێ دەبێ.**

**٣- ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بەحەوتم، دەبی دەست بدا بۆ قوربانی، واتە: دەبێ لەتەمەنو بێ نەنگیو ساغیدا دەق وەك ئاژەڵی قوربانی وا بێ، هەروا لەهەموو ڕوویەکی ترەوە.**

**٤- ئەو ئاژەڵانەی دەکرێن بەقوربانی تەنیا وشترو ڕەشە وڵاخو بزنو مەڕەو بەس، هی ماڵیان، هی کێویان نابێ، ئیتر لەڕەگەزی نێر بن یا لەڕەگەزی مێ دەبن. گامێشیش بە ڕەشەوڵاخ دادەنرێ، تەنیا ئەم ئاژەڵانەیش بۆ حەوتم دەبنو بەس.**

**٥- بزن، یا مەڕ بۆ یەك حەوتم دەست دەدەن، بەڵام وشترو ڕشەوڵاخ بۆ حەوت کەس دەست دەدەن، وە ئەگەر بۆ یەك مناڵیش بکرێن بەحەوتم**

لەمــەڕێ، یــا لــەبزنێ خێرتــرە، ژمــارەی ئــەو ئاژەڵانــەی دەکــرێن بەحــەوتم، ئەندازە دانەنراوە بۆی.

٦- سوننەتە لەکاتی سەربڕینی حەوتمدا، حەوتمکار، یا سەربڕی وەکیلی بڵێ: {بِـسمِ اللّـهِ اللّهُـمَّ هَـذا مِنْـكَ وَإِلَيْـكَ. ئـەوجا بڵـێ: ئەمـە حەوتمـە بـۆ فیسارەکەس، ناوی حەوتم بۆ کراوەکە دیاری بکا، وەك ئەوە بڵێ: بِسْمِ الله ئـەم مەڕە دەکەم بەحەوتم بۆ ئەحمەدی کوڕم کە تازە لەدایك بووە} .

٧- سوننەتە لەکاتی گزنگدانی خۆردا حەوتم سەربڕێ.

٨- سوننەتە لەپێش سەربڕینی حەوتمـدا، سـەری مناڵەکە کوڕ بـێ یـان کچ بتاشرێو بکێشرێ بەزێڕ، یان بەزیودا، وە ئەو زێڕە، یان ئـەو زیـوە بـدرێ بەکەسێ کە زەکاتی پێ دەشێ، یان بەهاکەی پێ بدرێ.

٩- سوننەتە بەخورما، یان بەشیرینی تر، مەلاشووی شیرین بکرێ.

١٠- سوننەتە لەکاتی ناوناندا، بانگ بدرێ بەکوێچکەی راسـتیداو قامـەت بکرێ بەگوێچکەی چەپیدا، یا لەپاش لەدایك بوون.

١١- حـەوتم لەشـەرعا ئـەو ئاژەڵەیـە، کـە لـەرۆژی حەوتەمـدا، دەکـرێ بەحەوتم بۆ مناڵی تازە لەدایك بوو، یان لەژیانیـدا لەهـەر تەمـەنێکا بـێ، یـان لەپاش مردن بۆی دەکرێ بەحەوتم.

١٢- سکێ دوانە بێ دوو حـەوتمی بـۆ دەکـرێ، زیـاتر زیـاتری بـۆ دەکـرێ، بەمەرجێ کە لەدایك دەبێ نیشانەی ژیانی پێوە بووبێ، یان لەنۆ مانگ کەمتر نەبووبێ.

١٣- نێرو مێ (واتە: خونثی) بڕیاری کچی هەیە.

١٤- مناڵی زینا حەوتمی بۆ دەکرێ، هەرکەسێ بۆی بکا دەبێ.

١٥- حـەوتم یـەکجار دەکـرێو بـەس، بـەڵام دروسـتە لـەرۆژی حەوتەمـدا دووبارە بکرێتەوە، ئەگەر لەوە پێش بۆی کرابوو.

١٦- مەرج نییە کەیەك سەر ئاژەڵ بکرێ بە حەوتم، دروستە کەسێ دە وشتر، یان بیست گا لە یەك کاتدا بکا بە حەوتم بۆ کچێ.

١٧- بۆ زانینی تەواوی بڕیارەکانی حەوتم بە دوورو درێژی بڕوانە: (تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ١٠٣، چاپی یەکەم، زنجیرە: ٧٤ — نامەی حەوتم — یانێ کەوا لەپاش ژمارە: (١٨٢٥) وە).

## ١٤- نامەی سوێندخواردنو نەزرکردن
## كِتَابُ الأيْمَانِ وَالنُّذُورِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ١٠٢٢، زنجیرە: ٣٧٨ چاپی ئێران هەتا زنجیرە: ٣٨٢ + بڕیاری نەزر = زنجیرە: ٣٨٣ هەتا زنجیرە: ٣٨٦ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣٠٥، ج/١، زنجیرە: ٨٦ — نامەی سوێندو نەزرکردن + تاج/٣، لاپەڕە: ١٢٠، زنجیرە: ١٢٣، لە ژمارە: ٢٤٩٨ هەتا ژمارە: ٢٥٤٨، لە زنجیرە: ١٢٣وە هەتا زنجیرە: ١٣٥ + مختصر صحيح مسلم/٢، لاپەڕە: ٥١٣، زنجیرە: ٧٨٦/٢٣ هەتا زنجیرە: ١٠٠٩ + زنجیرە: ٧٩٢/٢٤، لە ژمارە: ١٠٠٢وەوە هەتا ژمارە: ١٠٢٠}.

١٣٨٦- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، { عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّهُ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ اَلْخَطَّابِ فِي رَكْبٍ، وَعُمَرَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَنَادَاهُمْ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَلَا إِنَّ اَللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاَللَّهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٢٥ = بوخاری/٢٦٧٩، ٣٨٣٦، ٦١٠٨، ٦٦٤٦، ٦٦٤٨. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠١٠ و ١٠١١ = شيحا/٤٢٣٠. أبو داود. أيمان ونذور/٣٢٥٠. نسائي. أيمان ونذور/٣٧٧١. تحفة الأشراف/١٠٥١٨}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشت بە دەستەیێ سوار، عومەریان تیادابوو، لەوکاتەدا عومەر سوێندی بە باوکی دەخوارد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی لێکردن‌و فەرمووی: (هۆشیاربن! کە خودای گەورەو مەزن قەدەغەی کردووە لەئێوە کە سوێند بخۆن بە باوو باپیرتان، وەك ئەوە بڵێن بەسەری بابم، بەگۆڕی بابم، جا ئەوکەسەی کە دەیەوێ سوێند بخوات، یا با سوێند بەخودا بخوا، یا بێ دەنگ بێ‌و سوێند بەشتی تر نەخوات. عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا لەوساوە کە ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، کە ئەمەی قەدەغە کردووە، ئیتر هێشتا نەخۆم سوێندم پێیان خواردووەو نە لەدەمی کەسی تریشەوە سوێندی وام گێڕاوەتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٢٥٠٢ –ش/د/ت/ن = بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داوودو تەرمەزی‌و نەسائی، پڕگۆڕی پیرۆزیان لەنووری خودابێ}.

١٣٨٧– وَفِي رِوَايَةٍ لِأَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَلَا بِأُمَّهَاتِكُمْ، وَلَا بِالْأَنْدَادِ، وَلَا تَحْلِفُوا إِلَّا بِاَللَّهِ، وَلَا تَحْلِفُوا بِاَللَّهِ إِلَّا وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ" }.

{صحيح أبي داود/٢٧٨٤. الصحيح المسند/١٢٩٤}:

لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داوودو نەسائیدا، لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (سوێند مەخۆن بە باو باپیرتان، یا بەدایك‌و نەنکەکانتان، یا بەبت‌و شتی وا کە کردووتانن بە مانەندو هاوەڵ بۆ خودا، سوێند هەر بەخودا بخۆن‌و بەس، بەدرۆیش سوێند بەخودا مەخۆن، بەڵکوو کاتێ سوێند بەخودا دەخۆن، بەڕاستی سوێندی پێ بخۆن).

١٣٨٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { " يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ بِهِ صَاحِبُكَ" }.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ١٠١٥ = شيحا/٤٢٦٠ = ١٦٥٣}:

ئـەبو هـورەيره (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێند بەپێی نیازی سوێندەرە، نەوەك بـەپێی نیازی سوێند خۆر). {تاج/٣، زنجیره: ١٢٨، ژماره: ٢٥١٥}.

١٣٨٩- وَفِي رِوَايَةٍ: { "اَلْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ اَلْمُسْتَحْلِفِ" } أَخْرَجَهُمَا مُسْلِمٌ: دەقی ژماره (١٣٨٨)ە.

١٣٩٠- وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَيْتُ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَـا، فَكَفِّـرْ عَنْ يَمِينِكَ، وَائْتِ اَلَّذِي هُوَ خَيْرٌ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي لَفْظٍ لِلْبُخَـارِيِّ: { " فَائِـت اَلَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ" }. وَفِي رِوَايَةٍ لِأَبِي دَاوُدَ: { " فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ، ثُمَّ اِئْتِ اَلَّذِي هُوَ خَيْرٌ" } وَإِسْنَادُهَا صَحِيحٌ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژماره: ٢٠٤٨ = بوخاری/٦٦٢٢، ٦٧٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧. مختـصر صـحيح مـسلم/٣، ژمـاره: ١٢٠٢ = شـيحا/٤٢٥٧ = محمـد فؤاد/١٦٥٢. صحيح أبي داود: ٢٨٠٦}:

بەشـی یەکـەمی ئـەم فەرموودەیـە لـە (مختـصر صـحيح البخـاری = تەجریدی بوخاری)دا ئاوایە:

ئـەوڕەحمانی کـوڕی سـەمووره (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەوڕەحمان! داوای فەرمانڕەوایی (ئەمارەت = ئـەمیری) مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنـی خۆت فەرمانڕەوایی‌و بەرپرسی‌و دەستەڵات وەربگریت لێت دەبێ بەبار، بـەڵام ئەگـەر بـەبێ ئـەوە کـەخۆت هـەوڵی بـۆ بـدەیت بکرێیـت بـە فـەرمانڕەواو

کارمەند، یا بەسەرکاری سەرکارێ، ئەوا خودا زاڵت دەکا بەسەریداو سەرت دەخا بەسەر ئەو کارەداو بەیاریدەی خودا بەجوانی پێی هەڵ دەستیت.

ئەی ئەوڕەحمان! ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، وە لەپاشا تەماشات کرد کە لەوشتە باشتر هەیە، ئەوە بڕێتی – واتە: کەفارەت –ی سوێندەکەت بدەو، ئەوە بکە کە بەباشتری دەزانی). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٦}.

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٦٧٢٢)ی بوخاریدا:

(سوێندەکەت بخەو ئەوەی کە بەباشی دەزانی ئەوەبکەو بڕێتی (کەفارەت)ی سوێندەکەت بدە).

لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داووددا: (لەپێشا کەفارەتی سوێندەکەت بدەو ئەوجا ئەوە بکە کە بەباشی دەزانی).

(ڕوونکردنەوە):

١- بەپێی ئەم فەرموودەیە هەرکاتێ کەسێ سوێندی خوارد لەسەر شتێ، کە بیکات، یا نەیکات، ئەوە نابێ سوێندەکەی بخات، دەبێ سوێندەکەی بباتە سەر، بەڵام ئەگەر وا بەباشی زانی کە سوێندەکەی بخاتو نەیباتە سەر، ئەوە با کەفارەتی سوێندەکەی بداتو شتەکە کە بەباشی دەزانێ بیکا، یا بەپێچەوانەوە نەیکا.

٢- عەبدوڕەحمانی کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموودەی لە بوخاریو موسلیمدا هەیە، لە مەسلەمەی فەتحە. واتە: ڕۆژوی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بووە، لە فتوحاتی عێراقدا ئامادە بووە، لەسەر دەستی ئەودا سجستان ئازاد کراوە، لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا، هەروا کابل لەسەر دەستی ئەودا غەزاکراوەو ئازادکراوە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا ئامادەی غەزای تەبووك بووە، خۆی فەرموودەی لە پێغەمبەرو لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە گێڕاوەتەوە، ئەم زاتانەیش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە:

ئیبنو عەبباس‌و سەعیدی کوڕی موسەییب‌و محمدی کوڕی شیرین‌و حەسەنی بەصری‌و کەسانی تریش، ساڵی (٥١) پەنجاو یەکی کۆچی لەشاری بەصرە مردووە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٣- داوای فەرمانڕەوایی کاتێ خراپەو ناباشە، کە مرۆڤ بەزۆر بیسەنێ‌و لەدڵەوە مەبەستی ئەوەبێ، کە لەو پلەو پایەیە مەبەستی ماددی‌و دنیایی دەست بکەوێ، وەك بەچاوی سەرو بەچاوی ژیری، لەم رۆژگارەی خۆماندا ئەمە دەبینین، بگرە گیرۆدەیش بووین بەدەست ئەم حاڵەوە، کۆمەڵی دڕندە کە بەزۆری خۆیان، یا بەفڕو فێڵی خۆیان‌و بەهەزارو یەك فێڵ‌و فەرەج دەچنە سەر تەختی حوکمڕانی، دوایی بە تۆپ‌و تەیارەو فڕۆکیش نایەنە خوارەوەو لەسەر تەختی دەسەڵات دانابەزن، هەتا وڵات بەتەواوی وێران نەکەن، ئا لەم یەك دوو ساڵانەدا بەچاوی خۆمان ئەم دڕندانەمان دی کەچیان لە وڵاتی خۆیان کرد: قەززافی لە لیبیاو حافظ ئەسەد لەسووریاو عەبدوڵڵا صالح لە یەمەن‌و لا بەشار لا ئەسەد لە سووریەو کەسانی تریش کە لەوان بەدترو خراپترو مەلعوونترن لە شوێنانی تر، کە هەموو دەزانین!!

بەڵام ئەگەر هەوڵدان بۆ فەرمانڕەوایی‌و کاربەدەستی‌و پلەو پایەی باش، بەنیازی باش بێ‌و لەڕێگەی ئاسایی خۆیەوە بێ‌و بۆ بەرژەوەندی گشتی بێ، ئەوە کارێکی زۆر باشەو دروستەو بگرە زۆر پەسەندیشە، وەك:

آ- ئەوەتا حەزرەتی یووسف، لەبەرئەوەی بەخۆیا رائەپەرموێ‌و شیاوی ئەوەیە کە ببێ بە عەزیزی میصر، داوا لە پاشای میصر دەکا، کە بیکات بەوەزیری دارایی‌و ئابوری هەتا لەم کاتی تەنگانەی قاتوقڕییەدا فریای ملەتی میصر بکەوێ، وە پاشای میسریش داواکەی قەبووڵ کردو لەبەرئەوەی یوسف نیازی پاك بوو، وەشیاوی‌و ئەهلیەتی هەبوو بۆ ئەو پۆستە، خودایش سەری خست، وەك قورئان لەم ئایەتانەدا ئەم داستانەمان بۆ تۆمار دەکا کە

{قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ، وَكَـذَلِكَ مَكَّنِّـا لِيُوسُـفَ فِي الأَرْضِ يَتَبَـوَّأُ مِنْهَـا حَيْـثُ يَـشَاء نُـصِيبُ بِرَحْمَتِنَـا مَـن نَّـشَاء وَلاَ نُـضِيعُ أَجْـرَ الْمُحْسِنِينَ – يوسف/١٢ – آية/٥٥/٥٦}.

ب- ئەبوبەکری صەدیق لەکاتی خۆیداو پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ئەویش لەکاتی خۆیدا،خۆیان پاڵاوت کەببن بەجێنشینی پێغەمبەر، وە خەڵکەکەیش هەڵیان بژاردن، وە لەبەرئەوەی نیازیان پاك بوو، وەشیاوو شایستە بوون، بۆ ئەو پایەیە، خودایش سەری خستن‌و بوون بەمایەی رەحمەت بۆ ملەت هەتا هەتایە. وەزۆر کەسانی تریش لە کۆن‌و نۆدا هەروەها بوون.

ج- لەڕاستیدا ئەم جۆرە فەرموودانە، ئاوێنەی بالآنومان بۆ ئەم باوو نەریت‌و رژێمە خۆپەرستانە، کە لەم رۆژگارەی ئێمەدا لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستتدا باڵا دەستن‌و لەسەرکارن، بچوکترین بەرپرسیاریی بەکەسێ نادرێ، ئەگەر ئەڵقە بە گوێی حیزبی سەر دەسەڵات نەبێ، بەپێی ئەم بیرۆکەیە:

(نەخوێنەوارێکی خۆپەرستی نادان، لە حیزبەکەی خۆمان، ملیار جار باشترە لە زانایەکی شارەزای پسپۆڕ کە چڵکاو خۆری حیزبەکەی خۆمان نەبێ، با زۆر دڵسۆزیش بێ بۆ گەل‌و نیشتمان!).

د- بەندە بۆ نموونە، سا بەشکوو رۆژێ لەڕۆژان، ئێمەیش واز لەم حیزبپەرستییە بهێنن‌و کەسانێ کە پێغەمبەری خوداو یارو یاوەران‌و هاوەڵانی پێغەمبەری خودا، پەسنی رەفتارە بەرزەکانیان کردوون ئێمەیش واز لەم خۆ خۆری‌و زۆردار پەرستی‌و نەمروود گەرێیە بهێنین‌و ئەوەی باش بێ بۆ دین‌و دونیامان ئەوە پەسەند بکەین، جا بەندە لەم رووەوە لەم شوێنەدا ئەم فەرموودەیەی صەحیحی موسلیم راگوێز دەکەم، کە کۆتا بڕگەی دەرمانی هەموو دەردێکمانە: {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٢٦}:

موستەوریدی قورشەیشی (ڕەزای خودای لێ بێ) لەلای عەمری کوڕی عاص، کە هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون، فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتێ کە قیامەت بەرپا دەبێ ڕۆم لەهەموو کەسێ زۆرترن). (روم واتە: دەوڵەتە مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا - وەرگێڕ).

عەمری کوڕی عاصیش پێی فەرموو: ئەی موستەورید! لەقسەکەت وردبەرەوە، بزانە دەڵێی چی‌و ئەم قسەیە کوێ دەگرێتەوە!

موستەورید فەرمووی: من چیم لە پێغەمبەر بیستووە، ئەوە دەڵێم، زیاتر ناڵێم ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەرە، قسەی من نیە!!

عەمریش فەرمووی: لەسەر ئەم قسەیەی تۆدا، کە فەرمایشتی پێغەمبەرە، دەسا منیش ئەم شایەتییەم لەلایە: ئەم میللەتانی ڕۆمە چوار ڕەوشتی چاکیان واتیادا:

یەکەم: لەکاتی ئاژاوەو ئاشووب‌و پشێویدا زۆر زۆر بە حەوسەڵەو هێمن‌و لەسەرەخۆن.

دووەم: لەپاش قۆرت‌و چورتم‌و گرفتاری، زۆر زوو دێنەوە سەرخۆیان‌و خۆیان دەگرنەوە.

سێیەم: لەکاتی جەنگ‌و هەرادا، لەپاش کشانەوە گورج هەڵمەت دەبەنەوە سەر دوژمنی خۆیان.

چوارەم: بۆ هەژارو بێ نەواو هەتیوانیش زۆر باشن، سەرەڕای ئەم چوار ڕەوشە باشانەیش ڕەفتارێکی شیرینی جوانی تریشیان هەیە، کە لەگەڵ ئەم چوارەدا دەکەنە پێنج بەهرەی گەورە، کە ئەویش ئەمەیە: کە نایەڵن سەرۆك‌و پادشاکانیان زۆرو ستەم‌و ناهەقی بکەن!). {تاجول ئوصول بەکوردی بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٥٥٥٥، لاپەڕە: ٥٨٣ چاپی چوارەم}.

١٣٩١- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: { "مَنْ حَلِفِ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اَللَّهُ، فَلَا حِنْـثَ عَلَيْـهِ" } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ. وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/٢/٦ – ٤٥١٠. أبو داود/٣٢٦١. ابن ماجة/٢١٠٥. ترمذى/١٥٣١. نسائى في الكبرى/٤٧١٦. صحيح، إرواء الغليل/٢٥٧١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ لەسەر شتێ سوێند بخوات‌و بڵێ: خوا حەزکا، ئیتر ئەوە ئەگەر ئەوشتەیش نەکا، کە سوێندی خواردووە: ئەگەر خوا حەزکا بیکات، سوێندەکەی ناکەوێ، هەروەها ئەگەر ئەوشتەیش بکا، کە سوێندی خواردووە: ئەگەر خوا حەزکا ئەوشتە ناکا، ئەوە دیسان سوێندی ناکەوێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٩، ژمارە: ٢٥١٧ و ٢٥١٨}.

١٣٩٢- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { كَانَتْ يَمِينُ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "لَا، وَمُقَلِّبِ اَلْقُلُوبِ" } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٤٧ = بوخاری/٦٦١٧، ٦٦٢٨، ٧٣٩١}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: زۆرجاران، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا سوێندی دەخوارد: (لاَ وَمُقَلِّبِ القُلُوبِ = نا، ئەوشتە ناکەم، یاخود نا، ئەوشتە وانییە، بەوکەسە کە دڵەکان هەڵ دەسووڕێنێ!). {تاجول ئوصول بەکوردی/٣، ژمارە: ٣٤٩٨، زنجیرە: ١٢٣ ج/٤}.

١٣٩٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَـالَ: { جَـاءَ أَعْرَابِـيٌّ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: يَـا رَسُـولَ اَللَّـهِ! مَـا اَلْكَبَـائِرُ؟. ... فَـذَكَرَ

اَلْحَدِيثَ، وَفِيهِ: (اليمين الغَمُوسُ) قُلْتُ: وَمَا اَلْيَمِينُ اَلْغَمُوسُ؟ قَالَ: " اَلَّـذِي يَقْتَطِـعُ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، هُوَ فِيهَا كَاذِبٌ" } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١١٩ = بوخاری/٢٦٥٤، ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٢٧٤، ٦٩١٩. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦ = شيحا/٢٥٥}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو کە گەورەترینی تاوانەکان کامانەن؟ فەرمووی: (هاوەڵ دانان بۆ خودای تاكو تەنیا). عارەبە دەشتەکییەکە فەرمووی: ئەی ئەوجا چی تر؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دڵڕەنجاندنی باوكو دایك) دیسانەوە عارەبە دەشتەکییەکە فەرمووی: ئەی ئەوجا چی تر؟ فەرمووی: (سوێندی ناهەق، کە ماڵی سوێنخۆرەکە وێران دەکاو لەناو ئاگری سووری دۆزەخدا نوقمی دەکا).

عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: سوێندی ناهەق کامەیە؟ فەرمووی: (ئەو جۆرە سوێندەیە، کە کەسێ بەدرۆ دەیخوات، هەتا ماڵی موسوڵمانێکی بەناهەق پێ بپچڕێو بیکا بەهی خۆی).

١٣٩٤- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) { فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: لَا يُؤَاخِذُكُمُ اَللَّـهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ. قَالَتْ: هُوَ قَوْلُ اَلرَّجُلِ: لَا وَاَللَّهِ. بَلَى وَاَللَّهِ } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَأَوْرَدَهُ أَبُو دَاوُدَ مَرْفُوعاً.

{بوخاری. الأيمان/٦٦٦٣، ٤٦١٣. صحيح أبي داود/٢٧٨٩}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە: {لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللّـهُ بِاللَّغْوِ فِيَ أَيْمَانِكُمْ – البقرة/٢٢٥} . واتە: خودا ناتان گرێو سزاتان نادا، لەسەر ئەو سوێندانە، کە بەبێ مەبەست دێن بەسەر دەمتانا، بەبێ ئەوە کەنیازی دڵی لەگەڵدا بێ).

عائیشه فەرمووی: کە ئەوە راڤەکەی بوو، لەشانی ئەو کەسانەدا هاتۆتـە خوارەوە کە لـەکاتی گفتوگۆگـدا، بەسـەردەمیانا دێـتو سـەرزارەکی، کـە دڵـی لەگەڵا نەبێ، دەڵێن: نەبەخودا وانییە، بەرێ بەخودا وایە!!. {تـاج/٣، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ٢٥١٣}.

دانەر حافیظی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: ئـەبو داوود بە مەرفووعی گێڕاویەتەوە:

ئەمـە دەقەکەیـەتی لەپـەڕاوی (صـحیح أبـی داود) نامـە خانـەی شـێخی ئەلبانی:

عائیشه (رەزای خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەبارەی مەبەسـت لـەم ئایـەتی (لـەغوی یـەمین - سـوێندی دانەمـەزراو)ەوە ئەمەیـە: کـەپیاو لـەکاتی گفتوگـۆدا، کـە لەماڵـەوەی دەیکـا، ناوبـەناو دەڵێ، نـە بـەخودا وانییـە، بـەرێ بـەخودا وایـە. {المکتبـه الإسـلامیه الـشامله – صحیح أبی داود – القسم: مکتبه الـشیخ الألبانی}.

١٣٩٥– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { "إِنَّ لِلَّهِ تِسْعًا وَتِسْعِينَ اِسْماً، مَنْ أَحْـصَاهَا دَخَـلَ اَلْجَنَّـةَ" } مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ. وَسَاقَ اَلتِّرْمِذِيُّ وَابْنُ حِبَّانَ اَلْأَسْمَاءَ، وَالتَّحْقِيـقُ أَنَّ سَـرْدَهَا إِدْرَاجٌ مِـنْ بَعْـضِ اَلرُّوَاةِ.

{تەجریدی بوخـاری/٣، لاپـەڕە: ٢٦٧، ژمـارە: ١١٣٥ = ٢٧٣٦، ٦٤١٠، ٧٣٩٢. مختصر صحيح البخاری/٥، زنجیرە: ١٤٢٤، ژمارە: ١٨٦٤ = شیحا/٦٧٥٠ = مسلم/محمد فؤاد/٢٦٧٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە نـەوەدو نـۆ نـاوی هەیـە، لەسـەد یـەك کـەم، هەرکەسـێ لەبـەریان بکـاو کـار بـەواتاو مەبەسـتیان بکـا، دەچێتە

بەهەشت، خودا خۆی تاقەو حەز لە تاق دەکا). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٩٥٨ – ناوە جوانەکانی خودا}.

(ڕوونکردنەوە):

١- خودا خۆی تاكو تەنهایە، نەهاوەڵی هەیە، نەهاوجووتو هاوسەر، نە باوكو دایكو كوڕو كچو نەكەس، بەڵام دروستكراو جووتن، وەك ژنو مێردو باوكو دایكو كوڕو كچ. ئەو شتانەیش كە تاكنو خودا حەزی لێیانە، وەك پێنج نوێژەو حەوت دەورەو ژمارەی سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەو، وەك ڕەجمی شەیتان حەوت بەردە، خۆپاكردنەوە بەسێ بەرد، ئاسمانەكانو زەمینەكان حەوتن، حەفتە حەوت ڕۆژەو شتانی تری تاكی لەم بابەتە، وەك بیستو حەوتی ڕەمەزان. بەڵام ئەگەر شتەكە لەخودی خۆیدا ناباش بوو، ئەوە خودا حەزی لێی نییە، وەك سێ تەڵاقە، چونكە {أَبْغَضُ الحَلاَلِ عِنْدَاللّٰهِ الطَّلاَقُ}. واتە: (ناخۆشەویسترین شتی حەڵاڵ، كە خودا ڕقی لێی بێ تەڵاقە)

٢- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیمامی تەرمەزیو ئیبنو حیببان، لە فەرموودەیەكا ئەم نەوەدو نۆ ناوەیان ژماردووە، بەڵام گوتەی ڕاست، لەپاش لێكۆڵینەوە ئەوەیە: كە ژماردنی ئەم نەوەدو نۆ ناوە مەرفووع نییە، بەڵكوو مودەرەجەو یەكێ لەراویەكان تێكەڵیانی كردووە لەگەڵ فەرموودەیەكا....

ئەمەیش دەقی وەرگەڕاوی ئەم فەرموودەیە بەكوردی، كەشێخی عەسقەلانی، ئاماژەی بۆ دەكا، لە (تاجول ئوصول، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ١٥٤ چاپی چوارەم، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٩٥٩)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، سەد یەك كەم، هەركەسێ سەرژمێریان بكا دەچێتە بەهەشت، ئەو ناوانە ئەمانەن:

١- ئەڵڵا: خودا، یەزدانی پاك.

٢- ڕەحمان: بەخشندە.

٣- ڕەحیم: میهرەبان: بەڕەحم: بە بەزەیی.

٤- مەلیك: پادشا: شاه.

٥- قوددوس: پاك: خاوێن: تەمیز: پیرۆز.

٦- سەلام: ساخ: خۆشبەخش: ئاشت: ئاشتی.

٧- موئمین: دڵنیا: دڵنیاکار: دڵنیاکەرەوە: هێمن بەخش.

٨- موهەیمین: چاودێر.

٩- ئەلعەزیز: زاڵ: باڵادەست.

١٠- جەببار: بەجەبر: بەزەبروزەنگ.

١١- موتەکەبیر: گەورەترین کەس: هەرەگەورە.

١٢- خالیق: دروستکەر: دروستکار.

١٣- بارئ: هێنەرە روو: کردگار.

١٤- موصەوویر: وینەبەخش: وێنەکێش: نەخشبەند.

١٥- غەففار: تاوانبەخش.

١٦- قەهار: خاوەن قار: هەرەباڵادەست.

١٧- وەهاب: بەخشندە.

١٨- رەزاق: رۆزیدەر.

١٩- فەتتاح: گرێکەرەوە: کارگوزار: گوشادکار.

٢٠- عەلیم: زانا.

٢١- قابیض: گیانکێش.

٢٢- باسیط: گیانبەخش: خاوەن دەروو: دەرووکار.

٢٣- خافیض: نەویکەرەوە: نەویکار.

٢٤- رافیع: بەرزکەرەوە.

٢٥- موعیزز: سەربەرزکەر: پیرۆزی بەخش.

٢٦- موذيلل: داماوكەر: كەساسكەر.

٢٧- سەميع: بيسەر: ژنەوا: شنەوا.

٢٨- بەصير: بينا.

٢٩- حەكەم: فەرمانڕەوا.

٣٠- عەدل: دادپەروەر.

٣١- لەطيف: لەتيف: نازك: ناسك.

٣٢- خەبير: ئاگادار.

٣٣- حەليم: لەسەرخۆ: بەحەوسەڵە.

٣٤- عەظيم: مەزن.

٣٥- غەفوور: لێخۆشبوو: تاوانپۆش.

٣٦- شەكوور: سوپاسگوزار.

٣٧- عەلی: پایەبڵند.

٣٨- كەبير: گەورە.

٣٩- حافيظ: نيگاهبان: پاسەوان.

٤٠- موقيت: زادبەخش.

٤١- حەسيب: بەس.

٤٢- جەليل: بە قەدر.

٤٣- كەريم: دەهەندە: پيرۆز.

٤٤- رەقيب: تەماشاكار: چاودێر.

٤٥- موجيب: فريارەس: هانا: فريا.

٤٦- واسيع: رەحمەت گوشاد: بێ سنوور.

٤٧- حەكيم: دانا: كاردروست.

٤٨- وەدوود: خۆشەويست: ميهرەبان: خاوەن مۆبەت.

٤٩- مەجيد: بەشكۆ: گەورە: سەروەر.

٥٠- باعیث: مایه: هۆ.

٥١- شەهید: بینەر: ئاگادار.

٥٢- حەق: ڕاست: دروست.

٥٣- وەکیل: پەنا: پشتو پەنا: پشتیوان.

٥٤- قەوی: بەهێز: تەوانا.

٥٥- مەتین: پشتدار: قایم.

٥٦- وەلی: دۆست.

٥٧- حەمید: سوپاسکراو: شایستەی ستایش.

٥٨- موحصی: سەرژمێر.

٥٩- موبدی: داهێنەر.

٦٠- موعید: زیندووکەرەوە: داهێنەرەوە.

٦١- موحیی: زیندووکەرەوە: ژیێنەر.

٦٢- مومیت: مرێنەر.

٦٣- حەیی: زیندوو.

٦٤- قەییوم: ڕاگر: ڕاگری عالەم.

٦٥- واجید: دارا.

٦٦- ماجید: خاوەن شکۆ: شکۆدار: ڕێزدار.

٦٧- واحید: تاك: تەنیا: تاق: تاقی تەنیا.

٦٨- صەمەد: جێی هیواو ئومێد: ئومێد.

٦٩- قادر: توانا.

٧٠- موقتەدیر: تەوانا.

٧١- موقەددیم: پێشخەر.

٧٢- موئەخخیر: دواخەر: پاشخەر.

٧٣- ئەووەل: یەکەمین کەس: یەکەم: یەکەمین.

٧٤- ئاخير: دواهەمین: دواهەمین کەس.

٧٥- ظاهیر: ئاشکرا.

٧٦- باطین: ون: پەنهان.

٧٧- والی: خاوەن.

٧٨- موتەعالی: هەرە پایەبەرز.

٧٩- بەرر: باش: چاك: خاس: خێرخوا.

٨٠- تەوواب: تەوبە وەرگر: گیراکەری پەشیمانی.

٨١- مونتەقیم: تۆڵەسێن.

٨٢- عەفوو: چاوپۆش: لێبوردە.

٨٣- رەئووف: بە بەزەیی: زۆر میهرەبان.

٨٤- مالیکولمولك: خاوەنی موڵكو دارایی.

٨٥- ذولجەلالی وەلئیکرام: خاوەنی بێ باکیو بێ نیازیو خاوەنی نیعمەتی گشتی.

٨٦- موقسیط: دادگەر: بە داد: دادپەروەر.

٨٧- جامیع: کۆکەرەوە: گردکەرەوە.

٨٨- غەنی: بێ نیاز: بێباك: دەوڵەمەند.

٨٩- موغنی: دارایی بەخش.

٩٠- مانیع: نەهێڵ: قەدەغەکەر: مەنعکەر.

٩١- ضارر: زیانبەخش.

٩٢- نافیع: سوودبەخش: سوودگەیێن.

٩٣- نوور: رووناکی: رۆشنایی: بینایی.

٩٤- هادی: رێنوێن: رەهنوما: رێ نیشاندەر.

٩٥- بـەدیع: داهێنـەر: دروسـتکەری هـەموو شـتێ لـە نەبوونـەوە بـەبێ وێنە.

٩٦- باقی: نەمر: پایەدار.

٩٧- واریث: میراتگر: میراتبەر.

٩٨- رەشید: دەستگیر: ڕابەر.

٩٩- صەبوور: بەصـەبر: پـشوودرێژ: بـەئارام: ئـارامگر. {تـاج/٥، لاپـەڕە: ١٥٣، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٩٥٩ — تەرمەذی — سند غریب/ ئیبنو حەببان/حاکم — سند صحیح. چاپی چوارەم}.

١٣٩٦- وَعَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ، فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكِ اَللَّـهُ خَيْـراً. فَقَدْ أَبْلَغَ فِي اَلثَّنَاءِ"} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع/٦٣٦٨}:

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویـستەوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئـەو کەسـەی چـاکەی لەگەڵـدا بکـرێو بەچاکەکارەکە بڵێ: خودا تۆڵەیەکی چاکت بۆ بکاتـەوە، خـودا پاداشـی باشـت بداتەوە، ئەوە بەواتا ئەوپەڕی سوپاسو ستایـشی دەکا). {تـاج/٥، زنجیـرە: ٤٤، ژمارە: ٤٩٠٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٣٩٧- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، { عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) أَنَّهُ نَهَى عَنْ اَلنَّذْرِ وَقَالَ: " إِنَّهُ لَا يَأْتِي بِخَيْرٍ وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنْ اَلْبَخِيلِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمـارە: ٢٠٤٥ = ٦٦٩٦ بوخـاری. مختـصر صـحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠٦}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەهی دەکـرد لەنـەزر کـردن، وە دەیفـەرموو: (چـونکە

خودی نەزرەکە خۆی بەبێ چارەنووسی خودایی، هیچ خێرێ ناهێنێ بۆ نەزرکار، بەڵام ویستی خودا وایە کەبەهۆی نەزرەوە، خێروبەخشین لەچنگی مرۆڤی رژدو چرووك دەردەهێنرێ). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٣١، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٢٥٢٠، ٢٥٢١ + مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠٧ = شیحا ٤٢١٩}.

١٣٩٨- وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "كَفَّارَةُ اَلنَّذْرِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ" } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠٩ = ٤٢٢٩}:

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەفارەتی نەزریش وەك کەفارەتی سوێند وایە).

(روونکردنەوە):

راجیایی لەواتای ئەم فەرموودەیەدا هەیە، ڕای دروست ئەمەیە کە مەبەست لەم فەرموودەیە بڕگەی یەکەمە، لەم چەند بڕگەی کەفارەتە:

١- هەر نەزرێ دیاری نەکرابێ، وەك کەسێ بڵێ: (نەزرێکم لەسەر بێ بۆ خودا) ئەوە ئەم جۆرە نەزرە کەفارەتەکەی کەفاررەتی سوێندەو تەواو.

٢- کەسێ نەزرێ بکا، دوایی لەتوانایدا نەبێ کە جێبەجێی بکا، وەك بڵێ: (نەزر بێ وشترێ بکەم بەخێر). دوایی توانای ئەوەی نەبێ، ئەوە کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەرو بەس.

٣- لە نەزری لیجا جا ئەگەر حەنث روویدا، ئەوا نەزرکار سەرپشکە کە جێبەجێی بکا، یان کەفارەتی سوێند بدا، وەك بڵێ: (ئەگەر قسەم لەگەڵ زەید کرد نەزر بێ لەسەرم بۆ خودا حەجێ بکەم). جا ئەگەر نەزرەکەی شکان، واتە: قسەی لەگەڵ زەید کرد، سەرپشکە لەنێوانی ئەم دوو شتەدا، یان حەجەکە بکا، یان کەفارەتی سوێند بدات.

٤- لـەكاتی نـەزری گوناهـا كـەفارەتی سـوێندی دەكەوێتـە سـەر، وە نەزرەكـەی دانامـەزرێ‌و دروسـت نییـە كـە جێبـەجێی بكـا بـۆهیچ جـۆرێ.
{بڕوانە: مختصر صحیح مسلم – ڕوونكردنەوەی ژمارە: ١٠٠٩} .

ئەمەیش گێڕانەوەكەیە كە تەرمەزی بەصەحیحی داناوە:

دانـەر (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: عوقبـەی كـوڕی عـامیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: (كەفارەتی نەزریش، ئەگەر نەزرەكە ناونـەبرابوو، وەك كـەفارەتی سوێند وایە!)

١٣٩٩- وَلِأَبِي دَاوُدَ: مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عَبَّاسٍ مَرْفُوعاً: { "مِنْ نَـذَرَ نَـذْراً لَـمْ يُسَمِّهِ، فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ، وَمَنْ نَذَرَ نَذْراً فِي مَعْصِيَةٍ، فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِـينٍ، وَمَـنْ نَذَرَ نَذْراً لَا يُطِيقُهُ، فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ" } وَإِسْنَادُهُ صَحِيحٌ" إِلَّا أَنَّ اَلْحُفَّاظَ رَجَّحُوا وَقْفَهُ.

{ضعيف أبي داود/٧٢٣} :

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوكی بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (كەسـێ نـەزرێ بكـات‌و ناوی نەهێنێ‌و ئەندازەكەی دیاری نەكا، ئەوە كەفارەتێكی دەكەوێتە سەر وەك كـەفارەتی سـوێند، هـەروەها ئەگـەر كەسـێ نـەزر بكـا كـە گوناهـێ بكـا، نابـێ گوناهەكە بكـا، بـەڵام كـەفارەتی سـوێنێكی دەكەوێتـە سـەر، هـەروەها ئەگـەر كەسێ نەزرێ بكاو توانـای ئـەوەی نـەبێ كـە جێبـەجێی بكـا، ئـەوە كـەفارەتی سوێندێكی دەكەوێتە سەر وبەس).

دانەر حافظی عەسقەلانی (ڕەحمـەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بـەڵام ئـەم فەرموودەیە، لەلای پارێزگارانی فەرموودە، بە مـەرفووع دانـانرێ، بـەڵكوو بـە مەوقووف دائەنرێ.

١٤٠٠- وَلِلْبُخَارِيِّ: مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ: {" وَمَنْ نَـذَرَ أَنْ يَعْـصِيَ اَللَّـهَ فَلَـا يَعْصِهِ"}.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٥٤ = بوخاری/٦٦٩٦، ٦٧٠٠}:

لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ( کەسێ نەزری کرد کە فەرمانبەریی خودا بکا، ئەوە با نەزرەکەی بەجێ بهێنێ، بەڵام ئەگەر کەسێ نەزری کرد کە گوناهێ بکا، دیارە کە کردنی گوناه بێ فەرمانی خودایە، ئەوە با ئەو نەزرە جێبەجێ نەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٢٥٢٢ ج/٤}.

١٤٠١- وَلِمُسْلِمٍ: مِنْ حَدِيثِ عِمْرَانَ: { " لَا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةٍ"}:

ئەم فەرموودەیە بەدوورو درێژی لە ژمارە (١٣٠٩)دا لەپێشەوە رابورد، بڕوانە ئەوێ.

١٤٠٢- وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: { نَـذَرَتْ أُخْتِـي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اَللَّهِ حَافِيَةً، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "لِتَمْشِ وَلْتَرْكَـبْ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٥٣ = ١٨٦٦ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٧٨٨، ژمارە: ١٠٠٤ = شيحا/٤٢٢٦ = مسلم/١٦٤٤. أبو داود. أيمان ونذور/٣٢٩٩. نسائى. أيمان ونذور/٣٨٢٣. تحفة الأشراف/٩٩٥٧}:

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خوشکێکم نەزری کردبوو کە بەپێی پەتی بڕوا بۆ خانەی خودا، وە گوتی بەمن کەبۆ ئەمە پرسی بۆ بکەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا کاتێ پرسیارم لێ کرد لەم بارەیەوە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (با بەپیادەیش و بەسواریش بڕوا بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەی!). {تاج/٣، ژمارە: ٢٥٣١}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەگەر لەکاتی وادا، کە ئاهو نەزر بکا کە بەپێی پەتی بڕوا، ئەوە بۆ ی هەیە:

١- هەندێ کات بەپێ بڕواو هەندێ بەسواری.

٢- هەمووی بەپێ بڕواو پێڵاو لەپێ بکا.

٣- هەمووی بەسواری بڕوا ئەگەر توانای پیادەی نەبوو.

١٤٠٣- وَلِلْخَمْسَةِ. فَقَالَ: { " إِنَّ اَللَّهَ لَا يَصْنَعُ بِشَقَاءِ أُخْتِكَ شَيْئاً، مُرْهَا: فَلْتَخْتَمِرْ، وَلْتَرْكَبْ، وَلْتَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ" }.

{أحمد/١٧٤٣٩. أبو داود/٣٢٩٣. ابن ماجة/٢١٣٤. ضعيف إرواء الغليل/٢٥٩٢}:

لەگێڕانەوەیەکدا: عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: خوشکەکەم هەروەك ئاهو نەزری کردووە کە بەپێی پەتی بڕوات بۆ سەردانی خانەی خودا، نەزریشی کردووە کەبەسەری ڕووت، بەبێ لەچكو سەرپۆش بڕوا بۆ ئەم سەردانەی خانەی خودایە، تۆ فەرمانت بەچییە؟

فەرمووی: (خودا هیچ هەوەجێیەکی بەم خۆ ئازاردانی ئەم خوشکەی تۆ نییە، کەواتە لەزمانی منەوە: فەرمانی پێ بکە کە لەچك بکاو بەسەری ڕووت نەڕوا، با بەسواریش بڕوا، بەڵام لەکەفارەتدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ).

١٤٠٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { اِسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ ؟ فَقَالَ: "اِقْضِهِ عَنْهَا" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٥٥ = ٦٦٩٨، ٢٧٦١، ٦٩٥٩ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠٣ = شيحا/٤٢١١ = مسلم/١٦٣٨}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی عوبادە (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەری پرسی، گوتی: دایکم نەزرێکی لەسەر بوو، ئاهێکی کردبوو، بەڵام لەپێش ئەوەدا کەجێبەجێی بکا مرد، جا ئایا دەبێ کەئێستا من خۆم بیگێڕمەوە بۆیو لەجیاتی ئەو بیکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ دەبێ، ئێستا تۆ خۆت بیگێڕەرەوە بۆی!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ٢٥٢٦ ج/٤}.

١٤٠٥- وَعَنْ ثَابِتِ بْنِ اَلضَّحَّاكِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { نَذَرَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يَنْحَرَ إِبِلاً بِبُوَانَةَ، فَأَتَى رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَسَأَلَهُ: فَقَالَ: "هَلْ كَانَ فِيهَا وَثَنٌ يُعْبَدُ ؟" . قَالَ: لَا. قَالَ: "فَهَلْ كَانَ فِيهَا عِيدٌ مِنْ أَعْيَادِهِمْ ؟" فَقَالَ: لَا. فَقَالَ: "أَوْفِ بِنَذْرِكَ" فَإِنَّهُ لَا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اَللَّهِ، وَلَا فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ، وَلَا فِيمَا لَا يَمْلِكُ اِبْنُ آدَمَ" } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالطَّبَرَانِيُّ وَاللَّفْظُ لَهُ، وَهُوَ صَحِيحُ اَلْإِسْنَادِ.

{صحيح، المشكاة/٣٤٣٧، الصحيح المسند/١٨٦}:

ثابیتی کوڕی ضەحجاك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ نەزرو ئاهی کردبوو: کەوشترێ لە بووانە سەرببڕێو بیکا بەخێر، کە بووانە یالێکە لەپشتی یەنبوعەوەیە، نزیکە لەکەناری دەریای سوورەوە، جا هات بۆلای پێغەمبەرو بۆ ئەمە پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خۆ جێگەی بتو بوتخانە نییە؟ کەبتپەرستی تیادا بکرێ؟) گوتی: نەخەیر، شوێنی شتی وا نییە، فەرمووی: (خۆ لەکۆنا لەوێ جەژنیان نەدەکردو ئاهەنگی جەژنەکانیان لێ نەدەگێڕا؟). گوتی: نەخەیر، فەرمووی: (کەواتە ئاهەکەت جێبەجێ بکەو وشترە خێرەکە لەوێ سەرببڕە، بۆیە ئەم پرسیارانەم لێت کرد، چونکە ئاهو نەزری گوناهـ دانامەزرێو کەسێ نەزر بکا کە گوناهێ بکا، وەك ئەوە بڵێ: نەزربێ لەسەرم ئارەق بخۆمەوە، ئەوە نابی

نەزرەکەی جێبەجێ بکا، هەروەها نەزر بکا قەطعی صیلەی ڕەحم بکاو پەیوەندیی خزمایەتی بپچڕێنێ، نەزری وایش دیسان دانامەزرێو نابێ پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ، وە شتێکیش کە هی ئادەمیزاد خۆی نەبێو بیکا بەنەزر، نەزرەکەی دانامەزرێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٣٢}.

١٤٠٦- وَلَهُ شَاهِدٌ: مِنْ حَدِيثِ كَرْدَمٍ. عِنْدَ أَحْمَدَ.

{المسند/٢٧١١١ وَقَال الأرنائوط: إسناده حسن}:

ئەمە لەدواوە ئەو شایەتەیە کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا، لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا:

مەیموونەی کچی کردم فەرمووی: لەپاشکۆی باوکمەوە سوار بوو بووم، گوێم لەباوکم بوو لە پێغەمبەری پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئاهم کردووە کە لە (بووانە) وشترێ سەرببڕمو بیکەم بەخێر؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئایا بتو پەیکەری وەهای لێ هەیە کە ببن بەهۆی گومڕایی بۆ مەردووم؟) باوکم فەرمووی: (نەء، شتی وەهای لێ نییە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٢٥٢٥}.

فەرمووی: (دەی کەوایە ئاهەکەت جێبەجێ بکە).

١٤٠٧- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَجُلاً قَالَ يَوْمَ اَلْفَتْحِ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي نَذَرْتُ إِنْ فَتَحَ اَللَّهُ عَلَيْكَ مَكَّةَ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِ اَلْمَقْدِسِ، فَقَالَ: "صَلِّ هَا هُنَا" . فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: "صَلِّ هَا هُنَا". فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: "شَأْنُكَ إِذًا"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح، إرواء الغليل/٩٧٢، الصحيح المسند/٢٤٩}:

جابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری مەککە لەچنگی بێباوەڕان، کە لەمێژوودا ناسراوە بە (فەتحی مەککە) پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئاهم کردووە بۆ خودا، هەرکاتێ تۆ

بەپشتی خودا مەککەت ئازاد کرد، من دوو ڕکات نوێژ لە بەیتولمەقدیس بکەم؟ فەرمووی پێی (لێرە لەمەسجیدولحەرام ئەو نوێژە بکەو نەزرەکەت جێبەجێ بکە). بەلآم دیسان پیاوەکە پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە، ئەویش فەرموویەوە: لێرە، واتە: لەمەسجیدولحەراما ئەو نوێژە بکە کە نەزرت کردووە لە بەیتولمەقدیسدا بیکەیت. جا لەجاری سێیەما کە پیاوەکە هەمان پرسیاری لێی کردەوە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (کەواتە کەیفی خۆتە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٢٥٢٤ ج/٤}.

١٤٠٨- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "لَا تُشَدُّ اَلرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِد اَلْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ اَلْأَقْصَى، وَمَسْجِدِي هذا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری/٢، ژمارە: ٥٨٦ = بوخاری/١١٨٩. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٧٨٩ = شيحا/٣٣٦١ = ١٣٩٧ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تەنیا بۆ ئەم سێ مزگەوتە لەدوورەوە سەفەر ئەکرێ: بۆ مەسجیدولحەرام لەمەککەو بۆ مزگەوتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەو، بۆ مەسجیدولئەقصا، لەشاری قودس لە فەلەستین). {تاج/١، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٦٩٢}.

١٤٠٩- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي نَذَرْتُ فِي اَلْجَاهِلِيَّةِ" أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي اَلْمَسْجِدِ اَلْحَرَامِ. قَالَ: "فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَزَادَ اَلْبُخَارِيُّ فِي رِوَايَةٍ { فَاعْتَكَفَ لَيْلَةً }.

{تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩٢٩ ض/١ = بوخاری/٢٠٣٢، ٢٠٤٣، ٣١٤٤، ٤٣٢٠، ٦٦٩٧ + تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٦٨ = بوخاری/٣١٤٤، ٢٣٠٧، ٢٥٨٤. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠٢ = شيحا/٤٢٧٠ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/١٦٥٦}:

له موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویः لەپاش غەزای حونەین، لەپاش ئەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە طائیف گەڕایەوە، لە جیعرانە بوو، باوکم عومەری کوڕی خەطاب عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من لەسەردەمی نەزانیدا، نەزرم کردووە کە شەوێ لەناو مەسجیدولحەراما خەڵوەبکێشم، جا ئێستا تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (بڕۆ ڕۆژێ لەوێ خەڵوە بکێشەو ئیعتیکافەکەت جێبەجێ بکە).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەژنە دیلەکانی غەزای حونەین، لەبەشی پێنج یەك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەنیزێکی دا بەعومەر، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پیاوەتی، ژنو منداڵە دیلەکانی هۆزی هەوازینی بەردا، لەخۆشیانا خەڵکەکە، بەناو کۆڵانەکانا ڕایان دەکردو دەهاتنو دەچوونو بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد: ئۆخەی پێغەمبەری خودا ئازادی کردین!! عومەر گوێی لەدەنگە دەنگیان بوو، فەرمووی بەمن: عەبدوڵڵا بزانە ئەم دەنگە دەنگە چییە؟ عەرزیمان کرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپیاوەتی، منداڵو ژنە دیلەکانی هۆزی هەوازینی ئازاد کردووەو بەری داون!

جا باوکم فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا! دەتۆیش بچۆ ئەو کەنیزەکەی منیش، کە لەدیلەکانی غەزای هەوازین بەرم کەوتووە بەرەڵای بکە، منیش چووم فەرمانەکەیم بەجێ هێنا. {تاج/٤، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٤٥٤٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٤٦٣٤}.

لەگێڕانەوەی ژمارە (٢٠٤٢)ی صەحیحی بووخاریدا ئەم پترییەی هەیە: ئیتر عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) شەوێ لەناو مەسجیدولحەراما خەڵوەی کێشا).

(ڕوونکردنەوە):

پوختەیەکی کورتی بابەتی سوێندو بابەتی نەزرو ئاهکردن:

١- سوێند دانامەزرێ تەنها بەزاتی خودا، یا بەناوێ لە ناوە جوانەکانی، یا بەنیشانەیێ لە نیشانەکانی.

٢- ناوەکانی خودا ئەم سێ جۆرەن:

یەکەم: ناوێکە، لەزمانا، یا لە عورفا، تایبەتە بە خودای گەورە، بۆ جگە لەخودا، لەسەر رووی راستی بەکار نایەت وەك (ئەڵلا) لە عەرەبیدا و (خوا) لە کوردیداو (خودا) لە کوردیو فارسیدا.

دووەم: ناوێکە تایبەت بەخودای گەورە نییە، بەڵام زۆرتر بەبێ قەید بۆ زاتی خودا بەکاردەهێنرێ، وەك: جەببارو حەقو رەببو قادرو رەحیمو کەریمو رەززاق.

سێیەم: ئەو ناوەیە کە بۆ خوداو بۆ غەیری خودایش وەکوو یەك بەکاردەهێنرێ، وەك: زیندوو و مەوجوود، دارا.

٣- بەجۆری یەکەم، لە حاڵەتی لەغوی یەمیندا نەبێ، بەبێ قەیدو مەرج سوێند دائەمەزرێ، بەجۆری دووەمیش سوێند دائەمەزرێ مەگەر سوێندخۆر لەدڵەوە، مەبەستی لێیان ناوی خودا نەبێ ئەوە سوێندی پێ دانامەزرێ، بەجۆری سێیەم سوێند دانامەزرێ مەگەر کابرا بڵێ مەبەستم سوێند، خواردن بووە بەخوا.

٤- جا هەرکاتێ بەیەکێ لەم سێ جۆرە ناوە سوێند دامەزرا، ئەوە خاوەنەکەی دەبێ نەیشکێنێو رێزی ناوی خودا بگرێ، وە لەم بارو دۆخەدا، کەفارەتی لەسەر نییە.

بەڵام ئەگەر وای بەباش زانی کە سوێندەکەی بشکێنێ، چونکە خێر لەوەدایە، ئەوە سوننەتە سوێندەکەی بشکێنێو برێتی (واتە: کەفارەت)ی سوێندەکەی بداتو شتە باشەکە ئەنجام بدات.

بەهەر حاڵ هەرکاتێ لەبەر هەر هۆیێ، سوێندی دامەزراو شکا، پێویستە کە خاوەنەکەی برێتی بدات.

٥- کەفارەت (واتە: برێتی = پەردەپۆش)ی سوێند، هەرکاتێ مرۆڤی موسوڵمان سوێندی کەوت، پێویستە لەسەری کەفارەتی بدا، جا سوێند کەوتوو لەسەرەتاوە سەرپشکە لەکردنی یەکێ لەم سێ شتە:

آ- خۆراکی دەمسکێن بدات لەمیانەی ئەو خۆراکەی کە دەیدا بە کەسوکاری خۆی.

ب- یا بەرگی دەمسکێن بدات.

ج- یا کۆیلەیێ ئازاد بکا.

جا ئەگەر سوێند کەوتوو توانای یەکێ لەم سێ شتەی نەبوو، پێویستە لەسەری کەسێ رۆژ بەڕۆژوو بێ.

٦- نەزر ئەوەیە کە کەسێ خێرێ بگرێتە ئەستۆی خۆی، وەك ئەوە بڵێ: نەزربێ لەسەرم هەرکاتێ ئەم مرازەم هاتەجێ، دوو رۆژ بەڕۆژوو بم بۆ خودا، یا گایەك بکەم بەخێر، یا هەر بەبێ بەرابەر بڵێ: نەزربێ لەسەرم شەوێ لەمزگەوت خەڵوە بکێشم، یا دوو رکات نوێژی سوننەت بکەم، یا مەولوودییەك بکەم.

٧- نەزرکردنی گوناه دانامەزرێ، وەك بڵێ: نەزربێ لەسەرم، پیاوێ بکوژم، یا داوێنپیسی بکەم، یا درۆبکەم.

٨- شتێ هی تۆنەبێ، نەزری دانامەزرێ، وەك ئەوە کەسێ بڵێ: گایەکەی لالە حەمەم کرد بەخێر، یا هەنجیرە کێویلەی ئەو کەژو کێوەم کرد بەخێر.

٩- نەزری شتی رەوا (موباح) دانامەزرێ، وەك: ئاو خواردنەوەو هەناسەدانو راوەستانو دانیشتن.

١٠- کەسێ نەزربکا کەشتێکی باش بکا، بەپێی توانا دەبێ جێ بەجێی بکات، ئەگەر بۆی نەکراو لە توانایدا نەبوو، دەبێ کەفارەتێکی سوێند بداتو بەس.

١١- هەر نەزرێ ئەندازەکەی دیاری نەکرێ، ئەوە دەتوانێ کەفارەتێکی سوێند بدات، یاخێرێ بکا زیاتر لە کەفارەتی سوێند.

١٢- بڕوانە: ڕوونکردنەوەی ژمارە: (١٣٩٨).

## ١٥- نامەی دادوەری
## كِتَابُ القَضَاءِ

{بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٢، لە ژمارە: ٢٤٠١ ەوە + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ١٠٣٥، زنجیرە: ٣٨٧ — باسی دادوەری (القضاء) + مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥١ هەتا ژمارە: ١٠٥٩}.

### ٨٨- باسی دادوەری

١٤١٠ – عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "اَلْقُضَاةُ ثَلَاثَةٌ: اِثْنَانِ فِي اَلنَّارِ، وَوَاحِدٌ فِي اَلْجَنَّةِ. رَجُلٌ عَرَفَ اَلْحَقَّ، فَقَضَى بِهِ، فَهُوَ فِي اَلْجَنَّةِ. وَرَجُلٌ عَرَفَ اَلْحَقَّ، فَلَمْ يَقْضِ بِهِ، وَجَارَ فِي اَلْحُكْمِ، فَهُوَ فِي اَلنَّارِ. وَرَجُلٌ لَمْ يَعْرِفِ اَلْحَقَّ، فَقَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ، فَهُوَ فِي اَلنَّارِ" } رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح، إرواء الغليل: ٢٦٢٨. الصحيح المسند: ١٧٤. أبوداود: ٣٥٧٣. ترمذی: ١٣٢٢. نسائی فی الكبری: ٥٩٢٢. ابن ماجة: ٢٣١٥}:

بورەیدە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دادوەر (قازی)یەکان، سێ دەستەن:

دەستەیەکیان لەبەهەشتانو دوو دەستەیان لە دۆزەخدان، دەستەی بەهەشت ئەو پیاوانەن کە هەم هەق دەناسنو هەم ڕەفتاری پێ دەکەن، دەستەی یەکەمی دۆزەخیش ئەو جۆرە پیاوەیە کە قازییەو هەق دەناسێو سوور دەزانێ هەقە بەڵام ڕەفتاری پێ ناکاتو لەبڕیارو حوکمداندا نارەواییو ناهەقی دەکا، ئەم دەستەیە جێگەی دۆزەخە، دەستەی دووەمی دۆزەخیش ئەو جۆرە قازیانەیە، کە بەنەزانیو نەفامی دادوەریی دەکەن لەناو خەڵکا.

١٤١١– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): : { "مَنْ وَلِيَ اَلْقَضَاءَ فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ" } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح، المشكاة: ٣٧٣٣. الصحيح المسند: ١٣٦٢. أبو داود: ٣٥٧١. ترمذی: ١٣٢٥. نسائی: ٥٩٢٣}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی دەبێ بەقازی، وەك بەبێ چەقۆ سەربڕڕێ وایە).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە ئەوە نییە کەخەڵك بە بەلاش بتەکێتەوە لە دادوەری کەس نەبێ بەدادوەرو قازی، شتی وا کاری نەکردە نییە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: کە دادوەر ئاگای لەخۆی بێو هەوڵ بدا، کە دادوەرییەکەی جۆرێ بێ لە پەرستشی جوانو کلیلی بەهەشت بێ، نەوەك پردێ بێ بیبات بەرەو دۆزەخ.

(کورتو پوخت)

هەموو کارمەندێکی باشی دادپەروەری خواناس بەهەشتییە، ئیتر چی قازی بێ، چی ژینگەپارێز بێ.

١٤١٢- وَعَنْهُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم): {"إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُـونَ عَلَـى اَلْإِمَـارَةِ، وَسَـتَكُونُ نَدَامَـةً يَـوْمَ اَلْقِيَامَـةِ، فَـنِعْمَ اَلْمُرْضِعَةُ، وَبِئْسَتِ اَلْفَاطِمَةُ"} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢١٠٥ = ٧١٤٨ بوخاری}:

ئـەبوهورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (وا دیـارە کـەئێوە زۆر سوورو مجێـزن لەسـەر فـەمانڕەوایی‌و کاربەدەسـتی، بـەڵام ئـەم جـۆرە پۆسـتە، لـەڕۆژی زینـەوەدا پەشیمانی لەدوایە، بەڵێ ڕاستە کـە دایـەنی چاکە، بـەڵام لـە شـیربڕینەوەکەی گەلێ ناخۆشە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٨ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

سوبحانەڵڵا! دەڵێی ئەم فەرموودەیە بۆ فەرمانڕەواو کارمەندانی ئەمڕۆ ئاوێنـــەی باڵانمایـــە، شـــەڕە کورســـی‌و شـــەڕەگێرفان، کـــاری ســـەرەکی فەرمانڕەواکانمانە!

١٤١٣- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ: { "إِذَا حَكَمَ اَلْحَاكِمُ، فَاجْتَهَدَ، ثُمَّ أَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ. وَإِذَا حَكَمَ، فَاجْتَهَدَ، ثُمَّ أَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢١٢٣ = بوخـاری: ٧٣٥٢. مختـصر صـحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥٦ = شیحا: ٤٤٦٢ = مسلـم (محمد فؤاد): ١٧١٦. أبو داود: أقضية: ٣٥٧٤}:

عـەمری کـوڕی عـاص (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (دادپـرس (حـاکم: قـازی: دادوەر) ئەگـەر لـەکاتی بڕیـار دانـا، چـاك تێکۆشـێ‌و بـاش وردبێتـەوە بـۆ تێگەیـشتن لەپرسـەکەو بـۆ گەیـشتن بەهـەق‌و بـۆ پـەیبردن بـەڕووی ڕاسـتی پرسـەکەو، ئەوجا بڕیارەکە دەربکات، ئەوە لەم کاتەدا ئەگەر بڕیارەکەی ڕاست بوو، ئـەوە

دوو پاداشی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر لەبارودۆخی وادا، بڕیارەکەی هەڵە بوو، رووی ڕاستی کارەکەی نەپێکا، ئەوە یەك پاداشی بۆ هەیە، چونکە ئەو بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵساوەو درێغی نەکردووە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٢٤٨٢ چ/٤}.

١٤١٤- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ: { " لَا يَحْكُمُ أَحَدٌ بَيْنَ اِثْنَيْنِ، وَهُوَ غَضْبَانُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢١٠٩ = ٧١٥٨ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥٥ = شیحا ٤٤٦٥ = مسلم (محمد فؤاد): ١٧١٧}:

له {مختصر صحیح مسلم} دا ئاوایە:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرە فەرمووی: عەبدوڵڵای برام لەسیجستان دادوەر (قازی) بوو، باوکم نامەیەکی بەمن نووسی بۆی‌و بۆینارد، بۆی نووسی: لەکاتی تووڕەیی‌دا، دادگایی کەس مەکە، چونکە من خۆم بۆ ئەوە لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (دروودی خودای لەسەر بێ) (دادوەر لەکاتی تووڕەیدا دادگایی کەس نەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ٢٤٦٧ چ/٤}.

١٤١٥- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {" إِذَا تَقَاضَى إِلَيْكَ رَجُلَانِ، فَلَا تَقْضِ لِلْأَوَّلِ، حَتَّى تَسْمَعَ كَلَامَ اَلْآخَرِ، فَسَوْفَ تَدْرِي كَيْفَ تَقْضِي" . قَالَ عَلِيٌّ: فَمَا زِلْتُ قَاضِيًا بَعْدُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَقَوَّاهُ اِبْنُ اَلْمَدِينِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{حسن، صحيح الجامع: ٤٧٨، أبو داود: ٣٥٨٢. ترمذي: ١٣٣١. ابن حبان: ٥٠٦٥}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی عەلی! ئەگەر دووکەس بۆ دادگایی هاتن بۆلای تۆ، نەکەی بەرلەوەی کەگوێ لەدووەم بگری،

حوكمو بڕیار بدەیت بۆ یەکەم، جا هەرکاتێ بەجوانی، گوێت لە داواکارو لە داوالێکراو گرت، ئەوجا دەزانی چۆن بڕیار دەدەیت.

عەلی دەفەرموێ: ئەوەتی ئەم فەرمانەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەرگرتووە، ئیتر بەجوانێتی قازێتیم کردووە!.

١٤١٦- وَلَهُ شَاهِدٌ عِنْدَ اَلْحَاكِمِ: مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عَبَّاسٍ.

١٤١٧- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): : { " إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مِمَّا أَسْمَعُ، مِنْهُ فَمَنْ قَطَعْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ اَلنَّارِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٦٧ = بوخاری: ٢٤٥٨، ٢٦٨٠، ٢٩٦٧، ٢١٦٩، ٧١٨١، ٢١٨٧. مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥١ = شیحا: ٤٤٥٠ = مسلم/ محمد فؤاد: ١٧١٣}:

له پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەگشت هاوسەرە پاکیزەکانی بێت) فەرمووی: دوو پیاو هاتنە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێ کەلەپووریان هەبوو، لەسەری بوو بەناکۆکیان، لەبەردەرگای هۆدەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووبە دەمەقاڵیان، کەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، تەنیا داوای رووت نەبێ، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپرسەکەیان حاڵی بوو، فەرمووی: (منیش هەر ئادەمیزادمو، وەك ئێوە غەیبزان نیم، لەبەر ئەوە بەپێی رووکاری کارەکە بڕیار دەدەم، جاوادەبێ کە دوو هاوداوا دێن بۆلای من، بۆ دادگایی، وادەبێ یەکێکیان لەوی تریان بە دەموپلترو قسەزانترە، منیش وادەزانم کە ڕاست دەکا، وە لەم ڕووەوە بڕیاری بۆ دەدەمو بەظاهیر داواکە دەباتەوە، دەی بزانن، هەرکەسێ لەسەر قسەی ناڕەوای خۆی، من شتێ بڕیار

بدەم بۆی، بەوە نابێ بەهی ئەو، کەواتە با وەری نەگرێ، چونکە شتی وا بەو بڕیاردانەی منە، کە لەسەر شایەتیو بەڵگەو قسەی ناڕەوای خۆی بووە، نابێ بەهی خۆی، بەڵکوو ئەوە پارچەیێ ئاگری سووری رووتە، من بڕیاری دەدەم بۆی! ئیتر پاش ئەم روونکردنەوەیە ئارەزووی خۆیەتی ئەو پارچە ئاگرە سووورە هەڵدەگرێ، یا وازی لێ دەهێنێ). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٢٤٨٣، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٢٤٩١}.

١٤١٨- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {" كَيْفَ تُقَدَّسُ أُمَّةٌ، لَا يُؤْخَذُ مِنْ شَدِيدِهِمْ لِضَعِيفِهِمْ ؟"} رَوَاهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٤٥٩٨}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، دەیفەرموو: (ملەتێ مافی بێ هێز لەهێزدار نەسێنرێ تیادا چۆن پیرۆزو سەرکەوتوو دەبێ!).

١٤١٩- وَلَهُ شَاهِدٌ: مِنْ حَدِيثِ بُرَيْدَةَ، عِنْدَ اَلْبَزَّارِ.

١٤٢٠- وَآخَرُ: مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ عِنْدَ اِبْنِ مَاجَه.

١٤٢١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {" يُدْعَى بِالْقَاضِي اَلْعَادِلِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ، فَيَلْقَى مِنْ شِدَّةِ اَلْحِسَابِ مَا يَتَمَنَّى أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ بَيْنَ اِثْنَيْنِ فِي عُمْرِهِ"} رَوَاهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَأَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ، وَلَفْظُهُ: {فِي تَمْرَةٍ }.

{ضعيف الترغيب والترهيب: ١٣١٠}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتدا قازی (دادپەروەر) بانگ دەکرێ بۆ لێپرسینەوە، تووشی لێپرسینەوەیەکی وا دەبێ، خۆزگە دەخوازێ کە لەژیانیدا هەرگیز دادگایی لەنێوانی دووکەسدا نەکردایێ!!).

له لەفظی بەیهەقیدا ئاوایه:

عیمرانی کوڕی حیططان فەرمووی: لەلای عائیشه بووین، کەسانێ باسی دادوەرانیان کرد لە خزمەتیدا، عائیشه فەرمووی: (گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: لەڕۆژی ژیانەوەدا، قازی دادپەروەر بانگ دەکرێ بۆ لێپرسینەوە، جا لەکاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا، تووشی لێپرسینەوەیەکی سەختی وا دەبێ، خۆزگە دەخوازێ کەهەرگیز لەژیانیدا، دادگایی لەنێوانی دووکەسدا نەکردبایێ، تەنانەت ئەگەر ئەو دادگاییه سەبارەت بەیەك دەنك خورمایش بوایه). {السنن الكبرى للبيهقى}.

١٤٢٢- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ اِمْرَأَةً" } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٢٠ = ٤٤٢٥، ٧٠٩٩ بوخاری}:

ئەبو بەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ڕوودانی ڕووداوی دڵتەزێنی شەڕی ئەلجەمەلدا، خودای گەورە بەهۆی وشەیەکەوە، سوودی پێم گەیاند، کە ئەو وشەیەم لە پێغەمبەر بیستبوو، چونکە دوو دڵ بووم لە بەشداریکردن لەم جەنگەدا، خەریکبوو لەم جەنگەدا، لەگەڵ عائیشەدا بڕۆم و لەناو سوپاکەی ئەودا، لەدژی سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبو طالیبدا بجەنگم، ئەو وشەیەیش کە ئەم سوودەیەی پێ گەیاندم و نەیهێشت لەم جەنگی براکوژییەدا بەشداری بکەم ئەمە بوو: کاتێ هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە خەڵکی ئێران، کچی کیسرایان کردووە بە پادشای خۆیان، لەشوێنی باوکی، کاتێ باوکی کوژرا، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە (هەر گەلێ کە سەرکەوەرەیی خۆیان بسپێرن بەژنێ و ژن بکەن بەسەرۆك و بە پادشای خۆیان، قەت سەرکەوتوو نابن!).

{تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، لاپەڕە: ١٠٠، ژمارە: ٢٤٦١، چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- کەسانێ پەیدا بوون، ئەوەندە ڕقیان لەم ئاینە پیرۆزەیە بۆ دۆزینەوەی ڕەخنەو هەڵەو کەموکوڕی لەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، هەر چاوێکیان کردووە بەهەزار چاو، تەنانەت بەڕۆژی نیوەڕۆیش، بەچراو فانۆس و لایتەوە کون و قوژبن دەگەڕێن، بەدوای شتێکا کە بیکەن بە ڕەخنەو بەڵگە لەسەر ئەوە کەئیسلام کورتبینەو شایستەی گەشەو بەرەو پێشکەوتن نییەو، کۆمەڵگا هەر بەرەو کۆنەپەرستی و بەرەو دوا دەبات، جا لەم ڕوانگەیەوە، بەوێنە بۆ ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی تر، کەسنوور دادەنێن بۆ تواناو کەسایەتی ئافرەت، لەرووی ڕەخنەوە دەڵێن:

آ- ئەمە دژی یەکسانییە، لەنێوانی دوو ڕەگەزی ژن و پیاودا، کەشتی وا دژی مرۆڤایەتییەو دژی پێشکەوتنە.

ب- ڕووداوەکان بەپێچەوانەی بڕیاری ئەم فەرموودەوەیە، ئەوەتا لەبەرچاومان، لەسەدەی بیستەمدا، چەند ژنمان بینی بوون بەسەرۆکی وڵاتی خۆیان و وڵاتی خۆیان بەرەو پێش بردو گەشەیان بەسەرکەوتنی خۆیان دا، وەك ئەندێرا غاندی لەهیند، کەسەرۆك وەزیران بوو، وەك خانمە تایجەر کە سەرۆك وەزیرێکی سەرکەوتووی بەریتانیا بوو، وەك ژنە جوولەکە: مەدام گۆڵدە مائیر کە سەرۆك وەزیرانی حوکومەتی ئیسرائیل بوو، کە لەشەڕی عەرەب و جوولەکەدا گەورەترین شکستی بە بیست دەوڵەتی عەرەب هێنا!!

ج- پێشەکی بەندە عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم، وەك خودا لە قورئانی پیرۆزدا، لەسەر زمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخۆی و نەتەوەکەی دەفەرمویێ:

{وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ – البقرة/٢/١٢٠}؛

دەی ئەم عەلمانییانەی سەردەمی ئێمەیش، کە گۆشکراوی ماسۆنییەتو صەلیبییەتو صەهیۆنییەتنو، کە دەستگای ڕاگەیاندنی زۆر پێشکەوتووی قەبە قەبەی وەهایان بۆ ئامادە کراوە، کە کوردو ناکورد، لەمناڵی سەربێشکەوە هەتا پیری گوێ قەبر، چەواشە دەکاو لەخشتەی دەباو، وەك جادووگەر ڕەش دەکا بەسپیو سپی دەکا بەڕەش.

جا خۆخەریك کردن بەگفتوگۆو وەڵامدانەوەی ئەمانە، ئاسنی سارد کوتانە، وەك ئاو لەدنگا بکوتی وایە، ئەمانە هیچ چارێکیان نییە پشتگوێ خستن نەبێ، وەك لەدێریندا، دانایان فەرموویانە: (وەڵامی نەفام بێدەنگییە!).

د- جا لەم ڕوانگەوە عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم:

جێگەی داخە، زۆر لەڕاڤەنووسانو ڕاڤەکارانو زانایانی پێشینەی خۆشمان (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ) لەزۆر شتدا پێیان لێ هەڵپڕیوەو، لەڕاڤەو شەرحو تەفسیرو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەکانیاندا، زیادەڕەوییان کردووە، وەك ئەوە پرسەکە خۆی تایبەتمەندە، ئەوان کردوویانە بەگشتی، یان سەرگوزشتەیەکی ڕابوردووە، ئەوان کردوویانە بەیاسایەکی هەمەگیری دامەزراوی نەگۆڕ......تاد.

٢- ئەوەی کە لەبەرچاوە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، خەڵکەکە بوون بەدوو تاقمەوە:

تاقمی یەکەم: دەهرییە کۆنەکانن، باوەڕیان بەهیچ نییە، نە بەخودا، نە بەزیندوو بوونەوە، نە بەچاکە، نە بەخراپە، ئەمانە جگە لەخەوو خواردنو خواردنەوەو لەزەتپەرستیو ڕابواردنی نێرو مێیی، باوەڕیان بەهیچ نییە، وەك قورئان پێناسەیان دەکا:

{وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ — الجاثية/٤٥ — الآية/٢٤}

واتــه: دەڵـێن: هـەر ئـەم ژیانـەی ئێـستامانەو بـەس، بـەبێ ئامـانج و مەبەسـت، دەمـرین و دەژیـن، نەلێپرسـینەوە هەیـە لەپاشـە رۆژدا، نـەپاداش و سـزا، ڕۆژگـارو چـەرخ و گـەردوون، بـەبێ بەرنامـەو ئامـانجی بـاڵاو بـەرز، دەمانهێنێ و دەمانبات و شەن و کەومان دەکات، لەناکاوێکا لەناومان دەبات!!.

رابەرانی ئـەم دەسـتەیان لـەم ڕۆژگـارەی ئێمـەدا بـریتین لـەم ڕێکخـراوە شەیتانییانە:

آ- مۆسیقاو گۆرانی و سوورِو سەماو وێنەو فلیمی رووت و قووت.

ب- شانۆو سینەماو تیاترۆخانەو قەحبەخانەو شتی وا.

ج- إبـاحییـەتی جینـسی و بـرەودان بـە (حَيْوَنَـةُ الإنــسان) بەتایبـەتی لەڕێگەی فلیم و کلیپ و وێنەی گلاّوەوە.

تـاقمی دووەم: بــریتین لــەباوەڕداران، پــەیڕەوی قورئــان و ســوننەتی پێغەمبەرو شەریعەتی ئیسلام دەکەن و لەدەوری قورئان و حەدیث و مزگەوت و مـەلا کۆدەبنـەوەو زانایـانی ئـایین دەکـەن بەسەرمەشـق بـۆ خۆیـان و ئەمـە دروشمــی ئــەم ســەردەمەیانە (کــاروانی بــاوەڕ بــەقورئان بــەرەو بەهەشــت دەمانبـات، بـەدەم ڕێگـەوە، لـەدوورو نزیکـەوە گوێمـان لـە حەپەحـەپی سـەگە پێمان دەوەڕێ!!).

(لــەباتی ئــەوەی خۆمــان بــەدەمکوتکردنی ســەگەوە خــەریك بکــەین، صەڵاواتێ لەدیداری پێغەمبەر دەدەین، هـەزار درووددو سـەڵاوی لەسـەر بێ)

گەرچی ئەم پەراوێزو لێکۆڵینەوەیە، هێشتا سـەرەتاییە، بـەڵام بـا بـەس بێ، وەك گوتـراوە: {بۆ دانا تاقە پیتێ بەسە!}.

١٤٢٣– وَعَنْ أَبِي مَرْيَمَ اَلْأَزْدِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) أَنَّهُ {قَالَ: "مَنْ وَلَّاهُ اَللّٰهُ شَيْئًا مِنْ أَمْـرِ اَلْمُـسْلِمِينَ، فَاحْتَجَـبَ عَـنْ حَـاجَتِهِمْ وَفَقِيرِهِم، اِحْتَجَبَ اَللّٰهُ دُونَ حَاجَتِهِ"} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح أبي داود: ٢٥٥٥. الصحيح المسند: ١٢٤٩}:

ئـەبو مەریـەمی ئـەزدی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـەر موسـوڵمانێ، خـودا کـردی بەسـەرەوکاری کـارێ، لـەکاروباری موسـوڵمانان، وەبـچێ خـۆی حەشـاربدات لەئاسـتی پێویـستی موسـوڵمانانو دەرگـای خـۆی داخـا لـەرووی هـەژارانیانا، خودای گەورەیش لەهەردوو جیهاندا دەرگای خۆی لەرووی پێداویستیـیەکانی ئەودا دادەخات).

لەتاجا، لە فەرموودەیەکی تەرمـەزیو ئـەبو داووددا، لـە عـەمری کوڕی موڕڕەوە (ڕەزای خودای لێ بـێ) فـەرمووی: گـوتم بـە موعاوییـەی کـوڕی ئـەبو سوفیان (ڕەزای خودا لـەخۆیو لـەباوکی بـێ) لـەو سـەردەمەدا، کـە موعاوییـە جێگەنشین بوو، گوتم پێی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: هەر پێشەوایێ، دەرگای خۆی دابخا لـە هـەژارانو دامـاوانو، لەوانـەی کـە ئـیشو کاریـان پێـی هەیـە، بێگومـان کـە خـودایش دەرگاکـانی ئاسمـان دادەخـا لەئاسـتی هـەژاریو ئیشو کاری ئەودا).

ئیتر موعاوییە پیاوێکی دانا بۆ جێبەجێ کردنی ئـیشو کـاری خـەڵکی. {تاج/٣، لاپەڕە: ٨٧، زنجیرە: ١٠٦، ژمـارە: ٢٤٣٧ – ترمـذی بـسند غریـب – أبـو داود}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو مەریەمی ئەزدی ناوی عەمری کوڕی مـوررەی ئەلجوهەنیـە، چوو بۆ شام، لەوێ ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆ معاویـە، هاوەڵێکـە لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

دەڵێن: یەك فەرموودەی هەیە لە پێغەمبەرەوە. ئەبو مەریەم حەضرەمی‌یە، ئەم زاتانە فەقێی بوون، قاسمی كوڕی محیمرة، ئامۆزاكەی خۆی: أبو الشمائخ الأزدیء أبو المعطل، ئەبو داوودو تەرمەزی فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، واتە لەپیاوان (رجال)ی ئەبو دداوودو تەرمەزییە.

١٤٢٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { لَعَنَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ فِي اَلْحُكْمِ } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٥٠٩٣. الصحيح المسند: ٧٨١. ترمذی: ١٣٣٦. أحمد/٢/٣٨٧ – ٣٨٨. ابن حِبَّان/١١٩٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرەتو لەعنەتی كردووە لە بەرتیلدەرو لەبەرتیلخۆر، نەخوازەڵا ئەگەر بەرتیلو بەرتیلكاری لەدادگاو دادوەریدا بێت). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٢٤٥٨}.

١٤٢٥- وَلَهُ شَاهِدٌ: مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اَللَّهِ بنِ عَمْرٍو. عِنْدَ اَلْأَرْبَعَةِ إِلَّا النَّسَائِيَّ.

شایەتێ تر بۆ ئەم فەرموودەیە هەیە، كە لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصەوەیە.

لە تاجول ئوصولا دەفەرموێ: ئەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەفرینی خودا لە بەرتیلدەرو بەرتیلخۆرو لەرابەری نێوانیان، كە دەكەوێتە نێوانیان بۆ رێكخستنیان!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٢٤٥٨ ج/٤}.

١٤٢٦- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بنِ اَلزُّبَيْرِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { قَضَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّ اَلْخَصْمَيْنِ يَقْعُدَانِ بَيْنَ يَدَيِ اَلْحَاكِمِ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{ضعيف أبي داود: ٧٦٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دا کەدەبێ هەردوو هاوداواکان لەدادگا، لەبەردەم دادوەردا، وەك یەك بەیەکسانی دابنیشن!).

{ضعیف أبي داوود!/٧٦٩}.

**(ڕوونکردنەوە):**

مەبەست لەناوەڕۆکی ئەم فەرموودەیە: ئەمەیە کە دادوەر بەیەك چاو تەماشای هەردوو هاوداواکان بکات، وە خودی دانیشتن لەزاتی خۆیدا مەبەستی سەرەکی فەرموودەکە نییە.

## ٨٩- باسی شایەتی
## بَابُ: الشَّهَادَاتِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول/٣، زنجیرە: ١١٦ و ١١٧ لە ژمارە: ٢٤٧٨ هەتا ژمارە: ٢٤٨١ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٤٠١، لاپەڕە: ١٠٦٣}.

١٤٢٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ اَلْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ اَلشُّهَدَاءِ؟ اَلَّذِي يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥٩ = ٤٤٦٩ شیحا = مسلم/ ترقیم محمد فؤاد/١٧١٩. ترمذی. شهادات/٢٢٩٥، ٢٢٩٦، ٢٢٩٧. أبو داود. أقضية/٣٥٩٦}:

زەیدی کوڕی خالیدی ئەلجوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەسا باپێتان بڵێم کە شایەتی باش کامەیە؟ ئەو شایەتەیە کە لەخۆیەوە بەبێ پێگوتن‌و روو لێنانی کەسێ، ئەو شایەتیی خۆی بدا). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٢٤٧٥}.

١٤٢٨- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ اَلَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ اَلَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَكُونُ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذُرُونَ وَلَا يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمْ اَلسِّمَنُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١١٨ = بوخاری/٢٦٥٢، ٣٦٥١، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٩٥، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨. مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٧٤٣ = شیحا/٦٤٢٢ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/٢٥٣٥. نسائی. أيمان ونذور/٣٨١٨ تحفة الأشراف/١٠٨٢٧}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشترینی چینی ئێوە چینی هاوچەرخی خۆمە، کەچینی هاوەڵانە، کە ناسراون بەچینی صەحابەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوجا چینی دوای ئەوان، کە چینی دووەمی موسوڵمانانن، کە ناودارن بە تابیعین، کە بەکوردی پەیڕەوان‌و شوێنکەوتوانیشیان پێ دەگوترێ، ئەوجا چینی دوای ئەوان کە پێیان دەگوترێ: چینی ئەتباعی تابیعین، کەچینی سێیەمی موسوڵمانانن، ئەوجا چینی دوای ئەوان کەچینی چوارەمی موسوڵمانانن). عیمران فەرمووی: باش نازانم کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەپاش چینی خۆی دوو چینی فەرموو، یا سێ چینی تری فەرموو، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیتر لەپاش ئەم چینانە، کەسانێ وەها پەیدا دەبن، کۆو سڵ ناکەنەوە لە شایەتی دان‌و سوێند خواردن، هێشتا کەسێ داوای شایەتی دانی

لێیان نەکردووە، ئەوان لەخۆیانەوە، پێش ئەوە کە بەباشی لە حاڵەکە حاڵی ببن، شایەتی دەدەن!

گزی‌و ناپاکی لەسپاردەو شتی وا دەکەن‌و بەڕاستی ناپاک‌و گزیکار خۆیانن‌و، ئاهو نەزریش دەکەن‌و جێبەجێی ناکەن، بەرە بەرە قەڵەویی لەناویانا پەرە دەستێنێ!!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٢٤٨٠ + تاج/٣، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢١. چاپی چوارەم}.

١٤٢٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {"لَا تَجُوزُ شَهَادَةُ خَائِنٍ، وَلَا خَائِنَةٍ، وَلَا ذِي غِمْرٍ عَلَى أَخِيهِ، وَلَا تَجُوزُ شَهَادَةُ اَلْقَانِعِ لِأَهْلِ اَلْبَيْتِ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ.

{حَسَنٌ، إِرْوَاءُ الغليل/٢٦٦٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شایەتی ناپاک، ژن بێ یا پیاو، دروست نییە، هەروەها شایەتی کەسێ ڕقی لەبرایەکی موسوڵمانی خۆی بێ‌و دەغەزی لێ بکێشێ، شایەتی ئەم جۆرە کەسە کە لەدژی ئەوبرا موسوڵمانەی بێ دروست نییە،هەروەها شایەتیی کەسێ کە دەست‌و پێوەندی خێزانێ بێ، شایەتی دانەکەی بۆ ئەم خێزانە دروست نییەو قەبووڵناکرێ!).

{تاج/٣، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٢٤٧٦}. لەتاجا لەم شوێنەدا ئاوایە:

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە، لە باپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شایەتی ئەمانەی قەبووڵ نەدەکرد:

یەکەم: شایەتیی پیاوو ژنی ناپاک، کە ناپاکی لەسپاردە بکا، چی سپاردەی خودا، وەچی سپاردەی بەندەی خودا.

دووەم: شایەتی کەسێ کۆنەقینی لەدڵا بێ‌و شایەتی بدا لەدژی برای ئایینی خۆی، هەروەها شایەتی دەستوپێوەند بۆ خاوەن ماڵ، بەڵام دەست‌و

پێوەنـدی ماڵی، ئەگـەر شایەتی بـۆ کەسێکی تـر بدایـە قـەبووڵی دەکـرد. لـە گێڕانەوەیەکا:

شایەتیی پیاوو ژنی ناپاكو پیاوو ژنی شەرشواڵپیس دروست نییە.

١٤٣٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "لَا تَجُوزُ شَهَادَةُ بَدَوِيٍّ عَلَى صَاحِبِ قَرْيَةٍ" } رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ.

{صحيح، إرواء الغليل/٤٦٧٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم لـەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (شایەتیی کۆچەری دەشتنشین، لەسەر گوندنشین دروست نییە).

١٤٣١- وَعَنْ عُمَرَ بْنِ اَلْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّـهُ خَطَـبَ فَقَـالَ: إِنَّ أُنَاسً كَانُوا يُؤْخَذُونَ بِالْوَحْيِ فِي عَهْـدِ رَسُـولِ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) وَإِنَّ اَلْوَحْيَ قَدْ اِنْقَطَعَ، وَإِنَّمَا نَأْخُذُكُمْ اَلْآنَ بِمَا ظَهَرَ لَنَا مِنْ أَعْمَالِكُمْ } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{البخارى/٢٦٤١}:

عومەری کوڕی خـەطاب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) وتـارێکی دا فـەرمووی: ڕاستە کە لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) کەسـانی وەها هەبوون، کە بەپێی نیگای ئاسمانی پاكو پیس دەکرانو پاکیان لەپێسیان جیادەکرایەوە، بەڵام بێگومان ئێستا هاتنی نیگا لە ئاسمانەوە کۆتـایی هـاتووە، کە پێغەمبـەر مـرد، ئـیتر شـتی وا نـەما، دەی هۆشـیاربن کەئێـستا ئێمـە لـە سـونگەی کردەوەکانتانـەوە بایـەختان بـۆ دائـەنێین، خـاوەنی کـردەوەی بـاش بڕیاری باشی بۆ دەدەینو خاوەنی کردەوەی خراپ، بڕیاری مرۆڤی خراپی بـۆ دەدەین).

١٤٣٢- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّهُ عَدَّ شَهَادَةَ اَلزُّورِ فِي أَكْبَرِ اَلْكَبَائِرِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ فِي حَدِيثٍ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١١٩ = ٢٦٥٤، ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٢٧٤، ٦٩١٩ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٤٦ = شیحا/٢٥٥ = مسلم/محمد فؤاد/٨٧}:

لە بوخاریو موسلیمدا ئاوەهایە:

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکرە (رەحمەتو رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: لەخزمەتی خۆشەویستا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی ئاگاداربن، گوێبگرن با پێتان بڵێم: کە گەورەترین گوناهی گەورە کامانەن؟).

سێجار ئاوای فەرموو، گوتیان: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! گوێمان لێتە. فەرمووی: (هاوەڵ برپیاردان بۆ خودای تاكو تەنهاو، دڵڕەنجاندنی باوكو دایكو شایەتی درۆ) یا فەرمووی: (قسەی ساختەو شایەتی ناهەق).

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمکاتەدا شانی دادابوو، جا بۆ گرنگی دان بەمەیان، راست دانیشتو خۆش خۆش هەر دەیفەرموو: (وە شایەتی درۆ، وە شایەتی درۆ). ئیتر ئەم رستەیەی ئەوەندە دووبارە کردەوە هەتا بەزەییمان پیادا هاتەوەو مەترسی ئەوەمان هەبوو کە ئەوەندە دووبارەی بکاتەوە ماندووی بکات، لەبەرئەوە لەبەر خۆمانەوە دەمانگوت خۆزگە بێ دەنگ دەبوو). {تاج/٣/٣١٠ = زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ٢٤٧٤، لاپەڕە: ١٠٨، چ/٤ ش/ت}.

١٤٣٣- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لِرَجُلٍ: "تَرَى اَلشَّمْسَ ؟" قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "عَلَى مِثْلِهَا فَاشْهَدْ، أَوْ دَعْ"} أَخْرَجَهُ اِبْنُ عَدِيٍّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ فَأَخْطَأَ.

{المستدرك/٥ ٤ ٠ ٧. وَقَالَ الذَّهَبِي: وَاهٍ}:

**ئیبنـو عـەبباس (رەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) بـەپیاوێکی فەرموو: (خۆ ئـەو گۆی خۆرە دەبینی کەوا بە بەرچاوی هەموانە؟) پیاوەکە کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو گوتی: (بـەڵێ زۆر بـاش دەیبینـم). پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی پێی: (دەی هەرکاتێ شتەکە ئاوا روونو ئاشکرا بـوو وەك ئـەو گۆی خۆرە بە ئاسمانەوە، ئەوا شایەتی خۆت بدە، دەنا وازبێنەو شایەتی مەدە!).**

**دانەر پێشەوا عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: ئیبنـو عەدی ئەم فەرموودەی بەرشتەیەکی لاواز دەرهێناوەو حاکم بەهەڵەدا چووە کە بەتەندروستی دانەوە.**

١٤٣٤- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم) قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ. وَأَبُو دَاوُدَ. وَالنَّسَائِيُّ وَقَالَ: إِسْنَادُهُ جَيِّدٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥٤ = شيحا/٤٤٤٧ = محمد فؤاد/١٧١٢}:

**ئیبنو عەبباس (رەزای خودایـان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری دەدا بۆ ئەوکەسە کە سوێند بخوا کە شتەکە هی ئـەوەو پرسـەکە وەك ئـەو دەڵێ وایـە، بەمـەرجێ یـەك شـایەتی تـری هـەبێ، بێجگە لەخۆی کە شایەتی بۆبدا کە شتەکە هی ئـەوەو قسەکەی راستە). لـە موختەصەری صەحیحی موسلیما، لەم شوێنەدا دەفـەرموێ: ئـەم فەرموودەیـە لە تاجول ئوصولدا ئاوا کـراوە بـەکوردی: ئیبنـو عـەبباس (رەزای خودایـان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەسـوێندی داواکـارو بە شایەتێ، بڕیاری دا بـۆ داواکـار – م/د/ت/ن). {تـاج/٣، زنجیرە: ١١٦، ژمـارە: ٢٤٧٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

١٤٣٥- وَعَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) مِثْلَـهُ. أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح، إرواء الغليل/٢٦٨٣}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسوێندو بە شایەتێ بڕیاری دا بۆ خاوەن سوێندو خـاوەن شـایەتەکە). ئـەبو داوودو تەرمـەزی دەریانهێنـاوەو ئیبنـو حیببـان بـە تەندروستی داناوە. {أبو داوود/٣٦١٠ + ترمذی/١٣٤٣}.

## ٩٠- باسی داواکاریو بەڵگەکان
## بَابُ: الدَّعَاوَى وَالبَيِّنَاتِ

١٤٣٦- عَنِ ابْنِ عَبَّـاسٍ (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا)" أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: { "لَوْ يُعْطَى اَلنَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، لَـادَّعَى نَـاسٌ دِمَـاءَ رِجَـالٍ، وَأَمْـوَالَهُمْ، وَلَكِنِ اَلْيَمِينُ عَلَى اَلْمُدَّعَى عَلَيْهِ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٦٧ = بوخاری: ٤٥٥٢، ٢٥١٤، ٢٦٦٨ + تەجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ١٧٥ = بوخاری/٢٥١٤. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥٣ = شیحا/٤٤٥٠}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم خەڵکە ئەگەر بەقسەی رووتو بـە داوای بێ بەڵگە، داوای هەرچی بکەنو پێیان بدرێ، ئەوا گەلێ کەس بـەناڕەوا، داوای سـەرو مـاڵو ناموسـی زۆر کەسـی تـر دەکـەن، وەوای لێ دێ دەبـێ بەتێکـەو لێکەو بگرەو بـەردەو، سـەرەنجام کـەس لەسـەرو مـاڵو ناموسـی خـۆی دڵنیـا نابێ، بۆئـەوەی کـە نـەبێ بەپاشا گـەردانی، بەڵگـە لەسـەر داواکـارە، تـەنیا بـۆ

لابردنـی گومـان سـوێند لەسـەر داوالێکـراوە). {تـاج/٣، زنجـیرە: ١١٤، ژمـارە: ٢٤٧٠}.

١٤٣٧- وَلِلْبَيْهَقِيِّ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ: { "اَلْبَيِّنَةُ عَلَى اَلْمُدَّعِي، وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ }.

{صحيح، إرواء الغليل/٢٦٦١}:

ئەمە لەکۆتایی ژمارەی پێشەوە رابورد بەبێ زیادو کەم.

١٤٣٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) { أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) عَرَضَ عَلَى قَوْمٍ اَلْيَمِينَ، فَأَسْرَعُوا، فَأَمَرَ أَنْ يُـسْهَمَ بَيْـنَهُمْ فِـي اَلْـيَمِينِ، أَيُّهُـمْ يَحْلِفُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٢٤ = بوخاری/٢٦٧٤}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـشنیاری کـرد بـۆ هـۆزێ، کـە لـەرووداوێکا سـوێند بخـۆن، ئـەوانیش بـەبێ سێو دوو، گـشتیان پـەلاماریان دا کـە سـوێند بخـۆن، ئـەویش فەرمانی فەرموو کە تیرو پشك بکـەن لـەناو خۆیانـا، هـەتا کـێ نـاوی دەرچـوو ئەوە سوێند بخوات. {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٢٤٨٦}.

١٤٣٩- وَعَنْ أَبِي أُمَامَةَ اَلْحَارِثِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { " مَنْ اِقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ اَللَّهُ لَهُ اَلنَّـارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ اَلْجَنَّةَ" . فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا يَا رَسُولَ اَللَّهِ؟ قَـالَ: "وَإِنْ قَضِيبٌ مِنْ أَرَاكٍ" } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠١٦ = شيحا/٣٥١ = مسلم تـرقيم محمـد فؤاد عبدالباقی/١٣٧}:

ئـەبو ئومامـەی حـاریثی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کەسـێ بـە سـوێندی ناهـەق، مـافی

مرۆیەکی موسوڵمان بپچڕێو بەناهەق بیکا بەهی خۆی، خودای گەورە ئاگری دۆزەخی بۆ پێویست دەکاو بەهەشتی لەسەر قەدەغە دەکا).

پیاوێ عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باشتێکی کەمیش بێ؟ فەرمووی: (با پەلکە دار سیواکێکیش بێ).

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو ئومامەی ئەلحاریثی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، ئەنصارییە، لەهۆزی بەنی حاریثەیە، بۆیە پێی دەگوترێ (الحارثي) زۆرتر بە کونیەکەیەوە ناسراوە، خوشکەزای ئەبو بوردەی کوڕی نیارە.

١٤٤٠- وَعَنِ الْأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، هُوَ فِيهَا فَاجِرٌ، لَقِيَ اَللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٣٦ = بوخاری/٢٣٥٦، ٢٤١٦، ٢٥١٥، ٢٦٦٦، ٢٦٦٩، ٢٦٧٣، ٢٦٧٦، ٤٥٤٩، ٦٦٥٩، ٦٦٧٦، ٧١٨٣، ٧٤٤٥، ٢٣٥٧، ٢٤١٧، ٢٥١٦، ٢٦٦٧، ٢٦٧٠، ٢٦٧٧، ٧١٨٤. مسلم ترقيم شيحا/٣٥٣ = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/١٣٨}:

لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ بە ناهەق سوێند بخوا، هەتا بەو سوێنە ناڕەوایە ماڵی کەسێکی تر بپچڕێ بۆ خۆی، ئەوە کاتێ دەچێتەوە دیوانی خودا لەڕۆژی ژینەوەدا، خودای گەورە زۆر تووڕەیە لێی).

جا خودا بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - ئالی عیمران - ٣/٧٧}:

واته: (ئەو کەسانەی کە پەیمانی خوداو سوێندی خۆیان دەفرۆشن، بە بەهایەکی کەمیی دنیایی دەیانگۆڕنەوە، ئەوانە لەڕۆژی پاشە ڕۆژدا، بێ بەش‌و بارەن لەهەموو خۆشییەکی قیامەت، وە خودای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکا، بەچاوی میهرو ڕەحمەتیشەوە تەماشایان ناکات، وە رووی خۆشیان ناداتێ‌و پاکیان ناکاتەوەو تاریفیان ناکا، سەرەڕای ئەوەیش سزاو ئازاری سەختیان بۆ ئامادە کراوە!).

جا ئەشعەثی کوڕی قەیس هات گوتی: (ئەوە باوکی عەبدوڕەحمان — واتە: ئیبنو مەسعوود — چییان بۆ باس دەفەرموێ؟ ئەم ئایەتە پیرۆزە هۆی هاتنی من بووم، داستانەکەی ئاوا بوو:

(بیرێکم هەبوو، لەزەوی ئامۆزایەکما بوو، ئامۆزاکەم حاشای لێ کردو گوتی: بیری خۆمەو لەزەوی خۆمایە، مافی کەسی تری پێوەنییە، جامنیش بۆ دادگایی کردن بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کوا شایەتەکانت ئامادەیان بکە، هەتا شایەتیت بۆ بدەن). گوتم: شایەتم نییە، فەرمووی: (دە سوێندی بدە) عەرزیمکرد: قوربان! سوێند دەخوات دەربەستی سوێند نایەت. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم فەرموودەیەی فەرموو، لەدواییشدا، بۆ پشتیوانی فەرموودەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خودای گەورە ئەم ئایەتەی خوێندرایەوە ناردە خوارەوە).

(ڕوونکردنەوە):

ئەشعەثی کوڕی قەیسی کیندی، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوبێ) ناوی دایکی کەبشەی کچی زەیدە، کاتێ نوێنەرەکانی هۆزی کیندە هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەساڵی دەی کۆچیدا، ئەشعەث سەرۆکیان بوو، نزیکەی شەست سوار بوون، هەموویان موسوڵمان بوون، لەسەردەمی نەفامیدا

ئەشعەث سەرۆكێكی قسە رۆیشتوو بوو، هۆزەكەی لە فەرمانی دەرنەدەچوو، هەروا لەسەردەمی ئیسلامیشدا، بەڵام جێگەی داخە كە لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ هۆزەكەیدا، لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، هەتا لەسەردەمی جێگەنشینی ئەبوبەكری صەدیقا بەیەخسیری هێنایان بۆلای ئەبوبەكری صەدیق. ئەبوبەكر دەستیكرد بە سەرزەنشتیو یەكە یەكە كارە خراپەكانی دایەوە بەچاویداو پێی دەگوت: ئەمەت كردو ئەوەت كرد، ئەویش هەر وەڵامی ئەوی دەدایەوە، هەتا ئەشعەث بە ئەبوبەكری فەرموو: (تۆ لەبەرئەوەی كە سەرۆكی موسوڵمانانی، جەنگو شەڕو شۆڕی زۆرت وا لەپێشەوە، مەمكوژە هەڵمگرە بۆ ئەو جەنگانەی خۆت، وە بۆ دروستبوونی متمانەو دڵنیایی لەنێوانی منو تۆدا، خۆشكێكی خۆشتم لێ مارە بكە، ئەبوبەكریش بەگوێی كرد، هەم بەخشی، هەم خوشكی خۆیی لێ مارەكرد، كە خوشكەكەی ناوی ئوم فەروەی كچی ئەبو قوحافە بوو، منداڵێكی لە ئەشعەث بوو ناوی نا موحەممەد، لەوەدوا بە ئوم فەروەیان دەگوت: دایكی موحەممەد.

كاتێ پێشەوا عومەری كوڕی خەتاب بوو بەجێنشین، ئەشعەث لەگەڵ جەنگاوەرانی هۆزەكەیدا لەگەڵ سوپاكەی سەعدی كوڕی ئەبو وەققاصدا هاوبەشییان كرد لە نەبەردەكانی قادسییەدا، لەعێراقو لە مەدائینو لە جەلەولاو لە نەهاوەند.

لە كووفە خانوویەكی شایستەی دروست كردو تیادانیشت، وە لەساڵی (٤٢) چلو دووی كۆچی لە كووفە، بە مردنی خودا دەمرێو حەسەنی كوڕی عەلی نوێژی تەرمی لەسەردەكا.

١٤٤١- وَعَنْ أَبِي مُوسَى اَلْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَجُلَيْنِ اِخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي دَابَّةٍ، لَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ،

فَقَضَى بِهَا رَسُولُ اَللَّهِ. بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ وَهَذَا لَفْظُهُ، وَقَالَ: إِسْنَادُهُ جَيِّدٌ.

{المسند/٤/٤٠٢. أبو داود/٣٦١٣. نسائي/٨/٤٨٧. ابن ماجة/٢٣٣٠. ابن حبان/٥٠٦٨}:

**ئەبو مووساى ئەشعەرى (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: دوو پیاو لەسەر وڵاخێ ناکۆکییان بوو، بۆ دادگایی هاتن بۆ لای پێغەمبەر، کەسیان بەڵگەیان نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خوداى لەسەر بێ) بڕیاری دا کە بەنیوەیی بۆ هەردوو لایان بێ).**

١٤٤٢- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { "مَنْ حَلَفَ عَلَى مِنْبَرِي هَذَا بِيَمِينٍ آثِمَةٍ، تَبَوَّأَ مَقْعَدَهُ مِنْ اَلنَّارِ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{ابو داود/٣٢٤٦. ابن ماجة/١٨٨٣. صحيح إرواء الغليل/٢٦٩٧}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوداى لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەسەر ئەم دوانگەی منە، سوێندی ناڕەوا بخوات، ئەوە لەناو ئاگری دۆزەخا جێگە بۆ خۆی ئامادە دەکا).**

١٤٤٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اَللَّهُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلَاةِ، يَمْنَعُهُ مِنْ اِبْنِ اَلسَّبِيلِ" وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ اَلْعَصْرِ، فَحَلَفَ لَهُ بِاَللَّهِ: لَأَخَذَهَا بِكَذَا وَكَذَا، فَصَدَّقَهُ، وَهُوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ" وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِلدُّنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا، وَفَى، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا، لَمْ يَفِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٣٧ = بوخاری/٢٣٥٨، ٢٣٦٩، ٢٦٧٢، ٧٢١٢، ٧٤٤٦. ریاض/٤، لاپەڕە: ٣٢٨، ژمارە: ١٨. مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٦٠ = شیحا/٢٨٩ = مسلم/١٠٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی دواڕۆژدا، ئەم سێ جۆرە کەسانە، خودا نە لەرووی نازەوە قسەیان لەگەڵ دەکاو نە بەچاوی سۆزو میهرەبانی تەماشایان دەکاو نە تاریفیان دەکا، سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی پڕ ئێش‌و ئازاریان بۆ هەیە:

یەکەم تاقمە: ئەو جۆرە کەسە کە زیادە ئاویان هەیەو ئاوەکە لەپێداویستی خۆیان زیادەو ئاوەکە لەسەرە ڕێدایەو لەڕێبوارو کەسانێ کە پێویستی‌یان بەو ئاوە هەیە، قەدەغە دەکەن.

دووەم تاقمە: ئەو جۆرە کەسانەن کە لەپاش عەصر، کەکاتی بازاڕ داخستن‌و دوکان هەڵگرتن‌و بەرزەوە بوونی فریشتەکانە، لەگەڵ کردەوەی ڕۆژی بەندەکاندا، کەچی ئەوان لەوکاتە ناسك‌و پیرۆزەدا، لەسەر مامەڵەو سەودا، بۆ تەفرەدانی کڕیار، سوێندی درۆ دەخۆن، وەك ئەوە فرۆشیار بە کڕیار بڵێ: بەو تاقە خودایە، کە بێجگە لەخۆی خودای تر نییە، لەپێش تۆدا ئەوەندەو ئەوەندەیان داوە پێم نەمداوە، گەلێ زیاتر لەو نرخەی تۆ دەیدەی بەمن پیاوێکیش بڕوا بەدرۆکەی بکاو شتەکەی بەو نرخە درۆیە لێ بکڕێ.

تاقمەی سێیەم: ئەو جۆرە پیاوانەن کە پەیمان دەدەن بە پێشەوای موسوڵمانان‌و سەیری بەرژەوەندی دنیایی خۆیان دەکەن، ئەگەر پێشەوا بەشی دان، ئەوانیش بەگوێی دەکەن، ئەگەر پێشەواکەیان بەشی نەدا پێیان، ئەوانیش ناڕازی دەبن‌و بەگوێی ناکەن.

١٤٤٤- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَجُلَيْنِ اِخْتَصَمَا فِي نَاقَةٍ، فَقَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا نُتِجَتْ عِنْدِي، وَأَقَامَا بَيِّنَةً، فَقَضَى بِهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِمَنْ هِيَ فِي يَدِهِ }.

{سُنَنُ الدَّارَ قُطْنِيِّ/٤/٢٠٩/٢١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: دووپیاو لەسەر وشترە مێنگەیێ بوو بەناکۆکییان، هەرکەسەیان دەیگوت: هی خۆمە، گوێرەکە وشتری دەرماڵی خۆمەو لەماڵی خۆما لەدایك بووە، هەر کەسەشیان لەلای خۆیەوە بەڵگەی خۆی ڕاست کردەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەئەنجاما بڕیاریدا: کە لەدەستی کامیانایە بۆ ئەوەیان بێ!).

١٤٤٥- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَدَّ اَلْيَمِينَ عَلَى طَالِبِ اَلْحَقِّ } رَوَاهُمَا اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَفِي إِسْنَادِهِمَا ضَعْفٌ.

{ضعيفٌ، إرواء الغليل/٢٦٤٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دوو کەس لەسەر شتێ، لەخزمەت پێغەمبەردا بوو بەکێشەیان، کەسیان بەڵگەیان نەبوو، داوالێکراو نەیویست کە سوێند بخوات، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوێندی ڕوو بەڕووی داواکار کردەوە، ئەگەر سوێند بخوا داواکە دەباتەوە، دەنا نا).

١٤٤٦- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) { قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُورًا، تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ. فَقَالَ: "أَلَمْ تَرَيْ إِلَى مُجَزِّزٍ اَلْمُدْلِجِيِّ ؟ نَظَرَ آنِفًا إِلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ، وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: " هَذِهِ أَقْدَامُ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٤٦٩ = ٣٧٣١، ٣٥٥٥، ٦٧٧٠، ٦٧٧١ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٣ = شیحا/٣٦٠٢ = مسلم

تـرقيم محمـد فـؤاد عبـدالهادى/١٤٥٩ + أبـو داود. طـلاق/٢٢٦٨. ترمـذى. ولاء/٢١٢٩. نسائى. طلاق/٣٤٩٣}:

له موختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:

عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لـە پێغەمبـەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: ڕۆژێ، حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هـات بۆلام، زۆر کـەیفی خـۆش بـوو، لەخۆشـیانا نـوور لـەڕووی دەبـاری. فـەرمووی: (ئـەی عائیـشە! دەزانیـت کـە موجـەزیززی مودلەجی کە شێوە ناسـێکی بـەناوبانگ بـوو، هـات بـۆلام، لەوکاتـەدا ئوسـامەو زەیدی باوکی ئوسـامە، لـەژێر پارچـەیێ قەدیفـەدا راکشابوون، سـەری خۆیـان داپۆشی بوو، بەڵام قاچیان بەدەرەوە بوو، ئوسامە رەش بوو، زەیـد سـپی بـوو، هەنـدێ ناحـەز دەیـانگوت: چـۆن دەبـێ بـاوك سـپیو کـوڕ ڕەش، موجـەزیزز لەسەر ئەم حاڵە کە چاوی پێیان کەوت، یەکسەر گوتی: خـاوەنی ئـەم قاچـانە باوكو کوڕن). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٢، ژمـارە: ٢٢٥٦ — ش/د/ت/ن = چ/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- دادوەری کـارێ ئـاڵۆزە، زۆرینـەی دادوەرەکـان دادپـەروەرنین، بگـرە هەندێکیان گوێ بە حەڵاڵو حەرامیش نادەن، هەتا ئەم سـەردەمەی ئێمـەیش ئەمە هەروایە، دادوەرەکان نموونەی گەندەڵیو نادادین!!

٢- قـەبووڵی دادوەری، بـەنیازی پـاك، لەگـەڵ شایـستەیـیدا کـارێ زۆر پەسەندە، مایەی ڕەزای خودایە.

٣- ئەگەر دادوەر شیاوی تەواوی هەبێ، لەکاتی دادگاییدا، درێغی نـەکا، بەپێی توانا بگەڕێ بەشوێن ڕاستیدا، ئەگەر لەکاتی بڕیاردانـدا هەڵـەیش بکـا، بەخێر بۆی دەنووسرێ.

٤- لەکاتی توورەیی‌و رقهەڵسانا، نابێ مرۆڤ شت بڕیاربدا یا دادگایی کەسێ بکا.

٥- دەبێ دادوەر لەنێوان هاو داواکاندا بێ لایەن بێ‌و بەیەك چاو تەماشایان بکاو وەك یەك گوێ لەهەردوو لا بگرێ.

٦- بڕیاری دادوەر بەپێی رووکارە، لەبەرئەوە بەبڕیاری دادوەر، داوای ناڕەوا نابێ بەڕەوا، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێ لە دادگا، بە ناڕەواو بە بەڵگەی ساختە، داوایەکی بردەوە، حەرامە کە ئەو داوایە وەربگرێ، گریمان وەریشی بگرێ پێی حەرامە، پێویستە لە نزیکترین هەلدا شتەکە بداتەوە بەخاوەنی‌و تەوبە بکا لەو هەڵەیەی کە کردوویەتی، دەنا لای خودا تاوانبارەو ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی دابین دەکات. خوا پەنامان بدا.

٧- هەر گەل‌و نەتەوەیێ مافی بێ هێز لە خاوەن هێز نەسەنێ، پیرۆزیی مسۆگەر ناکا بۆ خۆی.

٨- لەڕۆژی زینەوەدا، دادوەری دادپەروەر تووشی لێپێچینەوەی سەخت دەبێ، جا دەبێ دادوەری نادادپەروەر حاڵی چۆن بێ.

٩- بە ئەزموونێکی حاشا هەڵنەگری دوورو درێژ چەسپاوە، کە پیاو شیاوترە بۆ زۆر لە پلەو پایە کۆمەڵایەتی‌و سەربازی‌و سیادیەکان، وەك سەرۆکایەتی‌و پادشایی‌و سەرکۆماری‌و ئەفسەری‌و جەنگاوەری‌و سەربازی‌و پاڵەوانبازی‌و شتی تری لەم بابەتانە، ئیتر ئەو خەڵکە حەسوودە چی دەڵێن با بڵێن.

١٠- فەرمانڕەوایی‌و کاربەدەستی‌و بەرپرسیی ئەرك‌و فەرمانە، نەوەك لرف لێدان‌و تاڵان‌و فڕکان فڕکان، لەبەرئەوە دەبێ هەمیشە کاربەدەست لەناوجەرگەی جەماوەرەکەدا بژی‌و هەست بکا بە ئێش‌و ئازاریان‌و خۆی لەوان جیا نەکاتەوە.

١١- نەفرەت، کە بەریبوونو بێ بەشبوونە، لە رەحمەتو میهرەبانی خودا، نەفرەت کراوە لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆرو لە دەڵاڵی نێوانیان، ئەو بەرتیلە نابێ بەماڵی بەرتیل وەرگر، هەتا هەتایە پێی حەرامە، پێویستە لەسەری چی بەرتیلێکی وەرگرتووە، زوو یا درەنگ بێداتەوە بەخاوەنی!!

١٢- نیشانەی خراپبوونو گەندەڵبوونی رۆژگار، ئەوەیە کە شایەت گەندەڵ بێ، سپاردە نەمێنێو لەجێی دەستپاکی دزیو فزی بێو پەیمان نەبڕێتە سەرو لەناو خەڵکا قەڵەوی پەرە بستێنێ!

١٣- کۆمەڵێ کەس شایەتییان دروست نیە، لەپێشەوە باسکران.

١٤- کاروکردەوەی باش، نیشانەو بەڵگەی باشیی خاوەنەکەیانە، هەروا بە پێچەوانەیشەوە کاری بەدنیشانەی بەدیی خاوەنیەتی. (كُلٌّ مَيْسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ: چی رێگەیەك بگری، بۆ ئەوێ دروستکراوی).

١٥- وا پەسەندو باشە کەشایەت کاتێ شایەتی بدات، کە زانستی تەواوی لە بابەتەکەدا هەبێ، تفەنگ بەتاریکییەوە نەنێ، وە لەپێش هەموو شتێکا مەبەستی لە شایەتییەکەی خزمەتی حەقو راستی بێ.

١٦- شایەتی ناڕەوا تاوانێکی گەڵێ گەورەیە، هۆی مسۆگەر بوونی رقی خوداو چوونە دۆزەخە.

١٧- گوناهی سوێند گەڵێ جار بەهۆی کاتەوە، وەك پاش عەصر لە مامەڵەو سەودادا، یا بەهۆی شوێنەوە وەك لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەر، گوناهو تاوانەکەی چەند قاتە.

١٨- بڕیاری شێوە ناس (قائیف) بۆ سەلماندنی نەسەبو نژادو بنەچەو رەچەڵەك کارێ پەسەندە، بەتایبەتی لەکاتێکا ئەگەر هەمهەمەو قاوەیێ لەنێواندا هەبێ.

١٩- لەهەندێ بارو دۆخا، دروستە کاربەدەوو تیرو پشك (قورعە) بکرێ.

# ١٦- نامەی کۆیلە ئازادکردن
# كِتَابُ العِتْقِ

{بڕوانــە: موختەصــەری صــەحیحی بوخــاری، ناســراو بــە تەجریــدی بوخــاری، بــەرگی/٣، لاپــەڕە:١٧٦، زنجــیرە: ٥٤، فــەرموودەی ژمــارە: ١٠٨٣ هــەتا ژمــارە: ١٠٩٤ = ٢٥١٧ هــەتا ٢٥٦٠ بوخــاری + باســی کۆیلــە ئــازادکردن لــە فیقهــی ئاســان/٢، زنجــیرە: ٤٠٧، لاپــەڕە: ١٠٧٤ هــەتا زنجــیرە: ٤١٧ + تــاجول ئوصــول/٢، لاپەڕە: ٤٤٥، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٠٠٩ هەتا ٢٠٢٣ + ریاض والصالحین/٣، زنجیرە: ٢٣٦، ژمارە: ١٣٥٨ هــەتا ١٣٦٥ + ریــاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، لــە ژمــارە: ١٦٠٠وە هــەتا ژمارە: ١٦٠٨}.

## ٩١- باسی بەندە ئازادکردن

١٤٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "أَيُّمَا امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ اِمْرَأً مُسْلِماً، اِسْتَنْقَذَ اَللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ النَّارِ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٨٣ = بوخاری/٢٥١٧، ٦٧١٥. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩١ = ٣٧٧٦ صحيح مسلم ترقيم الشيخ الخليل مأمون شيحا = صحيح مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالهادى/١٥٠٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەر بوو، دەیفەرموو: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی کۆیلە ئازاد بکا، خودا لەجیاتی هەر ئەندامێکی ئەو کۆیلەیە، ئەندامێکی ئەو ئازادکارە، لەئاگری دۆزەخ ئازاد دەکا، تەنانەت دامەنو شەرمگای لەجیاتی دامەنو شەرمگای ئەو ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٠١٠ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٤٤٨- وَلِلتِّرْمِذِيِّ وَصَحَّحَهُ" عَنْ أَبِي أُمَامَةَ: { "وَأَيُّمَا امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ امْرَأَتَيْنِ مُسْلِمَتَيْنِ، كَانَتَا فِكَاكَهُ مِنَ النَّارِ" }.

{صحيح الجامع: ٢٧٠٠}:

ئەبو ئومامە (ڕەزای خوودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خودای لەسەر بێ) (هەر موسوڵمانێ، دووژنی موسوڵمانی کۆیلە ئازاد بکا، دەبن بەکلیلی ڕزگار بوونی لەئاگری دۆزەخ).

تەرمەزی گێڕاویەتەوەو بەتەندروستی داناوە.

١٤٤٩- وَلِأَبِي دَاوُدَ: مِنْ حَدِيثِ كَعْبِ بْنِ مُرَّةَ: { "وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ أَعْتَقَتْ امْرَأَةً مُسْلِمَةً، كَانَتْ فِكَاكَهَا مِنْ اَلنَّارِ}.

{صحيح الجامع: ٢٧٠٠}:

کەعبی کوڕی موررە (ڕەزای خوودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر ژنێ، ژنێکی موسوڵمانی کۆیلە ئازاد بکا، دەبێ بە کلیلی ڕزگاربوونی لەئاگری دۆزەخ!).

(ڕوونکردنەوە):

کەعبی کوڕی موررەی ئەل - بەهزی ئەل سُلَمِی، هاوەڵی پێغەمبەرە لەئوردون لەشام دادەنیشت، هەر لەوێ لە ساڵی (٥٩) پەنجاو نۆدا بە مردنی خودا مردووە، شەرەحبیلی کوڕی (السمط) فەرمووده‌کانی دەگێڕێتەوە، لەپێشا لەبەصرە دائەنیشت ئەوسا چوو بۆ ئوردون. ڕۆژێ شەرەحبیل عەرزی دەکا: ئەی کەعبی کوڕی موررە! فەرموودەمان پێ بفەرموو بەڵام ئاگات لەخۆت بێ، فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لە پێغەمبەر بوو، دەیفەرموو: (درودی خودای لەسەر بێ) (هەر موسوڵمانێ لەپێناوی ئیسلامدا پیر ببێ، خەریکی خزمەتی ئایینی ئیسلام بێ، لەهەر ڕوویەکەوە بێ، هەتا پیری دێت بەپیریەوە، ئەوە ئەو پیرییە لەڕۆژی زیندووەدا بۆی دەبێ بەچرای نوور!).

١٤٥٠- وَعَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { قَالَ: سَأَلْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَيُّ اَلْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ" . قُلْتُ: فَأَيُّ اَلرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: " أَعْلَاهَا ثَمَنًا، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ".

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٨٤، مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٦ = شیحا ٢٤٦ = مسلم ترقیم محمد فؤاد/٨٤ + بوخاری: ٢٥١٨، نسائی: ٣١٢٩. ابن ماجة: ٢٥٢٣}:

له موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوادای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باشترین کار چییە؟ فەرمووی: (ئیمانو باوەڕ بەخوداو، خەباتو تێکۆشانو غەزاکردن لەپێناوی خودادا، فەرمووی: گوتم: ئەی کام جۆرە بەندەو کۆیلەیێ ئازاد بکرێ، پاداشو خێری باشترە؟ فەرمووی: (ئەوەی کە بە بەهاگرانەو لەلای خاوەنەکەی گەلێ چاكو نایابترە).

عەرزیمکرد: ئەگەر ئەوەم بۆ نەکرا؟! فەرمووی: (یاریدەی پیشەسازێ بدە، یان دەستی ناشیو کۆڵییەك بگرەو، فێرێ کارێ، ئیشێ، پیشەیەکی بکە).

١٤٥١- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { "مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ اَلْعَبْدِ، قُوِّمَ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ اَلْعَبْدُ، وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٧٨ = ٢٥٢٢، ٢٤٩٢، ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٣ = شیحا: ٣٧٥٢ = محمد فؤاد عبدالهادی/١٥٠١}:

لە موختەصەری صەحیحی بوخاری ژمارە: (١٠٧٨ = ٢٤٩٢)و لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئـەبوهورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کەبەشی خۆی لە کۆیلەیەك ئازاد بکا، لەسەریەتی، کە لەماڵی خۆی هەمووی ئازاد بکا، ئەگەر ئەوەندەی مـاڵ هـەبوو کەبەشی هەموو پشکەکانی تری ئەو کۆیلەیە بکا، بەڵام ئەگەر ئەوەندەی مـاڵ نەبوو کەبەشی ئـەوە بکـا، ئـەوا هـەر ئەوەنـدەی ئـازاد دەبـێ کـە ئـازاد کـراوە، ئەوسـا کۆیلەکـە بـەنرخی تـەواوی کـاتی کۆیلـەیی ڕێـك دەقـەبڵێنرێ، ئـەوجا کەسابەتی پێ دەکرێ هەتا ئەوەنـدە مـاڵ پەیـدا دەکـا کەبیـدات بەهـەقی ئـەو پشکانەیدا کەهێـشتا ئـازاد نـەبوون، هـەتا بـەئێجگاری خـۆی پـێ ئـازاد دەکـاو، لەکۆیلەیی ڕزگاری دەبێ، بەڵام نابێ زەبری زیاتر لەتوانای خۆیی لێ بکرێ، بۆ پەیدا کردنی بەهای ئەو بەشەی تری، کە لەسەر خۆیەتی بەئیشکردن ئـازادی بکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٨}.

١٤٥٢- وَلَهُمَا: عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) { "وَإِلَّـا قُـوِّمَ عَلَيْـهِ، وَاسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ" }. وَقِيلَ: إِنَّ اَلسِّعَايَةَ مُدْرَجَةٌ فِي اَلْخَبَرِ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٤}:

ئەم ژمارەیە دەقی ژمارە (١٤٥١)ە بەبێ زیـادو کـەم، تـەنها ئەمـەی پـترە. کە دانەر مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: هەندێ دەڵێن: ڕستەی کۆتای ئەم ژمارەیە کە ئەمەیە {وَاسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَـشْقُوقٍ عَلَيْـهِ} مودەرەجـەو بەشـێ نییـە لەگوتەی پێغەمبەر، بەڵکوو تێـچەنەو هەنـدێ لەڕاویـەکان خـستوویانەتە نـاو دەقی گوتەکانی پێغەمبەرەوە واتای ئەم ڕستەیە بەکوردی لـەوێوە دەسـت پـێ دەکات هەتا کۆتـایی فەرموودەکە، کـە دەڵـێ: (.......... ئـەوجا کەسـابەتی پـێ دەکرێ هەتا ئەوەندە ماڵ.......... تاد).

١٤٥٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): {" لَا يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدَهُ، إِلَّا أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكًا فَيُعْتِقَهُ"} رَوَاهُ مُسْلِمُ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٢ = ٣٧٧٨ شيحا = مسلم: ١٥١٠}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەس لەچاکەی باوك‌و دایك‌و باپیرەو نەنکی خۆی دەرناچێ، مەگەر کاتێ ئەمانە کۆیلە بن‌و ئەو بیانکڕێ‌و ئازادیان بکا، ئەوسا لەچاکەی دەربچێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٦}.

١٤٥٤- وَعَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {"مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ، فَهُوَ حُرٌّ" } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ. وَرَجَّحَ جَمْعٌ مِنَ الْحُفَّاظِ أَنَّهُ مَوْقُوفٌ.

{صحيح، إرواء الغليل/١٧٤٦}:

سەموورەی کوڕی جوندوب (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ببێ بەخاوەنی خزمێکی کۆیلەی خۆی، کە مەحرەم‌و خۆیی بێ پێی، ئیتر یەکسەر ئەو بەندەیە ئازاد دەبێ، چونکە کەسایەتی‌و ئاغایی‌و نۆکەرایەتی یان نەگوتووە، ئەم دوو شتە لەیەکەوە زۆر دوورن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٧ — د/ت/ن = أصحاب السنن/حاکم بە صەحیحی داناوە}.

دانەر حافیظی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: کۆمەڵێ لە حوففاظی حەدیث بە مەوقووفیان داناوە.

١٤٥٥- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" { أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةً مَمْلُوكِينَ لَهُ، عِنْدَ مَوْتِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرَهُمْ، فَدَعَا بِهِمْ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَجَزَّأَهُمْ أَثْلَاثًا، ثُمَّ أَقْرَعَ بَيْنَهُمْ، فَأَعْتَقَ اِثْنَيْنِ، وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً، وَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيدًا } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم = موختەصەری صەحیحی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٩٥ = شیحا/٤٣١١ = مسلم/١٦٦٤}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (پیاوێ هەموو ماڵەکەی تەنیا شەش کۆیلە بوو، لەسەرەمەرگا هەر شەشیانی ئازادکرد. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردن و کردنی بەسێ بەش و، دەو (قورعە = تیروپشك)ی لەنێوانا کردن، دوانیانی ئازادکرد کە دەوەکەیان بۆ دەرچوو بوو، وە چواریشیانی بە کۆیلەیی هێشتەوە.

وە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) قسەی ناخۆش و توندی بە پیاوەکە گوت، لەسەر ئەوکارە ناشیرینە، کە لەسەرەمەرگا، هەموو سامانەکەی کردووە بەخێر.

لە گێڕانەوەیەکی نەسائیدا پێی فەرموو: (نیازم هەبوو نوێژ لەسەر تەرمەکەی نەکەم). لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داوودا: (ئەگەر بەرلەوە بنێژرێ ئامادەی تەرمەکەی ببوومایە، نەمدەهێشت لە گۆڕستانی موسوڵمانان بنێژرایە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٠٠١ چ/٤، لاپەڕە: ٤٤٠}.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەم جۆرە هەڕەشانە، چاو ترساندنە دەنا مەبەست ئەوەنییە، کە خوانەخواست ئەم پیاوە لەجەغزی باوەڕ دەرچووبێت، چونکە ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاسپێرییەکەی چەسپاندووە لەسێیەکی ماڵەکەیدا دامەزراوە.

١٤٥٦- وَعَنْ سَفِينَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { قَالَ: كُنْتُ مَمْلُوكًا لِأُمِّ سَلَمَةَ فَقَالَتْ: أُعْتِقُكَ، وَأَشْتَرِطُ عَلَيْكَ أَنْ تَخْدِمَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَا عِشْتَ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَالْحَاكِمُ.

{حَسَنٌ، إرواء الغليل/١٧٥٢. الصحيح المسند/٤٣٨}:

سەفینە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (من کۆیلەی ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر بووم، فەرمووی پێم: من تۆ ئازاد دەکەم بەو مەرجە کەتۆ هەتا ماویت نۆکەریی پێغەمبەر بکەیت).

١٤٥٧- وَعَنْ عَائِشَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)):أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) قَالَ: { "إِنَّمَا اَلْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ فِي حَدِيثٍ. طويلٍ.

{تەجریـــدی بوخـــاری/٣، ژمـــارە: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠، ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥ بوخـــاری. مختـــصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٨٩٦ = شـیحا/٣٧٥٨ = مـسلم/١٥٠٤. أبـو داود. فرائض/٢٩١٥، نسائی. بیوع/٤٦٥٨. تحفة الأشراف/٨٣٣٤}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە: {بڕوانە: ژمارە: ٨٠٩ لەپێشەوە رابورد}.

عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بـەریرە هـات بـۆلام، گـوتی: خاوەنەکانم نامە نووسی (موکاتەبە)یان لەگەڵدا کردووم لەسەر نۆ ئۆقیە زیزو، بۆ ماوەی نۆ ساڵ، کە هەر ساڵەی ئۆقیەیە بدەم، جا هاتووم بۆلات کە تۆیش یارمەتییەکم بدەیت، هەتا زوو رزگارم ببێ لەم کۆیلەییە، وە ئەوکاتە هیچ پشکێکی لەنامە نووسییەکەی جێبەجێ نەکردبوو؟!

منیش پێم گوت: بڕۆ بە ئاغاکانت بڵێ: ئەگەر ئـەوان ئـارەزوو دەکـەن‌و رازی دەبن، ئەوا من ئەو پارەیان هەموو بەیەکجار بەسەریەکەوە، بەنەختی بۆ دەژمێرم‌و یەکسەر ئازادت دەکەم، بـەڵام بەمـەرجێ کـە سـەرداریی (وَلَاء = وەلاء = هەقداری)یەکەت بۆمن بێ‌و من ببم بەهەقدارت.

جا ئەویش ئـەم باسـە دەگێڕێتـەوە بـۆ ئاغاکـانی، بـەڵام ئاغاکـانی بـەوە ڕازی نابن‌و دەڵێن: سەرداریی‌و هەقداریی، مـافی خۆمانـە‌و نایـدەین بەکەسـی تر، جا دیسانەوە بەریرە هاتەوە بۆ لام‌و ئـەم بـاس‌و خواسـەی بـۆم گێڕایـەوە، منیش پیا هەڵشاخام، ئەویش گوتی: سوێندم بەخودا هەر ئەوەیە، کە عـەرزم کردی.

عائیـشە فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئەمـەی بیسـت‌و لـەمنی پرسـی، منـیش باسـەکەم عـەرزی کـرد، فـەرمووی پـێم: (تـۆ بیکڕە‌و ئازادی بکە‌و مەرجیش دابنێ کە سەرداریی بۆ ئەوان بێ، ئەو مەرجە

بایەخی نییە، چونکە لەڕاستیدا سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکا).

عائیشە فەرمووی: منیش وامکرد. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەئێوارەیێ، هەڵسایەوەو وتارێکی دا، سوپاس‌و ستایشێ کەشایانی خودابێ کردی‌و ئەوجا فەرمووی:

(لەپاش ئەمە، ئەوە بۆچی هەندێ کەس دەچێ مەرجی وا بەمەرج دەگرێ، کە لەناو یاسانامەی خودادا نەبێ، دەی هەرکەسێ مەرجی وا بەمەرج بگرێ، لەکاتی سەوداو مامەڵەو کردنی کارێکا، ئەوە پووچ‌و بەتاڵە، ئەو جۆرە مەرجە سوودی نابێ بۆی، ئەگەر سەد مەرجیش بێ، هەموویان پووچ‌و بێ بایەخن، نامەی خودا لەپێشترە، مەرجی خودا پتەوترە، ئەوە بۆ هەندێ کەس لەئێوە دەڵێن: ئێمە فیسارە کەسی کۆیلە ئازاد دەکەین، بەمەرجێ کە سەرداریيەکەی بۆ خۆمان بێ، بەبێ چەندو چوون سەرداریی، مافی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩ پوختەی موسلیم/٢، زنجیرە: ٧٠٣}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئۆقیەی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چل درەمی زیوینی ئەو سەردەمە بووە.

٢- وەلاء، یا سەرداریی، یا هەقداریی، لەزاراوی شەرع‌و یاسانامەی خودای گەورەدا، باوانییەکە (عوصوبەیەکە) کە بەهۆی نەمانی خاوەنییەوە، لەنێوانی کۆیلەو خاوەنی پێشویدا دەچەسپێ، بەهۆی ئازادبوونەوە. بەوێنە: ئەگەر کەسێ بەهەر هۆیێ، کەسێ تر ئازادبکا، وە ئازادکەر، یا ئازادکراو بمرێ، کۆمەڵێ ماف بۆ هەردوولا دادەمەزرێ. بەنموونە: ئەگەر ئازادکراو بمرێ، وە کەلەپوور بەری خزم‌و کەسوکاری نەبێ، ئەوە کەلەپوورەکەی بۆ ئازادکەرەکەیەتی، ئەگەر ئازادکراو مێینە بوو لەکاتی شووکردنا ئازادکەرەکەی

مارەی دەکا لە شووەکەی، وە کۆمەڵێ مافی تر، کە بەپێی شەرع بۆ ئازادکەر، یا بۆ ئازادکراو دەچەسپێ.

١٤٥٨- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم): { " اَلْوَلَاءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ اَلنَّسَبِ، لَا يُبَاعُ وَلَا يُوهَبُ" } رَوَاهُ اَلشَّافِعِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ وَأَصْلُهُ فِي "اَلصَّحِيحَيْنِ" بِغَيْرِ هَذَا اَللَّفْظِ}.

{بوخاری. عتق/٢٥٣٤، ٦٧٥٦. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٨ = شیحا/٣٧٦٧ = نسائی. بیوع/٤٦٧١. أبو داود. فرائض/٢٩١٩. صحیح الجامع/٧١٥٧}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سەرداریی – واتە: مافی وەلاء، کە لەنێوانی ئازادکەرو ئازادکراودا دروست دەبێ – ئەم سەرداریی‌یە، ڕشتەیەکە وەك ڕشتەی خزمایەتی، لەبەرئەوە نە دەفرۆشرێ و نە دەبەخشرێ بە کەسێکی ترا). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٢٣ – ش/د/ت/ن}.

بۆ تێگەیشتنی باشتر لەم پرسی سەرداریی و وەلائە، بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ١٠٧٨، چاپی ئێران زنجیرە: ٤١١.

## ٩٢- باسی پاشەمەرگە (واتە: المدبرّو نامە نووس و دایکی منداڵ
## بَابُ: المُدبَّرِ وَالمُكَاتَبِ وَأُمِّ الوَلَدِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول/٢، زنجیرە: ١٨ و ١٩ و ٢٠ لە ژمارە: ٢٠١٩وە هەتا ژمارە: ٢٠٢٥ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٤١٢ و ٤١٣ و ٤١٤ و ٤١٥ و ٤١٧}.

١٤٥٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَجُلًا مِنْ اَلْأَنْصَارِ أَعْتَقَ غُلَامًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) . فَقَالَ: "مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟" فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اَللَّهِ بِثَمَانِمَائَةِ دِرْهَمٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي

لَفْظٍ لِلْبُخَارِيِّ: فَاحْتَاجَ وَفِي رِوَايَةٍ لِلنَّسَائِيِّ: { وَكَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ، فَبَاعَهُ بِثَمَانِمَائَةِ دِرْهَمٍ، فَأَعْطَاهُ وَقَالَ: " اِقْضِ دَيْنَكَ" }.

{بخاری. كَفَّارَاتُ الأَيْمَان/ ٦٧١٦. مسلم/شیحا/٤٣١٤ – ٤٣١٧. مسلم/٩٩٧}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە یاریدەدەرانی پێغەمبەر، خوڵامێکی هەبوو، ئازادیکرد بەمەرجێ کە لەپاش مردنی خۆی ئازاد ببێ، کە بەم جۆرە مامەڵەیە لە یاسانامەدا دەگوترێ (تەدبیر: پاشی مەرگ) پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری وەهای نەبوو، جا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کێ ئەم کۆیلەیەم لێ دەکڕێ؟ جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلا لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پارەکەی وەرگرتو دای بە خاوەنەکەی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢}.

ئەمەیش دەقی دووەمی بوخارییە لە تەجریدی بوخاریدا ژمارە (٩٧٠). {بڕوانە: ژمارە: ٨٠٥ لەپێشەوە ڕۆیشت}.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پیاوێ لە هاوەڵان، واتە: لە ئەنصار، خوڵامێکی هەبوو، ئازادی کرد بەمەرجێ لەپاش مەرگی خۆی ئازادببێ، کە بەمە لەزاراوی شەرعا دەگوترێ: مودبەر، پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری وای نەبوو، جا دامابوو بۆ ماڵ، جا لەپاشا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر پیاوەکەی خستە سەر سەواو مەزاتو فەرمووی: (کێ ئەم کۆیلەیەم لێ دەکڕێ؟).

جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلا لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پارەکەی وەرگرتو دای بە خاوەنەکەی، کەناوی ئەبو مەزکوور بوو، خوڵامەکەیش ناوی ئەبو یەعقوب بوو). {تاج/٢، زنجیرە:

١١٥، ژمـاره: ١٨٩٦ + تـاج/٢، زنجیره: ١٩، ژمـاره: ٢٠٢٢ = ئـهم ژمـارهی دووهمـه لهچـاپه كۆنـهكانی پـێش چـاپی چـوارهمهوه دهكهوتـه سـهرهتای بـهرگی سێیهمهوه}.

لهگێڕانهوهیهكی نهسائیدا: پیاوهكه قهرزار بوو، جا پێغهمبهر (دروودی خـودای لهسـهر بـێ) كۆیلهكـهی فرۆشـت بهههشـت سـهد درهم، وه پارهكـهی دا بهخاوهنهكهی، وه فهرمووی: (دهبڕۆ قهرزهكهتی پێ بدهرهوه). {صحیح، سُنَنُ النسائی: ٥٤١٨}.

١٤٦٠- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَـنْ اَلنَّبِـيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) { قَالَ: " اَلْمُكَاتَبُ عَبْدٌ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ مُكَاتَبَتِهِ دِرْهَمٌ" } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ، وَأَصْلُهُ عِنْدَ أَحْمَدَ، وَالثَّلَاثَةِ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حَسَنٌ، الإِرْوَاء/١٦٧٤}:

عـهمری كـوڕی شـوعهیب لهباوكیـهوه، لهباپیریـهوه (رهزای خودایـان لێ بـێ) فـهرمووی: پێغهمبـهر (دروودی خـودای لهسـهر بـێ) دهفـهرموێ: (نامـه نووسكار (موكاتهب) ههتا یهك درهمی لهسهر بمێنێ ههر بهكۆیله دائهنرێ).

١٤٦١- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { إِذَا كَانَ لِإِحْدَاكُنَّ مُكَاتَبٌ، وَكَانَ عِنْدَهُ مَـا يُـؤَدِّي، فَلْتَحْتَجِـبْ مِنْهُ } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيّ.

{ضعیف، إرواء الغلیل/ ١٧٦٩. أبو داود/٣٩٢٨. ترمذی/١٢٦١. نـسائی في الكبری (تحفة الأشراف)/١٣/١٨٢٢١}:

ئـوم سـهلهمه (رهزای خـودای لێ بـێ) فـهرمووی: پێغهمبـهر (دروودی خودای لهسهر بێ) بهئێمهی فهرموو: (ئهگهر ژنێ لهئێوهی ژنـان، كۆیلهیـهكی نامه نووسكار (موكاتهب: كاغهز پێدراو)ی ههبوو، وه لهههمان كاتدا، بهندهكه (كۆیلهكـه) ئهوهنـدهی مـاڵ هـهبوو كـه بهشـی خهرجهكـهی بكـاو بتوانـێ قیستهكهی سهری بدا، ئیتر بـا ئـهو ئافرهتـه چارشێوو پهچه بگرێتـهوه لـهو

بەندەیــە). {تــاج/٢، زنجــیرە: ١٨، ژمــارە: ٢٠٢١ – د/ت/ن – ســند النــسائی صحیح}.

١٤٦٢– وَعَنْ اِبْنِ عَبَّـاسٍ (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا) أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: { يُودَى اَلْمُكَاتَبُ بِقَدْرِ مَا عَتَقَ مِنْهُ دِيَةَ اَلْحُرِّ، وَبِقَدْرِ مَا رَقَّ مِنْـهُ دِيَـةَ اَلْعَبْدِ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ.

{صحيح الجَامِعِ/٣٣٩٦. أحمد/١/٢٢٢/١٩٤٤. نسائي في الكبرى/٦٩٨٣. أبو داود/٤٥٨١}:

ئیبنــو عــەبباس (ڕەزای خــودا لــەخۆیو لــەباوکی بــێ) فــەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: (خـوێنی کۆیلـەی کاغـەز پێدراو (موکاتـەب) کاتـێ دەکوژرێ، یاکاتـێ زیانـێ لـە ئەنـدامێکی دەدرێ، کـە لەشەرعا ئەو ئەندامە ئەنـدازەی خوێنەکـەی دیـاریکراوە، خـوێنی ئـەو جـۆرە کۆیلە ئاوا دەدرێ:

یەکەم: چەنـدی ئازاد بووە، خوێنەکەی وەك خوێنی ئازاد دەقـەبڵێنرێو بەو پێیە ئەندازەکەی دیاری دەکرێ.

دووەم: چەنـدی ئازاد نەبووە کە هێشتا ئەو بەشەی کۆیلەیە خوێنی ئەم بەشەیشی وەك خوێنی کۆیلە دەقەبڵێنرێو بەو پێیە دیاری دەکرێو دەدرێ).

(ڕوونکردنەوە):

بەنموونە: پیاوێکی موسوڵمانی کاغەز پێدراو، لە قیستەکانی سـەری کـە چوار قیستە، دوانیان دەدا، کەواتە: ئەم پیاوە نێوەی ئازادەو نیـوەی کۆیلەیـە، لەم کاتەدا ئەم کابرایە کوژرا خوێنەکەی ئاوا دەدرێ:

١- خوێنی پیاوی ئازادی موسوڵمان (١٠٠) سەد سەر وشترە، کەواتـە نیـوە ئازادەکەی ئەم یەکسانە بە (١٠٠ ÷ ٢ = ٥٠) پەنجا وشتر.

٢- خوێنی نیوە کۆیلەکەیشی ئاوا دەدرێ:

کۆمەڵێ پسپۆڕ کۆیلەکە دەقەبلێنن کە بایی چەندە، گریمان گوتیان: کۆیلەکە بەر لەکوشتنی بایی (٤٠) چل مسقاڵ ئاڵتوون بووە، کەواتە خوێنی نیوەی دەکاتە (٤٠ ÷ ٢ = ٢٠) یەکسانە بەبیست مسقاڵ ئاڵتوون. کەواتە تەواوی خوێنی کۆیلەکە دەکاتە (٥٠) وشترو (٢٠) بیست مسقاڵ ئاڵتوون.

جا بەشە خوێنی بەشە ئازادکراوەکەی دەدرێ بە کەلەپوورگرانی لە کەسوکاری، وەخوێنی بەشە کۆیلەکەیشی دەدرێ بە خاوەنەکەی وە هەروەها بەم شێوەیە، ئەگەر چاوێکی کوێر کرابێ، یا دەستێکی بڕابێ، بەم شێوەیە خوێنەکەی دیاری دەکرێ.

١٤٦٣- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ اَلْحَارِثِ- أَخِي جُوَيْرِيَةَ أُمِّ اَلْمُؤْمِنِينَ -(رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { مَا تَرَكَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا، وَلَا دِينَارًا، وَلَا عَبْدًا، وَلَا أَمَةً، وَلَا شَيْئًا، إِلَّا بَغْلَتَهُ اَلْبَيْضَاءَ، وَسِلَاحَهُ، وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً }  رَوَاهُ اَلْبُخَارِيّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٣٧ = ٢٧٣٩، ٢٨٧٣، ٢٩١٢، ٣٠٩٨، ٤٤٦١ بوخاری}:

عەمری کوڕی حاریث (ڕەزای خودای لێ بێ) کە ژنبرای پێغەمبەر بوو، کە برای جوومەیرییەی کچی حاریث بوو، کە جوومەیرییە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەسەر ئەو خوشكو برایە بێ)، عەمری کوڕی حاریث فەرمووی: کاتێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، نەپوول، نە پارە، نە زێڕو نە زیوو نە کۆیلەو نە کەنیزەكو نە ڕانە مەڕو، نە هیچی تری لەپاش بەجێ نەما، تەنیا هێسترێکی سپی هەبوو، لەگەڵ چەکەکەی، پارچەیێ زەویشی هەبوو، کردبووی بە وەقف). {تاج/٢، لاپەڕە: ٤٣٦، زنجیرە: ١٠ لەبەرگی سێیەمی چاپی سێیەم ژمارە: ١٩٩٥}.

(ڕوونکردنەوە):

عەمری کوڕی حاریث، هاوەڵی پێغەمبەرە، برای خاتوو جووەیرییەی هاوسەری پێغەمبەرە. لە پیاوانی صەحیحی بوخارییە، گێڕانەوەی لەم زاتانەوە هەیە:

یەکەم: لە جووەیرییەی خوشکیەوە.

دووەم: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە.

سێیەم: لە زەینەبی هاوسەری ئیبنو مەسعوودەوە.

١٤٦٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَيُّمَا أَمَةٍ وَلَدَتْ مِنْ سَيِّدِهَا، فَهِيَ حُرَّةٌ بَعْدَ مَوْتِهِ} أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَهْ، وَالْحَاكِمُ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ. وَرَجَّحَ جَمَاعَةٌ وَقْفَهُ عَلَى عُمَرَ.

{ضعيف الجامع/٢٢١٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر کەنیزەکێ لەخاوەنەکەی منداڵی ببێ، لەپاش مردنی ئاغاکەی دەسبەجێ ئازاد دەبێ).

(ڕوونکردنەوە):

(کورت و پوخت)

پیاوی ئازاد، هەرکاتێ سکی کەنیزەکی خۆی پڕکرد، ئیتر ئەو کەنیزەکە، لەپاش دانانی منداڵەکە، حسێبی ژنی ئازادی بۆ دەکرێ، نە دەفرۆشرێ، نە دەبەخشرێ، هەرکاتێ خاوەنەکەی مرد، یەکسەر بەتەواوی ئازاد دەبێ. {بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ١٠٨٥، زنجیرە: ٤١٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٢٥}.

١٤٦٥- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { مَنْ أَعَانَ مُجَاهِدًا فِي سَبِيلِ اَللَّهِ، أَوْ غَارِمًا فِي عُسْرَتِهِ، أَوْ مُكَاتَبًا فِي رَقَبَتِهِ، أَظَلَّهُ اَللَّهُ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.
{ضعيف الجامع/٥٤٤٧}:

سەهلی کوڕی حونەین (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەبەر ڕەزای خودا، یارمەتی خەباتگێڕێ بدا، کە لەڕێگەی خودادا تێ دەکۆشێ، یا کۆمەکی قەرزارێ بکا، لەکاتی دەست کورتیو نەبوونیدا، یا یارمەتی کاغەز پێدراوێ بدا، کە پێی دەگوترێ موکاتەب، هەتا گەردنی خۆی لەکۆتی کۆیلەیی ئازاد بکا، مسۆگەر کە خودای گەورە، لەڕۆژی زینەوەدا، کە بێجگە لەسای سێبەری ڕەحمەتی خۆی، سێبەری تر نییە، ئەم جۆرە چاکەکارانە لەسای سێبەری خۆیدا دەحەوێنێتەوە!).

(ڕوونکردنەوە):

سەهلی کوڕی حونەین، ئەنصارییە، لەهۆزی ئەوسە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، بەدرییە، واتە: لەجەنگی بەدردا، لەڕیزی موسوڵماناندا، لەدژی ناموسوڵمانەکان جەنگاوە، لەجەنگی ئوحوددا خۆگربوو، وەرەی بەرنەدا، لەوکاتە زۆر سەختو دیژوارەدا، پەیمانی بە پێغەمبەر دا، کە هەتا مردن پشتی بەرنەداو سەنگەر چۆڵ نەکاو سەری بەرزی خۆی بۆ دوژمن نەوی نەکا، هەروا ئامادەی خەندەقو هەموو شەڕگاکانی تر بووە، لەپاش شەڕەکەی ئەلجەمەل، عەلی کردی بەسەرداری سەر بەصرە، لەساڵی هەشتاو هەشتی کۆچیدا لە کووفە بەدەردی خودا مردووە، ئیمامی عەلی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، شەش (الله اکبر)ی لەنوێژەکەدا کرد.
{بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٣، زنجیرە: ٨٥٥، ژمارە: ١٠٧٨ - ڕوونکردنەوە}.

## ١٧- نامەی کۆمەڵێ بابەتی تایبەت
## كِتَابُ الجامعِ
### ٩٣- باسی ویژەو ئەدەب
### بابُ: الْأَدَبِ

١٤٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { حَقُّ اَلْمُسْلِمِ عَلَى اَلْمُسْلِمِ سِتٌّ: إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اِسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اَللَّهَ فَشَمِّتْهُ وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتْبَعْهُ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ .

{مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٤١٨ = شيحا/٥٦١٦ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/٢١٦٢}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەپێی یاسانامەی خودا، موسوڵمان شەش مافی تایبەتی لەسەر موسوڵمان هەیە:

یەکەم: کاتێ لەملاولا تووشی دەبێو دەگەن بەیەکتری سڵاوو رۆژباشی لێ بکا.

دووەم: ئەگەر خوڵکی کرد بۆ سەر شاییو نانخواردنو ئاهەنگی رەواو شتی تری لەم بابەتە، بابچێ بۆ سەر بانگهێشتنەکەی.

سێیەم: کاتێ داوای ئامۆژگاریو راوێژی لێ کردیت، ئامۆژگاری باشی بکەو بەشێوەی گشتی هەرچیت بۆ خۆت پێ خۆشە، بۆ ئەویش ئەوەت پێ خۆش بێو هانی بدە لەسەری کە جێبەجێی بکا.

چوارەم: کاتێ دەپژمێو سوپاسی خودای کردو گوتی: (الحمدُ لِلّە: سوپاس بۆ خودا) تۆیش نزای باشی بۆ بکەو پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللّهُ: خودا رەحمت پێ بکا).

پێنجەم: ئەگەر نەخۆش کەوت، سەری لێ بدەو لەکاتی ناساخیدا هەواڵپرسی لێ بکە.

شەشەم: کاتێ دەمرێ، شوێنی تەرمەکەی بکەوەو ئەگەر لەگەڵیا هەتا سەر گۆڕستان بچیو ئامادەی ناشتنی بیت، ئەوە کارێ زۆر چاكو پیرۆزە).

(ڕوونکردنەوە):

بۆ ئەم ڕوونکردنەوەیە، بڕوانە: تاج/٥، زنجیرە: ٥٧، ٥٨، ٥٩، ٦٠. لەژمارە:٥٣٧٧ وە هەتا ژمارە: ٥٣٨٩).

بڕیارەکانی نزای پژمیو لە (فتح الملهم شرح صحيح مسلم)دا، لە ژمارە: (٥٦٠٧)دا هاتووە:

١- سوننەتە بۆ پژمیو لەپاش پژمین، سوپاسی خودا بکا، بەدەنگی بەرز، تا ئامادەبوان گوێیان لێ بێو نزای باشی بۆ بکەن.

٢- سوننەتە ئامادەبوان، نزای باشی بۆ بکەن، باشتر وایە کە پێی بگوترێ: (يَرْحَمُكَ اللّٰهُ) ئەگەر یەك کەسیش پێی بڵێ هەردەبێ.

٣- واباشە پژمیو لەکاتی پژمیندا، بەدەستە سڕێ، یا بەشتێ، یابە هەردوو ناو لەپەکانی، ڕووی خۆی داپۆشێ، هەتا نەبێ بەئازار بۆ کەسێ.

٤- بەپێی توانا دەنگی پژمەکەی نزم بێو پرژی نەچێ بەسەر کەسدا.

٥- هەتا پژمەیێ دوو پژمە نزا بۆ پژمیو سوننەتە، بەتایبەتی ئەگەر سوپاسی خودای کرد لەپاش پژمین.

١٤٦٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰـهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم): { انْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلَا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لَا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اَللّٰهِ عَلَيْكُمْ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠١٨ = ٦٤٩٠ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٨٧ = شیحا/٧٣٥٦ = مسلم/٢٩٦٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (تەماشـای حـاڵی لـەخۆتان خـوارتر بکـەن، تەماشای لەخۆتان بـەرەو ژوورتـر مەکـەن، چونکە ئەگەر وانەکەن لەوانەیـە ئـەو نـازو بەهرانـەی کـە بـەپێی حـاڵ، خـودا داویـانی پێتـان، لەبەرچـاوتان بکەون‌و بەکەمیان بزانن!).

گێڕانەوەی بوخاری ئاوایە: (ئەگەر کەسێ لەئێوە تەماشـای حـاڵ‌و مـاڵی کەسێکی تری کرد، کە بەماڵ‌و مناڵ‌و حاڵ‌و رەنگ‌و روو لەخۆی باشـتربوو، بـا تەماشای حاڵی خوار خۆشیەوە بکا، نەبادا دڵ لەدڵ بـداو، ناسوپاس دەرچـێ‌و سوپاسی بەهرەی خودا نەکاو خۆی بەهەرە خواروو بزانێ!!).

١٤٦٨- وَعَنْ اَلنَوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلْبِرِّ وَالْإِثمِ؟ فَقَالَ: { اَلْبِـرُّ: حُـسْنُ اَلْخُلُـقِ، وَالْـإِثمُ: مَـا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ اَلنَّاسُ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٩٤ = ٦٤٦٤، ژمارە دانـانی شـێخ خـەلیل مـەئموون شـیحا = صـحيح مـسلم ژمـارە دانـانی محمـد فـؤاد عبدالباقی/٢٥٥٣}:

نەوواسی کوڕی سەمعان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵێکی تـەواو لەمەدینـە، لەخزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) مامـەوە، لەبەرئەوە لەو ماوەیەدا کۆچم نەکرد بۆ مەدینە، هـەتا رێگـەی پرسیارکردنم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێ نـەگیرێ، چونکە رێگـە دەدرا بـە رێبوارو دێنیکارو مـرۆی لاوەکـی پرسـیار لـە پێغەمبـەر بکـەن، بـەڵام رێگـەی ئەنصارو کۆچکاران زۆر زۆر بەکەمی دەدرا. ئەوەی لەئێمە کۆچی بکردایە لـە وڵاتی خۆیەوە بۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـیتر پرسـیاری هیچی لێ نەدەکرد.

نـەوواس فـەرمووی: لـەبارەی چـاکەو خراپـەوە پرسـیم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (چـاکە برێتییـە لـەخوی شـیرینو رەفتاری بەرزو رەوشتی جوان، خراپەیش برێتییە لەوە کەلێی دوو دڵ بیـتو دڵ ئـاوی پـێ نەخواتـەوەو لەهـەمان کاتیـشدا حەزنەکـەیت کـە کـەس پێـت بزانێت!). {تاج/٥، زنجیرە: ١، ژمارە: ٤٦٥٠ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

نەوواسی کوڕی سـەمعانی الكلابی، خۆیو بـاوکی هاوەڵی پێغەمبـەرن، نەوواس لە ئەفرادی موسلیمە، لەبوخاریدا فەرموودەی نییـە، کـە یەکـەم جار هاتە خزمەتی پێغەمبەر، پێغەمبەر نزای باشی بۆیکرد، ئـەویش پێڵاوەکـانی خـۆی بەخـشی بـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێغەمبـەر لێـی قەبووڵ کرد.

١٤٦٩- وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً، فَلَا يَتَنَاجَى اِثْنَانِ دُونَ اَلْآخَرِ، حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ" مِنْ أَجْلِ أَنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٧٢ = ٦٢٩٠ بخاری. شیحا/٥٦٦٠}:

عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعوود (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کاتـێ سـێ کـەس بـوون، نابـێ دوو کەسـتان بـەبێ ئـەویتڕتان سـرتە سـرتو چـرپە چـرپ بکـەنو دوو بەدوو بەبێ ئەوی ترتان قسەی پەنهانی بکەن، چاوەڕوانکەن ئەگەر قسەیەکی نهێنی خۆتان هەبوو مەیکەن هەتا تێکەڵی خەڵکی تر دەبن، ئەوسا دوو بەدوو قسە نهێنییەکەی خۆتان بکەن، چونکە ئەگـەر سـێ کـەس بـنو دوانتـان چـپە چپ بکەنو لەوی ترتانی بشارنەوە ئەوە شتی وا دەبێ بەهۆی دڵتەنگی ئـەوی ترتـان). {ریـاض الـصالحين/٤، لاپـەڕە: ١١٧٩، زنجـیرە: ٢٨١ = لاپـەڕە: ٥٣ چـاپی دووەم زنجیرە: ٢٨١، ژمارە: ١٥٩٩/٢ - ٦٤}.

١٤٧٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا يُقِيمُ اَلرَّجُلُ اَلرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا، وَتَوَسَّعُوا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٧٠ = ٦٢٦٩ بوخاری + تەجرید/١، ژمارە: ٤٨٠ = ٩١١، ٦٢٧٠، ٦٢٦٩. مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٤٢٨ شيحا = ٢١٧٧ مسلم}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ = رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نابێ کەسێ کەسێکی تر لەجێگەی خۆی هەڵ بستێنێو خۆی تیا دانیشێ، بەڵام لەکاتی پێویستدا تەکە تەکە بکەنو جێگەی یەکتری بکەنەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦٢ چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەم شوێنەدا، لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێ:

١- هەرکەسێ لەپێشا لەشوێنێکی رەوادا جێگەی خۆیگرت، ئیتر خۆی بەو جێگەیە لەپێشترە هەتا کەسێ تر، کەسێ تر بۆی نییە کە لەو جێگەیە هەڵی بستێنێ، جا ئەو شوێنە لەناو مزگەوتا بێ، یا لەشوێنێ تربێ، لەڕیزی نوێژدابێ، یا لەڕیزی نوێژدا نەبێ.

٢- هەمان حوکمو بڕیاری هەیە، جێگە گشتییەکانی تر، وەك سەرشۆستەی جادەکانو شوێنە گشتییەکانی ناو بازاڕو دەرەوەی شار.

٣- ئەگەر کەسێ بەڕەزای خۆی جێگەی خۆی چۆڵ بکا بۆ کەسێ تر، ئەگەر دڵنیابوو، لەوە کە بەدڵ پێی خۆشەو لەبەر شەرمو شتی وا نەبووە، ئەوە دروستە داواکەی قەبووڵ بکاو لەوجێگەیە دابنیشێ.

٤- له فەتحولولهیم شەرحی صەحیحی موسلیما دەفەرموێ: (سونەتە بۆ دانیشتوو، کە لەم حاڵەتانەدا، واتە: لەم کاتانەدا، جێگەی خۆی چۆڵ بکاو بیبەخشی بەکەسێ تر:

آ- بۆ کەسێ لەخۆی گەورەتر بێ بەتەمەن.

ب- هەروا بۆ کەسێ لەخۆی زاناتر بێ، لەبەر زانستەکەی.

ج- یان لەبەر هەر هۆیەکی ڕەوای تر وەك: {فەقێ بۆ مامۆستای، سۆفی بۆ شێخی خۆی، شاگرد بۆ وەستای - وەرگێڕ}.

١٤٧١- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا، فَلَا يَمْسَحْ يَدَهُ، حَتَّى يَلْعَقَهَا، أَوْ يُلْعِقَهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨١٨ = ٥٤٥٦ بوخاری، مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٠٢ = شیحا: ٥٢٦٣ = مسلم ڕەقەم دانانی محمد فؤاد: ٢٠٣١ + ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٤٩، تاج/٣، لاپەڕە: ١٩٨، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ نان دەخۆن دەستی خۆتان مەسڕن، هەتا خۆتان دەیلێسنەوە، یان یەکێکی تر بۆتانی دەلێسێتەوە). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٠٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٩} + {ریاض/٢/٢٥٩، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٤٨}.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەستی سەرەکی ئەم جۆرە فەرموودەیە ئەوەیە کەنازو بەهرەی خودایی بەکەم نەزانینو هەمیشە ڕێزی نیعمەتەکانی خودامان لەلا هەبێو سوپاسی خودای لەسەر بکەین، ئەگەر دەنکێ برەنجیش بێ نووسابێ بە پەنجەیەکمانەوە، زۆر بەجوانی لێی بکەینەوەو بیخۆین، بەهیچ جۆرێ

مەبەست فیزەونیو شتی وا نییە. {بڕوانە: ریاض/١، لاپەڕە: ١٤٧، چاپی سێیەم، ژمارە: ١٦٤ - تێبینی}.

١٤٧٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لِيُسَلِّمْ اَلصَّغِيرُ عَلَى اَلْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى اَلْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى اَلْكَثِيرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {وَالرَّاكِبُ عَلَى اَلْمَاشِي}.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٦٤ = ٦٢٣١، ٦٢٣٤ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٤٢٠ = شيحا: ٥٦١١ = مسلم: ٢١٦٠}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (با لەکاتی بەیەکتر گەیشتندا بچووك سلاّو لە گەورە بکا، ڕێبوار سلاّو لە دانیشتوو بکا، کەم سلاّو لەزۆر بکا).

لەگێڕانەوەی ژمارە: (١٤٢٠)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە: (با سوار سلاّو لەپیادە بکا، پیادە سلاّو لەدانیشتوو بکاو، کەم سلاّو لەزۆر بکا).

{ریاض/٢، زنجیرە: ١٣٣، ژمارە: ٨٥٧، ج/٤، تاج/٥، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٥٢٨٤ لە زنجیرە: ٢١ وە هەتا زنجیرە: ٢٩ چاپی چوارەم}.

١٤٧٣- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { يُجْزِئُ عَنْ اَلْجَمَاعَةِ إِذَا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ، وَيُجْزِئُ عَنْ اَلْجَمَاعَةِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْبَيْهَقِيُّ.

{حسن، إرواء الغليل: ٧٧٨}:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کۆمەڵێ دەڕۆیشتن، یەکێکیان سلاّو بکا بریتی هەموویان دەکەوێ، کاتێ کۆمەڵێ سلاّویان لێ بکرێ، یەکێکیان وەلاّم بداتەوە بریتی هەموویان دەکەوێ).

١٤٧٤- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { لَا تَبْدَؤُوا اَلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى بِالسَّلَامِ، وَإِذَا لَقِيْتُمُوهُمْ فِي طَرِيقٍ، فَاضْطَرُّوهُمْ إِلَى أَضْيَقِهِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{سبق بتمامة في الرقم/١٣٣٥ = له ژماره: ١٣٣٥دا رابورد}:

١٤٧٥- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: { إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: اَلْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ يَرْحَمُكَ اَللَّهُ، فَإِذَا قَالَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اَللَّهُ، فَلْيَقُلْ: يَهْدِيكُمُ اَللَّهُ، وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژماره: ١٩٦٢، ١٩٦٣ + مختصر صحيح مسلم/٤، ژماره: ١٤١٨}:

ئەبوهورەیره (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ کەسێ لەئێوه دەپژمێ، با بڵێ: (الحمدالله: سوپاس بۆ خودا) با برادەرو هاوڕێکانیشی پێی بڵێن: (يَرْحَمُكَ اللّه: خودا ڕەحمت پێ بکا) کەوای پێ گوتو ئەم نزایەی بۆ کرد، باپژمیوەکەیش ئەم نزایه بۆ ئەو بکاو بڵێ: (يَهْدِيُكُم اللّه وَيُصلِحُ بَالَكُمْ: خودا شارەزای ڕێگەی حەقتان بکاو کاروبارتان بسازێنێ!).

(بوخاری. كتاب الأدب. باب: إِذَا عَطَسَ كَيْفَ يُشَمَّتُ. ژماره: ٦٢٢٤ + بڕوانه: رياض/٢، زنجيره: ١٤٢، ژماره: ٨٨٣، ٨٧٨، ٨٨٠، ٨٨١، ٨٨٤ + مختصر صحيح مسلم/٤، ژماره: ١٤١٨).

١٤٧٦- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { لَا يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٢٩٤ = شيحا: ٥٢٤٧ = مسلم/ فؤاد/٢٠٢٦}:

ئـەبوهورەيرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان بەڕاوەستانەوە شت مەخۆنەوە، ئەگەر لـەبیرتان نـەبوو، شـتتان بەسـەر پێـوە خـواردەوە خۆتـان بڕشـێننەوە). {ریاض/٢/٢٦٩، زنجیرە: ١١٤، ژمـارە: ٧٧٢ + پوختـەی موسـلیم/٣، ژمـارە: ١٢٩٥ + تاج/٢، زنجیرە: ١٣٣، ژمارە: ١٧١٤، چاپی چوارەم}.

١٤٧٧- وَعَنْهُ (رضـي الله عنـه) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): { إِذَا اِنْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْـدَأْ بِـالْيَمِينِ، وَإِذَا نَـزَعَ فَلْيَبْـدَأْ بِالـشِّمَالِ، وَلْـتَكُنْ اَلْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ، وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ }. أَخْرَجَهُ مسلم إِلَى قَوْلِهِ: (بالشِّمَالِ).

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٠٠ = بوخـاری: ٥٨٥٥. مختـصر صـحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٨١ = شیحا ٥٤٦٢ = مسلم: ٢٠٩٧}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پێڵاو لـەپێ دەکـەن، لەپێـشا پێـی ڕاست لەپێ بکـەن، لـەکاتی پـێڵاو داکەندنیـشا، لەپێشدا پێـی چـەپ دابکـەنن، واتـە: بەپێچەوانەی پـێڵاو لـەپێ کـردن، بـاپێی ڕاسـت لـەکاتی پـێڵاو لـەپێ کردنـدا یەکەم بێو پێی چەپ لەکاتی پێڵاو داکەندندا یەکەم بێ). ئەمە دەقی ژمارە: (١٩٠٠)ی تەجریدی بوخارییە.

١٤٧٨- وَعَنْهُ (رضـي الله عنـه) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): { لَا يَمْشِ أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، وَلْيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا، أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{مختـصر صـحيح مـسلم/٤، ژمـارە: ١٣٨١ ب = شـيحا: ٥٤٦٣ = مـسلم: ٢٠٢٧. تەجریـدی بوخـاری/٥، ژمـارە: ١٩٠١ = ٥٨٥٦ بوخـاری. تحفـة الأشراف/١٣٨٠٠}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر دەفـەرموێ: (بەشـێوەی گـشتی، لەبـەر ناچاری نـەبێ، بەیـەك تـاك پـێڵاوەوە مـەڕۆن، یـان

هـەردوو تاكەكـەيان پێكـەوە لـەپێ بكـەنو پێيانـەوە بـڕۆن، يـان هـەردوو تاكەكـەيان پێكـەوە دابكـەنو ئەوسـا بـڕۆن). {تـاج/٣، زنجـيرە: ٣٦، ژمـارە: ٢٨٢٣}.

١٤٧٩- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا يَنْظُرُ اَللَّهُ إِلَى مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخاری: ٥٧٨٣. مختصر صحيح مسلم/١٣٦١ = ٤٥٢٢}:

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رەزای خودايان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (كەسی بۆ فيزو دەعيە جلو بـەرگی خـۆی بـەكێش بكـا، لـەڕۆژی قيامەتـدا خـودا بەچاوی مەرحەمـەتو سـۆزو ميهرەبانی تەماشای ناكات). {رياض/٢/٢٨٠، زنجيرە: ١١٩، ژمارە: ٧٩٢}.

١٤٨٠- وَعَنْهُ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) قَـالَ: { إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ اَلشَّيْطَانَ يَأْكُـلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسليم = مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٩٨ = شيحا: ٥٢٣٣ = مسلم/ فؤاد/٢٠٢٠}:

ئيبنـو عومـەر (رەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوكی بـێ) دەفـەرمووێ: خۆشەويست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (كاتێ كەسێ لەئێوە نان دەخوا، يان شتێ تر دەخوا، يان شت دەخواتەوە، سوننەتە كەبەدەستی ڕاستی شتەكە بخوا، يان شتەكە بخواتەوە، بـەبێ مەهانـەی ڕەوا شت بەدەستی چـەپ نەخوا، يان شت بەدەستی چەپی نەخواتەوە، هـەتا نـەبێ بەلاسكايی شـەيتان، چونكە شـەيتان بەدەسـتی چـەپی شت دەخـواوو شـت دەخواتـەوە!). {تـاج/٣، زنجيرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٤}.

١٤٨١- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { كُلْ، وَاشْرَبْ، وَالْبَسْ، وَتَصَدَّقْ فِي غَيْرِ سَرَفٍ، وَلَا مَخِيلَةٍ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَأَحْمَدُ، وَعَلَّقَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{صحيح، المشكاة: ٤٣٨٠}:

عەمری كوڕی شوعەیب، لەباوكیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی موسوڵمان! لە حەڵاڵ چەندو چی دەخۆی بخۆو چەندو چی دەخۆیتەوە بخۆرەوە، وە هەروەها شتی حەڵاڵ چی لەبەر دەكەی لەبەری بكە، وە لەماڵی حەڵاڵ چی دەكەی بەخێر بیكە، بەڵام بەدوو مەرج: مەرجی یەكەم: بەبێ ئیسرافو زیادەڕەوی، مەرجی دووەم: بەبێ لەخۆباییو بوونو فیزو دەعیە).

(ڕوونكردنەوە):

لە نەوەتەكانی سەردەمی پێشوودا، واتە لەپێش نزیكەی (١٥) پازدە ساڵ لەمەوپێش، ئەم شیعرانەم گوتووە، بە بۆنەی كردنەوەی مزگەوتێ لە داریكەلی، كە مەڵبەندی شێخ محمودی یاد نەمر بوو، هەتا كاتێ مەرگ بوو بەمیوانی. جا والێرەدا هەندێ لەو شیعرانە دەنووسم بۆ حەقی وەفا، بۆ شاری سلێمانی، كە مەڵبەندی منالیو لاویو فەقێیەتیم بووە، وە بۆ حەقی وەفا، بۆ گشت ئەو كوردە مەردە موسوڵمانە پێشمەرگانە، كەئێمەیان لەچنگی دڕندەی دوژمن ڕزگار كردو ئێستا لەسایەی خوداوە، بەهۆی تێكۆشانو خەباتی ئەوانەوە، لەوڵاتی خۆمانا، دەژینو بەوپەڕی ئازادییەوە خودای خۆمان دەپەرستین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

ئــەی گــەلی كــوردم! مــن بــەقوربانتم

ئاشــق بــەدینو خــاكو زبــانتم

گــەر جــوانی ولآت بــەپێی خــاك بــێ

دەبــێ كوردســتان بــۆ جــوانی تــاك بــێ

ئــەی ســلێمانی! ئــەی ســلێمانی!

شــاری هەڵمــەتو شــاری قوربــانی

بەســتە بــۆ قــەدرو ســەربەرزیو جــوانی

بــۆ ژیــان چــرای، بــۆ ئــایین شــوانی

مەركــەزی ئیــشعاع فیكــری كــوردانی

بــۆ گــشت هەڵمــەتێ مــەردی مەیــدانی

جێــی شــانازیمە تــۆ بــۆ مــن داكــی

مەڵبەنــدی نــالیو مــەحویتو خــاكی

پێتــەختی مــوڵكی مــەلیك مــەحموودی

تــۆ كەشــتی نــووحی ســەركێوی جــوودی

زۆر رۆشــنبیرو ئــەدیبی كــوردی

ژیــانو مــردن، تیاتــا بەمــەردی!

ئــەی داریكــەڵی! ئــەی داریكــەڵی!

مەدینــەی نــەبیو نەجــەفی عــەلی

چــوار چــرا، پــیران، بــەرزان، بــەرانان!

هەنــدەرین، ســەیوان، بــەردەقارەمان!

لــەگیانی پاكتــان دەخــوازم ئیلــهام

لــــەبۆ پێـــشمەرگە، دەنێـــرم ســـەلام

بـــۆ مــــەلیك مــــەحموود، دەنێــــرم درووود

شــیعرێ دەنووســـم، دەیكــەم بەســرووود:

(ئـــەی شـــەهیدانی كـــوردو كوردســـتان

ســــلاّوو درووود لــــەگیانی پاكتــــان)

رەحمــــەت لـــەئێوە، نــــەفرەت لەوانـــە

خوێنیـــان رژانـــدن لـــەبۆ بێگانـــە

ســـوێندم بـــەزامتان، ئێمــەیش وەك ئێــوە

خوێن دێ، لەدڵمان، پارچەی جەرگ پێوە

ســــلاّوی ئێمـــــەو دێــــی داریكــــەلی

لەســــەرجەم نـــەوەی ئیمـــامی عـــەلی

تـــا كـــوردێ مابـــێ لــــەم كوردســـتانە

نـەوەی شـێخ مـەحموود نـووری چاویانە

ســـەلاّوی ســـەرجەم گـــەلی كـــوردی مـــەرد

لـــەگیانی پـــاكی قـــازی موحەممــــەد!

قـــازی شـــەهیدە، شـــەهید نـــامرێ

بمـــرێ بكـــوژی، پەنجــەی هـــەلۆمرێ!

بـــۆ دەســـتەی شـــەهید بـــووی بەپێـــشەوا

وەك ئەسـتێرەو مـانگ لەجەرگـەی شـەوا

پەروانـــــە ئاســــا، پــــەیڕەوانی تــــۆ

ئـالاّی شـەهیدی، یـەك یـەك دەقۆزنـۆ!!

خــــەبات لـــــەدژی ڕەگەزپەرســــتی

قــاسملووی بــرده لووتکــەی سەربەســتی

کەدیم گولی سوور — قاسم! — پەشێوم تـەواو

خونجــەی زامــی تــۆم دێنێتــە بەرچــاو!

## ٩٤- باسی کردەوەی چاکەو مافی خۆیشایەتی
## بابُ: البِرِّ وَالصِّلَةِ

{بڕوانـە: تـاج/٥، لاپـەڕە/٣، زنجیرە: ١، لـە ژمـارە: ٤٦٥٠ وە هـەتا ژمـارە: ٤٩٣٨ لە زنجیرە: ٥٧. پوختەی صـەحیحی موسـلیم = مختـصر صـحیح مـسلم/٥، لاپەڕە/١، لە زنجیرە: ١٣٣٥ وە هەتا زنجیرە: ١٣٩٤، لە ژمارە: ١٧٥٤ وە هەتا ژمـارە: ١٨٢٧. ریـاض الـصالحین/١، زنجـیرە: ٤٠، ژمـارە: ٣١٢ + تەجریـدی بوخـاری/٥، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ١٩١٤ هەتا ژمارە: ١٩٣٧ = ٦٠١٣ بووخاری}.

١٤٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ عَلَيْهِ فِي رِزْقِهِ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِـي أَثَـرِهِ، فَلْيَـصِلْ رَحِمَهُ } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریـدی بوخـاری: ٩٤٠ = بوخـاری: ٢٠٦٧، ٥٩٨٦. مختـصر صـحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٦٢ = ترقیم شیحا: ٤٦٧١ = مسلم: ٢٠٦٧}:

**لە صەحیحی موسلیما ئاوایە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئـەو کەسـەی کەحـەز دەکـا ڕزق‌و ڕۆژی زۆر بێ‌و تەمەنی درێژ بێ، با خـزم دۆسـت بـێ، صیلەی ڕەحـم بـەجێ بهێنـێ!). {ریـاض/١، زنجـیرە: ٤٠، ژمـارە: ٣١٩ ج/٣ + تـاج/٥، زنجـیرە: ٤، ژمـارە: ٤٦٧٦}.

١٤٨٣- وَعَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا يَدْخُلُ اَلْجَنَّةَ قَاطِعٌ } يَعْنِي: قَاطِعَ رَحِمٍ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩١٦ = بوخاری: ٥٩٨٤ بوخاری. پوختـەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٦٥ = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شـیحا = شیحا: ٦٤٦٧ = ترقیم محمد فؤاد عبدالباقی/٢٥٥٦}:

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەو کەسـەی ڕشـتەی خزمایـەتی بپسێنێو سیلەی ڕەحـم بـبڕێ، دووپێـی ناچێتە نـاو بەهەشـت). {ریـاض/١، زنجـیرە: ٤١، ژمـارە: ٣٣٩ + تـاج/٥، زنجـیرە: ٤٠، ژمـارە: ٤٦٨٢ ج/٤ = چـاپی چوارەم}.

١٤٨٤- وَعَنْ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { إِنَّ اَللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ اَلْأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ اَلْبَنَاتِ، وَمَنْعًا وَهَاتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ اَلسُّؤَالِ وَإِضَاعَةَ اَلْمَالِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمـارە: ١٠٥٠ = بوخـاری/٢٤٠٨، ١٤٧٧. مختـصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٣٦ = ٤٤٥٦ شیحا = ٥٩٣ مـسلم + صـحیح مـسلم ترقیم شیحا: ٤٤٥٨}:

خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (خـودای گـەورە قەدەغەی کردووە لێتان:

یەکەم: دڵ ئازاردانو دڵڕەنجاندنی باوكو دایكان.

دووەم: وە زیندەبەچاڵكردنی كچان.

سێیەم: وەنەدانی مافی سەرتان.

چوارەم: وە زەوتكردنی مافی خەڵكان.

وە حەزیش ناكات لەم سێ ڕەفتارە بۆتان:

یەكەم: لەوتی وتی.

دووەم: لەپرسیاری زۆرو لەداواكردنو سواڵكردنی زۆر.

سێیەم: لەزایەکردنی ماڵو بەفیڕۆدانی. {ریاض/١، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٠ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٦، ژمارە: ١٧٨١ + تاجول ئوصول بەرگی/٢، زنجیرە: ١٦٤، ژمارە: ١٨٨٥، چ/٤، لاپەڕە: ٣٧٦}.

١٤٨٥- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { رِضَا اَللَّهِ فِي رِضَا اَلْوَالِدَيْنِ، وَسَخَطُ اَللَّهِ فِي سَخَطِ اَلْوَالِدَيْنِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع: ٣٥٠٧. ترمذی: ١٨٩٩. ابن حبان: ٤٢٩، حاكم٤/١٦٨. بزار: ٢٣٩٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) لە خۆشەویستەوە، دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەر کەسێ باوكو دایکی لێی رازی بێ، خودایش لێی ڕازییە، وە هەرکەسێ باوكو دایکی لێی نارازی بێ، خودایش لەو نارازییە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٤٦٦٢ چ/٤}.

١٤٨٦- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُحِبَّ لِجَارِهِ - أَوْ لِأَخِيهِ- مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ١٣ = بوخاری/١٣. صحيح مسلم ترقيم شيحا: ١٦٩ + مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٢، ژمارە: ٢٤ = شيحا: ١٦٨}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، کەخودای گەورەیە، کەستان بەتەواوی ئیمانو باوەڕ ناهێنێ، هەتا هەرچی بۆ خۆی پێی خۆشە، ئەویشی بۆ دراوسێکەیو برای موسوڵمانی پێ خۆش نەبێ). {تاج/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٤}.

١٤٨٧- وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ سَأَلْتُ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَيُّ اَلذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: { أَنْ تَجْعَلَ لِلّٰهِ نِدًّا، وَهُوَ خَلَقَكَ. قُلْتُ ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَأْكُلَ مَعَكَ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٣١ = بوخاری: ٤٤٧٧ و ٤٧٦١، ٦٠٠١، ٦٨١١، ٦٨٦١، ٧٥٢٠، ٧٥٣٢. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٥١ = شیحا: ٢٥٤. مسلم: ٨٦. أبو داود. طلاق: ٢٣١٠. ترمذی. تفسیر: ٣١٨٢. نسائی. تحريم: ٤٠٢٤. تحفة الأشراف/٩٤٨}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چی گوناهی لەلای خودا زۆر گەورەیەو بەتاوانێکی زۆر گەورە دەژمێردرێ؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە مانەند بۆ خودا بڕیار بدەیت، ئەو خودایەی کەتۆی لەنەبوون دروست کردووە، تۆ بڵێیت: هاوەڵی هەیە). گوتم: لەڕاستیدا خۆشی وایەو ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئەی لەدوای ئەوە چی تاوانێکی تر فرە گەورەیە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کە لەترسی ئەوەی منالی خۆت نان‌و ئاوەکەت لەگەڵتا بخوات بچی بیکوژی!). گوتم: ئەی دوای ئەو چی تر؟ فەرمووی: (ئەوەیە کەداوێن پیسی بکەیت لەگەڵ حەڵاڵ‌و هاوسەری دراوسێکەتدا).

جا خودای گەورەو مەزن‌و خاوەن شکۆ، بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیەی خۆشەویست، ئەم ئایەتەی لەسوورەتی فورقاندا ناردە خوارەوە: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللّٰهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّٰهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا – الفرقان/٦٨}. واتە:

(وە ڕەوشتێکی جوانی تری بەندە باشەکانی خودا ئەوەیە کە جگە لەخودای تاک‌و تەنها خودای تر ناپەرستن‌و هاواری لێ ناکەن، وەخوێنی

ناهــەق نارِێــژن، وەداوێنپیــسی ناکــەن‌و خواپەرســت‌و دەم‌و دەســت‌و دڵ‌و دەروون‌و داوێن پاکن، وەکی تریش هەرکەسێ ئەم جۆرە تاوانانــە ئــەنجام بــدا، ڕووبەڕووی سزاو تۆڵەی سەختی خودا دەبێتەوە!).

١٤٨٨- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَـا) أَنَّ رَسُـولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مِنْ اَلْكَبَائِرِ شَتْمُ اَلرَّجُلِ وَالِدَيْهِ. قِيلَ: وَهَلْ يَسُبُّ اَلرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. يَسُبُّ أَبَا اَلرَّجُلِ، فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ، فَيَـسُبُّ أُمَّـهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخـاری/٥، ژمـارە: ١٩١٥ = ٥٩٧٣ بوخـاری. صـحیح مـسلم ترقیم شیحا/٢٥٩}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عـاص (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (تاوانێکی گەڵ گەورەیەو لەگوناهە هەرە گەورەکانە: کە کەسی جنێو بـە بـاوك‌و دایکـی خۆی بدات). یاران عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! جا چۆن چۆنی مرۆڤ جنێو بە باوك‌و دایکی خۆی ئەدات، بۆ هەیـە کەشـتی وا بکا؟ فـەرمووی: (ئـا، هەیـە، بـەم شـێوەیە دەچـێ جنێـو بـە بـاوك‌و دایکـی کابرایـەکی تـر دەداو، کابراکەیش جمێن بە باوك‌و دایکی ئەو دەداتەوە، ئاوا دەبێ بـەهۆی ئـەوە کـە خـەڵك جنێـو بـە بـاوك‌و دایکـی بـدەن!). {ڕیـاض/١، لاپـەڕە: ٢٧٢، زنجـیرە: ٤١، ژمارە: ٣٣٨}.

١٤٨٩- وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ يَلْتَقِيَانِ، فَيُعْرِضُ هَذَا، وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا اَلَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجریـدی بوخـاری/١٩٤٥ = ٦٠٧٧، ٦٢٣٧ بوخـاری. مختـصر صـحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٠١ = شیحا: ٦٤٧٨ = مسلم/٢٥٦٠}:

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دروست نییە بۆ موسوڵمان، چ پیاو بێ چ ژن بێ، کەزیاتر لەسێ شەو قسە دابڕێ لە برای موسوڵمانی، یان لەخوشکی موسوڵمانیو قسەی لەگەڵدا نەکا، گریمان ئەو لەشوێنێ تووشی یەکتری بوون، ئەمیان بەم لاداو ئەویان بەولادا ڕوو وەرگێڕێ، باشترینی ئەم دوو موسوڵمانە، لە یەکتری تۆراوانە، کە قسەیان بەیەکەوە نییە، ئەوەیانە کەلەپێشدا ئاشت دەبێتەوەو ڕۆژ باشیو چاکوچۆنیو سڵاو لەوی تریان دەکا). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٠، ژمارە: ١٥٩٢ چاپی سێیەم}.

١٤٩٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٣١ = بوخاری/٦٠٢١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەنجامدانی ئەوەی کە یاسانامەی خودا پەسەندی بکا، بەچاکەو بەخێر دائەنرێ!). {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٤٤}.

(ڕوونکردنەوە):

مامۆستای عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم نموونانە دەهێنێتەوە، بۆ ئەو خێرو چاکەیەی کە لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ کراوە — وە زۆرینەیان بە فەرموودەی تر دەسەلمێنێ:

١- ئەو خەرجیو مەسرەفەی مرۆڤ دەیکا بۆ خزمو کەسوکارو مناڵی خۆی.

٢- هەرچی ببێ بەهۆی پاراستنی ناموسو ڕێزی خۆی.

٣- ڕووی خۆش لەگەڵ دۆستو برادەرو موسوڵماناندا.

٤- چۆڕێ ئاو لە سەتڵەکەت بکەیتە سەتڵو دۆڵچەی هاوڕێکەت.

٥- هەموو قسەیەکی باش‌و هەموو کارێکی چاك‌و هەموو خووو عادەت‌و ڕەوشت‌و نەریتی جوان‌و باش.

٦- نەکردنی خراپەو خۆ دوورخستنەوە لەشەڕ. بەتایبەتی لەو کاتانەدا، کەهۆکاری ئەوە ساز بێت.

٧- مەعرووف: هەموو کارێکە کە شەرع‌و هۆشی ساخ بە باشی دابنێن.

٨- دستپێوەگرتن کە دژی دەستبڵاوییە.

٩- هەموو کارێ، یا ئیشێ، یا فەرمایشت‌و قسەیێ کە بە بەڵگەی شەرعی بچەسپێ‌و ساخ ببێتەوە، کە هەق‌و ڕەوایەو کردنی بەپێی شەرع ڕەوایەو باشە.

١٠- ئیتر کورت‌و پوخت: گەورەو بچووکی چاکە، کەم‌و زۆری چاکە، کردنی بەنیازی پاك مەعرووفەو هەموو مەعرووفێکیش دادەنرێ بەخێرو خێرات.

١٤٩١- وَعَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ اَلْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ } .

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٨٢ = شيحا ٦٦٣٢ = صحيح مسلم: ٢٦٢٦}:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو زەڕ! ئەوەی کەپێی بگوترێ چاکە بەکەمی مەزانەو بەسووکی مەگرە، با ئەوەیش بێ کە بەڕووی خۆش‌و ڕووی گەشەوە بگەی بە برادەری خۆت، یان بە برای ئایینی خۆت!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢١ چاپی سێیەم} .

١٤٩٢- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِذَا طَبَخْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَهَا، وَتَعَاهَدْ جِيرَانَكَ} أَخْرَجَهُمَا مُسْلِمٌ .

{بوخاری. ئەدەب: ٦٠١٥. مختصر صحيح مسلم: ١٧٨١ = شيحا: ٦٦٣٢ = مسلم/فؤاد/٢٦٢٥}:

ئـەبو زەڕی غـەفاری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەی ئەبو زەڕ! هەرکاتێ مەرگەو شتی وات لێنا، هەندێ ئاوەکەی زۆرتـر بکە، تـا بـەش بکا، ئـەوجا سـەرەنجی دراوسێکانت بدە، بـەپێی توانـا، بەشێوەیەکی شایان، بەشـی دراوسـێکانت لـەو مەرگەیـە بـدە). {ریاضـی صـالحین/١، زنجـیرە: ٣٩، ژمـارە: ٣٠٤ ج/٣ + تـاج/٥، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٧٠٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٤٩٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ اَلدُّنْيَا، نَفَّسَ اَللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِـنْ كُرَبِ يَوْمِ اَلْقِيَامَةِ ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اَللَّهُ عَلَيْهِ فِي اَلدُّنْيَا وَالْـآخِرَةِ، وَمَـنْ سَتَرَ مُسْلِمًا، سَتَرَهُ اَللَّهُ فِي اَلدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَاَللَّهُ فِي عَوْنِ اَلْعَبْدِ مَـا كَـانَ اَلْعَبْـدُ فِـي عَوْنِ أَخِيهِ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مـسلم/٥، ژمـارە: ١٨٨٨ = شـيحا ٦٧٩٣. أبـوداود. أدب: ٤٩٤٦. ترمذی. دعوات: ٣٣٧٨. تحفة الأشراف: ١٢٥١}:

ئەم فەرموودەیە لەموختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هـەر کەسـێ موسـوڵمانێ، لـە مەینـەتێ لـە مەینەتەکانی جیهان ڕزگار بکا، خودای گـەورە لەپاداشـی ئـەوەدا مەینـەتێ لـە مەینەتـەکانی ڕۆژی قیامـەتی بـۆ چارەسـەر دەکـاو، لـە سـەخڵەتێ لـە سەخڵەتییەکانی دوا ڕۆژ ڕزگاری دەکاو لـە تەنگانـەیێ لـە تەنگانـەکانی ڕۆژی دوایـی قوتـاری دەکـات، وە هەرکەسـێ دەسـتگیرۆیی هـەژارێ، نـەدارایێ بکـا، لەجیهانو دوارۆژدا، خـودایش دەسـتگیرۆیی ئـەو دەکا، وە هەرکەسـێ عـەیبو نەنگی موسوڵمانێ بپۆشێ، یان جەستەو لەشی بەجلێ، بـە پۆشـاکێ دابپۆشـێ،

ئـەوە خـودایش ئـەو کەسـە لەهـەردوو جیهانـدا، بـە بـەرگی ڕەحمـەتی خـۆی دادەپۆشێ، وە خودا لەپشتی ئەو بەندەیە، کەپشتی برای ئایینی خۆی دەگرێ، هەرکەسێ ڕێگەی زانین بگرێو وێڵی دوای زانستو زانـین بـێ، خـودای گـەورە ڕێگەی بەهەشتی بۆ خۆش دەکا، وە هەرکۆمەڵێ لە ماڵێ لـە ماڵـەکانی خـودادا کۆببنەوەو نامەی خودا کـە قورئـانی پـیرۆزە بخوێنن‌و لـەناو خۆیانـدا دەوری بکەنەوەو واتاو مانای لێك بدەنـەوە، بێگومـان کـەوا پـەری‌و فریـشتەی سـۆزو میهرەبانی‌و دڵنیایی، بەسەریاندا دادەبارێو ڕەحمەوت سۆزو میهرەبانی دایان دەپۆشێو فریشتەی ڕەحمەت دەوریان لێ دەدەن، وەخودایش لـەبارەگای خـۆی، لەلای مەلەئی ئەعلا، لەناو ئەنجومەنی هەرە باڵادا، باسی چاکی‌و چاکەکەیان دەکا، وە هەرکەسێ کاروکردەوەی خۆی دوای بخات، بنەچـەو بنەماڵـەی پێـشی ناخاتا). {تاج/١، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٠٠ — فـەزڵو گـەورەی زانـین‌و زانایـان + ڕیاضی صـالحین/١، زنجیـرە: ٢٩، ژمـارە: ٢٤٥ گـەورەیی جێبـەجێ کردنـی کـارو ئیشی موسوڵمانان}.

١٤٩٤- وَعَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ، فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١١٠١ = ٤٨٧٦ شـیحا = مـسلم ١٨٩٣. ریاض/١، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٧٣ ض/٤}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هـات بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزیکرد: قوربـان! وڵاخـی سـوارییەکەم لـەناو چـوو، بفـەرموو وڵاخێکـی سـواریم پـێ بـدە، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (وڵاخـی سواری زیـادەم نییـە، بیـدەم پێـت). پیـاوێ تـر لـەوێ بـوو گـوتی: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! مـن کەسێکی پێ نیشان دەدەم، کە وڵاخی سواری پێ دەدا، پێغەمبـەریش (دروودی

خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ خێرێ نیشانی کەسێ بدا، ئەویش وەك خێرکەرەکە خێری دەگا).

(ڕوونکردنەوە):

ئەوەی کەدانەر دەفەرموێ: ئیبنو مەسعوود دەفەرموێ: یان هەڵەی قەڵەمە، یان هەڵەی نووسیارە، لەصەحیحی موسلیمدا لە (ئەبو مەسعوودی ئەنصار)یەوەیە.

١٤٩٥- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { مِنْ اسْتَعَاذَكُمْ بِاَللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَكُمْ بِاَللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ أَتَى إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا، فَادْعُوا لَهُ } أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ.

{صحيح الجامع: ٦٠٢١. الصحيح المسند: ٧٣٦}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ پەنای بردە بەر خودا وەك ئەوە گوتی: توخودا دەستم لێ مەدەو ئازارم مەدە، ئەوە پەنای بدەن، وە هەرکەسێ بەهێنانی ناوی خودا داوای چشتی لێ کردن، لەبەر ڕێزی ناوی خودا بەشی بدەن، نائومێدی مەکەن، وەهەرکەسێ بانگی کرد بۆ نانخواردنو شتی وا بچن بەدەنگیەوە، وەرهەکەسێ پیاوەتیو چاکەیەکی لەگەڵدا کردن تۆڵەی بۆ بکەنەوە (چونکە جیهان دەستیاوە) ئەوەیشی کە نەیبوو تۆڵەی بۆ بکاتەوە، با نزای باشی بۆ بکا، تا لەباوەڕی خۆتاندا وابزانن کەتۆڵەتان بۆی کردۆتەوە).

{تاج/٢، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٢٨٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بەجێهێنانی مافی خزمایەتی باشترین هۆیە، بۆ زۆری رزقی حەلاڵو تەمەنی درێژی پڕ لەخێرو خۆشی هەردوو جیهان.

٢- بڕینی ڕشتەی خزمایەتی، کلیلی بەهەشت لەدەست دەدا.

٣- ئازاردانو دڵئێشانی باوكو دایك لە گوناهە هەرە گەورەکانە.

٤- زیندەبەچاڵکردنی مناڵ کچ بێ، یا کوڕ گەورەترین تاوانە.

٥- کۆمەڵێ شتی باش، یا خراپ. {بڕوانە: ژمارە: ١٤٨٤} .

٦- ڕەزای باوكو دایك کلیلی هەموو خێرو بێرێکە.

٧- چیت بۆ خۆت پێ خۆشە، ئەو شتەت بۆ براو خوشکی موسوڵمانیشت پێ خۆش بێ، هەرچیت بۆ خۆت پێ ناخۆشە بۆ ئەوانیش پێت ناخۆش بێ.

٨- هاوەڵ دانان بۆ خودا گەورەترین تاوانە.

٩- قسەدابڕینو قسەنەکردن لەگەڵ موسوڵمانا، بەبێ هۆی ڕەوا، نادروستو ناڕەوایە.

١٠- هەرچی شەرع پەسەندی بکا چاکەیە، هەموو چاکەیەکیش خێرکردنە.

١١- ئەوی چاکە بێ، کەمو زۆری، گەورەو بچووکی، نابێ بەبێ بایەخ تەماشای بکرێ، بەڵکوو دەبێ بەچاوی ڕێزەوە تەماشای بکرێ.

١٢- گیانی هەرەوەزیو دراوسێ دۆستیو خێرخوازی، سووڕگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

١٣- هەمیشە پێویستە لەسەرمان ڕێزی ناوە جوانەکانی خودا بگرین، کەسێ گوتی: توخودا بەشم بدە بەشی بدە، تو ناوە جوانەکانی خودا لێم مەدە لێی مەدە.

١٤- چاکەی خەڵکت لەبەرچاوبێو بەپێی توانا تۆڵەی بۆ بکەرەوە.

## ٩٥- باسی دنیا نەویستیو پارێزو کوێ بەدنیانەدان
## بابُ: الزُّهْدِ وَالوَرَعِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول/٥، زنجیرە: ٩٤، لە ژمارە: ٥١٥٧.م هەتا ژمارە: ٥٢٥٧ + موختەصەری صەحیحی موسلیم/٥، لە ژمارە: ٢٠٦٩ وە هەتا ژمارە:

٢٠٩٣ + پوختـەی صەحیحی بوخاری = تەجریـدی بوخـاری/ لـە ژمـارە: ١٩٩٧ وەهەتا/٢٠٤١}.

١٤٩٦– عَنْ اَلنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ- وَأَهْوَى اَلنُّعْمَانُ بِإِصْبَعَيْهِ إِلَى أُذُنَيْـهِ: { إِنَّ اَلْحَلَـالَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ اَلْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ، لَا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنْ اَلنَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى اَلشُّبُهَاتِ، فَقَدِ اِسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي اَلشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي اَلْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ اَلْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يَقَعَ فِيهِ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وَإِنَّ حِمَى اَللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي اَلْجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ، صَلَحَ اَلْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ اَلْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ اَلْقَلْبُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٨ = ٥٢، ٢٠٥١ بوخاری = فتح البـاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٥٦ = مسلم ترقیم شیحا: ٤٠٧٠ = مسلم محمد فؤاد/ ١٥٩٩. أبوداود. بيوع: ٣٣٣٠، ٣٣٢٩. ترمذی. بيوع: ١٢٠٥. نسائی. بیوع: ٤٤٦٥. ریاض/٢، زنجیرە: ٦٨، ژمارە/١/٥٨٨}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەردوو دەستی خۆی درێژکرد بۆ هەردوو گوێی خۆیو فەرمووی: بەم دوو گوێیانەی خۆم، لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (شتی حەڵاڵ دیارو ئاشکرایە، هەروەها شتی حەرامیش دیارو ئاشکرایە، بەڵام لەو بەینەدا هەندێ شت هەن دوو بەینینو لەهەردوولا دەچن، لەبەرئەوە گەلێ کەس حوکمەکەیان نازانن، بەڵام زانایانی ئایین، لەپاش لێکۆڵینەوەی شایان، بڕیارە شەرعییەکەیان دەدۆزنەوەو بڕیار دەدەن کە حەڵاڵن یا حەرامن، ئەوسا بۆ خەڵکی تریش هەیە لەسەر بڕیاری ئەوان شتەکە بکەن، یا نەیکەن، جا ئەوەی کە خۆی بپارێزێ لەشتی شوبهەدارو گومانلێکراو، ئەوە ئایینو نامووسی خۆی لە نەنگو لکە دەپارێزێ بەپێی شەرعی خودا.

بەڵام ئەوەی کە تـوخنی شـتی شوبهەدارو گومـانلێکراو دەکـەوێ، خـواه نـاخواه، تووشـی دەبـێ بەتووشـی حەرامیـشەوە وەك چـۆن شـوان ئەگـەر لەدەوروبەری پاکژو پـاوان، ران بلـەوەڕێنێ، بـەرە بـەرە رانەکـە لـە پاکژو لـە پاوەندەکەیش دەلەوەڕێ.

باش ئاگاداربن! کەهـەموو پادشـایێ بەسـتو پاوەنـدێکی تایبـەتی خـۆی هەیە، بزانن کە بەستو پاوەندی خودایش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون!

باش ئاگاداربن! کە گوڵمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا ئەگـەر ئـەو گوڵمە گۆشـتە سازو بـاش بـوو، ئـەوا جەسـتەیش هـەمووی سازو بـاش دەبـێ، بەڵام ئەگەر ئەو گوڵمەیە خراپ بوو، ئەوا جەستەیش هەمووی خـراپ دەبـێ، بـزانن کـە ئـەو پارچـە گۆشـتو گوڵمـە گۆشـتە برێتییـە لـە دڵ، کەواتـە: دڵـی پاكو لەشی چاكو ئەنـدامی پـڕ خێـرو خۆشـی، دڵـی پـیسو لەشـی چـەپەڵو ئەندامی قاڵ لەپیسیو چەپەڵیو گوناه).

(ڕوونکردنەوە):

لەسەر ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا ئەمـەم نووسـیوە {ب/١، لاپەڕە: ٧٩، ژمارە: ٤٨ – راڤەو شیکردنەوە}:

لەســـەر فەرمایـــشتی زاناکـــان، ئـــەم فەرموودەیـــەیش یەکێکـــە لـــەو فەرموودانە کەبوون بەسووڕگەو مەدار بۆ بڕیارەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام. باشـــترین نموونـــە لـــەم رۆژگـــارەی ئێمـــەدا بـــۆ شـــتی گومـــانلێکراو، ئـــەو خواردەمەنیو خواردنەوەو داوو دەرمانو شتە تازە بابەتانەیە کە لـەدەرەوەی وڵاتـەوە دەهێنـرێن، وەك مریـشکی پاکـەتو گۆشـتی تـری پاکـەت، ئەمانـەو وێنـەی ئەمانـە جێگـەی گومـانو گومانیـان لێ دەکـرێ، کـە بـەپێی مەرجـە شەرعییەکانن یانا؟

دەبـێ مـەردوم لـەم جـۆرە شـتانەدا رای زاناکـان وەربگـرن، وە بـەپێی فەرمایـشتی ئـەوان لـەم بارەیـەوە رەفتـار بکـەن، چـونکە موسـوڵمان ئـەو

موسولمانەیە: کە لە هەڵەو تاوانو گوناهو کارو کردەوەیدا، چاو لەڕەشە خەڵك نەکا، بەڵکوو چاوی لەدەمی مامۆستای مەلابێ، ئەو چی فەرموو ئەوە تەواوە، دەنا بەڕاستی گەلێ خەڵکی خوانەناس پەیدابوون، گەلێ لە دەهری و زەندیقە کۆنەکان خراپترن، ئەوانەی کۆن هەر هیچ نەبێ شەرمو شکۆیان لە لێپرسینەوەی ویژدانو مێژوو ورەخنەی کۆمەڵ دەکرد، بەڵام ئەمڕۆ کەسانێ پەیدابوون، پەروەردەی ژێر دەستی عەلمانییەتن، بە ئارەق گۆشکراون، گەل بەگەلە ران دەزانن، میللەت وەك کێڵگەی پەلەوەرو ئاژەڵی خۆیان تەماشا دەکەن، هەر بیر لە قازانجی خۆیان ددەکەنەوە، نە بەتەنگی ئایینی خەڵکەوە دێن، نە دەربەستی تەندروستیو بەرژەوەندی کۆمەڵو جەماوەرن، بۆ سوودو قازانجی خۆیان دەست لەگەڵ شەیتان تێکەڵ دەکەن، بازرگانی بە ئاگرو بارووتو تی ئین تیو میکرۆبی سیلو دیقو شێرپەنجەوە دەکەن!

١٤٩٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {تَعِسَ عَبْدُ اَلدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمِ، وَالْقَطِيفَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ} أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٨٨ = بوخاری/٢٨٨٧، ٢٨٨٦، ٦٤٣٥}:

لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مرۆڤی پارە پەرستو پوولەکی داوەشێو عەمری نەمێنێ، هەر خەریکی چڵکاو خۆریو شڕە خۆرییە، بەندەیی خودای لەبیرنییە، دەڵێی نۆکەری ئەڵقە بەگوێی قەیفەو گوروونییە، هەر چاوی لە بەرژەوەندی خۆیییە، گوێ لەمشتی نەوسنییە، بەشی بدرێ مەمنونییە، بەشی نەدرێ لەگەڵ دوژمنییە، داوەشێو سوێی ببێتەوە، ئەگەر دڕکێکی تێ هەڵچەقێ، بە مووکێشیش دەرنەیەتەوە!

خۆشی لەو بەندەیەی خودا، کە بەسەری ئالۆسکاوی بەپێی تۆزاوی، لەڕێگەی خودادا، جڵەوی ماینەکەی خۆی دەگرێ، ئەگەر بوو بە پاسەوان، ئەوا پێی رازییەو بەجوانی پێی هەڵدەستێو، لە هێڵی یەکەمی بەرەی جەنگا، بەرابەر سوپای دوژمن، ئێشکی سوپای ئیسلام دەگرێ، ئەگەر بوویش بە پاشدارەی سوپای ئیسلام، ئەوا دیسان پێی رازییەو بەجوانی بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵدەستێو، هەمیشە فەرمانبەرەو گوێڕایەڵەو سەرپێچی لە فەرمانی فەرمانڕەواکانی خۆی ناکات، ئەگەر داوای مۆڵەت بکا، کە بچێ بۆی کەسێ، یا بۆلای بەرپرسێ، لەبەر بێ نازی، ڕێگەی پێ نادرێ، ئەگەر لەلای کەسێ تکایە بکا بۆ خۆی، یا بۆ کەسێ، تکاکەی ناگیرێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٧٢م. ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەوەی کە لە کوردییەکەی تەجریدی بوخاری‌و تاجول ئوصولا دەفەرموێ: (ئەم فەرموودەیە موسلیمیش دەریهێناوە، هەڵەیە).

١٤٩٨- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِمَنْكِبِي، فَقَالَ: { كُنْ فِي اَلدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ } وَكَانَ اِبْنُ عُمَرَ يَقُولُ: إِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرِ اَلصَّبَاحَ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرِ اَلْمَسَاءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِسَقَمِك، وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ. أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٩٨ = بوخاری/٦٤١٦}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرشانی گرتم‌و فەرمووی: (لەم جیهانەدا خۆت بەئاوارە دابنێ، یا خۆت بە ڕێبوارو ڕەفتەنی بزانە، بەڵکوو لەوە پتریش وای دانێ کە مردووی ناو گۆڕستانی، کەواتە لەم کاروان سەرایەدا پشتی لێ مەکەرەوەو بەماڵی خۆتی مەزانە!).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) خۆشی دەیفەرموو: (ئێوارێ بەتەمای بەیانی مەبە، بەیانی بەتەمای ئێوارێ مەبە، کاتێ لەشت ساخە هەوڵ بدەو تێکۆشەو توێشوو بخە بۆ کاتی ناساغیت، ژیانت بەهەل بزانەو، هەوڵو کۆششی تیادا بدە بۆ پاش مردنت!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٧٥م. ریاضی صالحین/٢، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٤٧١/٥}.

١٤٩٩- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ، فَهُوَ مِنْهُمْ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٢٨٣١}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): (هەرکەسێ لاسکایی کۆمەڵێ بکاتەوە خۆشی یەکێکە لەوان). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢٨٩٤ – ئەبو داوود/ طەبەرانی – سند حسن}.

١٥٠٠- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمًا، فَقَالَ: { يَا غُلَامُ! اِحْفَظِ اَللَّهَ يَحْفَظْكَ، اِحْفَظِ اَللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، وَإِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلْ اَللَّهَ، وَإِذَا اِسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ } رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

{صحيح الجامع/٧٩٥٧. الصَّحيح المسند/٦٨٥}:

لەتاجول ئوصولا ئاوەهایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێکیان لەپاشکۆی پێغەمبەردا سوار بوو بووم، فەرمووی پێم: (ئەی جەوان! تۆ ئاگات لە مافەکانی خودابێ، خودایش چاوی خێری لەتۆ دەبێ، لەخودا بێئاگا مەبە، دەبینیت کە هەمیشە خودا فریات دەکەوێ، داوای شت هەر لەخودا خۆی بکە، داوای کۆمەکیش هەر لەخودا خۆی بکە، بشزانە ئەگەر ئەم خەڵکە سەرجەم کۆببنەوە بۆئەوەی کەسوودێ، یاخود زیانێ بەتۆ بگەیەنن، کەخودا لەچارەتی

نەنووسێبێ ناتوانن، چونکە هەرشتێ، ئایا چاك، ئایا خراپ، کەخودا خۆی لە چارەتی نەنووسیبێ تووشت نابێ، قەڵەمو کاغەز پێچڕاونەتەوەو هەڵگیراون، هەموو شت هەر لەسەرەتاوە بڕاوەتەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٥٢٠٩} .

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست لەمافەکانی خودا ئەو ئەرکانەیە کەوا لەسەر بەندە، هەروا ئەو سنوورانەیە کەخودا دایناوە بۆی کە نەیانبەزێنێ.

٢- مەبەست لەوەیش کە بەندە هەر داوای یارمەتیو کۆمەکی لەخودا بکا، ئەوەیە کەبۆ جێبەجێ بوونی نیازو مراز هەر لەخودا بپاڕێینەوەو وبەس. دەنا مەبەست ئەوە نییە کەتۆ داوای قەرز، یا یارمەتی ماڵی، لە برای موسوڵمانی خۆت نەکەیت.

١٥٠١- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنه) قَالَ: { جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اَللَّهُ، وَأَحَبَّنِي اَلنَّاسُ. فَقَالَ: اِزْهَدْ فِي اَلدُّنْيَا يُحِبَّكَ اَللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ اَلنَّاسِ يُحِبُّكَ اَلنَّاسُ } رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَه، وَسَنَدُهُ حَسَنٌ.

{صحيح الجامع/ ٩٢٢}:

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کاروکردەوەیەکم نیشان بدە، کاتێ کە بیکەم هەم ببێ بەهۆی خۆشەویستی خودا بۆمو هەم ببێ بەهۆی خۆشەویستی مەردوم بۆم.

فەرمووی: (جیهان نەویست بە خودا خۆشی دەوێت، چاویشت لەدەستی خەڵکی نەبێو تەماعت پێیان نەبێ ئەوانیش خۆشیان دەوێت!).

(ڕوونكردنەوە):

واتە: گوێ بەخۆشیو ڕابواردنی جیهان مەدەو بەكەمی قایيل بە، خودا خۆشی دەوێيت، خوازەلۆكيش مەبەو چاوت لەدەستی ئەمو ئەو نەبێو داوای شتيان لێ مەكە، خەڵكيش خۆشيان دەوێيت.

١٥٠٢ – وَعَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { إِنَّ اَللَّهَ يُحِبُّ اَلْعَبْدَ اَلتَّقِيَّ، اَلْغَنِيَّ، اَلْخَفِيَّ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٨٨ = شيحا/٧٣٥٨ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/٢٩٦٥}:

لە موختەصەری صەحيحی موسليمدا ئاوایە:

عاميری كوڕی سەعد فەرمووی: سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) لەناو ڕانە وشترەكانيدا بوو، ڕوانی وا عومەری كوڕی بە تووڕەيی بەسواری هات بۆلای، لەبەرئەوە فەرمووی: پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕی ئەم سوارە، كە عومەری كوڕی خۆمە! جا عومەر لە وڵاخەكەی ددابەزیو هات بۆلای باوكیو پێی گوت: ئەوە تۆ خەريكی چيت، هاتوويت بۆناو ڕانە وشترو ڕانە مەڕو ڕانە بزنو ئاژەڵەكانت، هاوڕێكانی تۆيش ئەوەتانێ لەسەر دەسەڵاتو پادشايەتی لەناو مەدينەدا شەڕو هەرايانە؟ ديارە كە ئەم گفتوگۆيە لەسەردەمی ئاژاوەو ئاشووبەكەدا بووە.

سەعديش ماڵی بەسينگی عومەری كوڕيداو گوتی: وسبە، بێدەنگبە، بەگوێی خۆم لەزاری پيرۆزی پێغەمبەری ئازيزو خۆشەويستم بيست دەيفەرموو: (خودا بەندەی لەخودا ترسی دەوڵەمەندی شاراوەی خۆش دەوێ!). {ڕياض/٢، زنجيرە: ٦٩، ژمارە: ٥٩٧ = گۆشەگيری لەكاتی خراپبوونی...} + {تاج/٥، زنجيرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٨}.

١٥٠٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ اَلْمَرْءِ، تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَقَالَ حَسَنٌ.

{صحيح الجامع/٥٩١١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی موسوڵمانەتی مرۆڤ بەشێوەیەکی جوان ئەوەیە: کە هەرچی لەمەبەستو ئامانجی ئەوەوە دووربێ، وازی لێ بهێنێ). {تاج/١، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٥}.

١٥٠٤- وَعَنْ اَلْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَا مَلَأَ ابْنُ آدَمَ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{صحيح الجامع/٥٦٧٤. ترمذى/٢٣٨٠}:

لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

میقدامی کوڕی مەعریکەریبە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خراپترین جەواڵێ کە ئادەمیزاد پڕی بکا ورگێتی، ورگ پڕکردن زۆر خراپە، لەڕاستیدا ئادەمیزاد چەن پاروویێ سەروزیادیەتی، ئەوەندەی بەسە کەبەری دڵی بگرێ، وەلێ ئەگەر هەر چاری نەبوو، ویستی زیاتر بخوات، با پەیڕەوی ئەم یاسایە بکا: سێی بکا بەسێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خواردنی، بەشێکی بۆ خواردنەوەی، بەشێکی بۆ هەناسەدانی!). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٥١٨٩م — تەرمەزی/حاکم — سند صحیح}.

١٥٠٥- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ اَلْخَطَّائِينَ اَلتَّوَّابُونَ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَسَنَدُهُ قَوِيٌّ.

{حسن، صحيح الجامع/٤٥١٥. ترمذى/٢٤٩٩. ابن ماجة/٤٢٥١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەموو ئادەمیزادێ بەپێی لەبارابوونی سروشتی، ئامادەیە بۆ خەتاباریی زۆر، بەڵام چاترینی خەتاباران ئەو کەسانەن کە زوو زوو تەوبە لە هەڵەی خۆیان دەکەن). {تاج/٥، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٥١٣٨م – تەرمەزی، ئەحمەد، حاکم – سند صحیح}.

١٥٠٦– وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَلصَّمْتُ حِكْمَةٌ، وَقَلِيلٌ فَاعِلُهُ } أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ فِي" اَلشُّعَبِ" بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ. وَصَحَّحَ أَنَّهُ مَوْقُوفٌ مِنْ قَوْلِ لُقْمَانَ اَلْحَكِيمِ.

{المستدرك/٣٥٨٢ وَقال الذهبي: عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خامۆشی دانایی چاکە، بەڵام کەم کەس کاری پێ دەکا).

دانەر پێشەوا عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: بەیهەقی لە (الشُّعَبِ)دا دەریهێناوە، بەڕشتەیەکی لاواز، وە دەفەرموێ: گوتەی دروست ئەوەیە کە ئەم قسەیە مەوقووف بێو قسەی لوقمانی حەکیم بێ.

## ٩٦- باسی هەڕەشەکردن لە ڕەوشتە خراپەکان
## بابُ: الترهيب مِنْ مَسَاوِئِ اَلْأَخْلَاقِ

١٥٠٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِيَّاكُمْ وَالْحَسَدَ، فَإِنَّ اَلْحَسَدَ يَأْكُلُ اَلْحَسَنَاتِ، كَمَا تَأْكُلُ اَلنَّارُ اَلْحَطَبَ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ. {ضعيف الجامعِ/٢١٩٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دووربن لە حەسوودیو ئێرەییو بەخیلی

چونکه حەسوودیو بەخیلیو کردەوەی چاکە، وەکوو ئاگرو چیلکە وان). یا فەرمووی: (وەك ئاگرو پووش وان، چۆن ئاگر خێرا چیلکەو پووشو پەلاش لووش دەداو دەیسووتێنێ، حەسوودیو بەخیلیش ئاوا خێرو چاکەی مرۆڤ دەماشێتەوەو دەیسووتێنێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٧٦٥}.

١٥٠٨- وَلِابْنِ مَاجَهْ: مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ نَحْوُهُ.

{ضعيف الجامع/٢٧٨١}:

ئەمەیش دەقی وەرگەڕاوی ئەم ژمارەیەیە:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (چۆن ئاگر چیلکە لووش دەداو دەیسووتێنێ، ئێرەییو بەخیلیش ئاوەها چاکەکانی مرۆڤ لووش دەداو لەناویان دەدات، هەر وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە خێرو چاکەیش ئاوەها خراپەو گوناه دەکوژێنێتەوەو دەیسڕێتەوە، نوێژ نوورە لەڕۆژی قیامەتا بۆ موسوڵمانو بۆی دەبێ بەچرا، ڕۆژوویش دەبێ بە قەڵغان بۆ ئاگری دۆزەخ!).

١٥٠٩- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَيْسَ اَلشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا اَلشَّدِيدُ اَلَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ اَلْغَضَبِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری بەکوردی/٥، ژمارە: ١٩٤٨ = بوخاری/٦١١٤ + پوختەی موسلیم بەکوردی = مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٩١ = الحديث/٦٥٨٤ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = صحيح مسلم/ ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/٢٦٠٩}:

له پوختەی موسلیما:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە لەناو خۆتانا کێ بەوەجاخ کوێر دائەنێن؟). گوتمان: ئەوەی کە مناڵی نەبێ، ئێمە بەوە دەڵێین وەجاخ کوێر. فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): (ئەوە وەجاخ کوێر

نییه، بەڵام ئەو کەسە وەجاخ کوێرە، کە کەس لەمناڵەکانی لەپێش خۆیدا نامرن، هەتا بۆی ببێ بە توێشووی قیامەتی!). فەرمووشی: (ئەی باشە ئێوە کێ بە پاڵەوان و ئازاو زۆرانباز دائەنێن؟) عەرزیمانکرد: ئەو کەسەی، کەکەس نەیدا بەزەویداو کەس دەرەقەتی نەیێ!

فەرمووی: (ئەمیش ئەوە نییە، بەڵام پاڵەوان ئەو کەسەیە کە لەکاتی رق هەڵسان و تووڕە بووندا، خۆی پێ رادەگیرێ و دەروونی خۆی پێ زەوت دەکرێ و رقی خۆی دەخواتەوە!). {تاج/٥، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٤٨٢٤ ج/٤}.

١٥١٠- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَلظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری بەکوردی/٣، ژمارە: ١٠٦١ = بوخاری/٢٤٤٧. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٢٩ = شیحا/٦٥١٩ = مسلم/٢٥٧٩}:

لە صەحیحی موسلیما ئاوایە:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: (خۆتان لەزۆرو ستەم بپارێزن، بەڕاستی زۆرو ستەم، تەم و مژو تاریکی زۆرو خەستن لە رۆژی ژینەوەدا، زۆردارەکە دەکەوێتە ناویان و، وەك کوێری مزمەعیل بەهیچ لایەکا سەر دەرناکات، هەروەها خۆشتان لە پیسکەیی و چرووکی و رژدیی بپارێزن، چونکە چرووکی و پیسکەیی، بوون بەهۆی سەرتیاچوون و لەناوچوونی نەتەوەو گەلەکانی پێش ئێوە، بەرە بەرە وای لێکردن، کە لەسەر ماڵی دنیاو سامانی جیهان، خوێنی یەکتری بڕێژن و حەلاڵ و حەرام نەزانن و ناڕەوا بەڕەوا بزانن!). {ریاضی صالحین/١، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٠٣ ج/٣ + تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٣٠ ج/٤}.

١٥١١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ : { اِتَّقُوا اَلظُّلْمَ، فَإِنَّ اَلظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا اَلشُّحَّ ، فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ}. أَخْرَجَهُ

له ژماره: ١٥١٠دا بەتەواوی رابورد.

١٥١٢- وَعَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ اَلشِّرْكُ اَلْأَصْغَرُ: اَلرِّيَاءُ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِسَنَدٍ حَسَنٍ.

{صحيح الجامع/١٥٥٥}:

له مەحموودی کوڕی لەبیدەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) له پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەترسیدارترین شت، کە دەترسم تووشی ئێوەی گەلی ئیسلام ببێ، هاوەڵدانانی بچووکە بۆ خودا؛ کە بریتییە له ریابازی!).

(ڕوونکردنەوە):

١- بۆیە ریابازی دائەنرێ بە هاوەڵدانان (شیرك) بۆ خودا، چونکە بەرە بەرە سەردەکێشێ بۆ پەرستنی ریا بۆکراوەکەیش، بەڵام بەبێ گومان:

آ- کاتێ کەسێ کارێکی باش دەکا، لەدڵەوە پێی خۆش بێ، کە خەڵك بیبینن هەتا چاوی لێ بکەن، یا نزای باشی بۆ بکەن ئەوە دانانرێ بەریابازی.

ب- کاتێ کارێ دەکاو خەڵك وەسپی دەکەن لەسەر کردنی، یا سوپاسی دەکەن لەسەری ئەوەیش دانانرێ بەریابازی.

ج- کورت و پوخت: ریابازی ئەوەیە کە مەبەست لەکارەکە لەدڵەوە بۆ خودا نەبێ، بەڵکوو بۆئەوەی وەسپی بکەن، یا بەهۆیەوە شتێکی دنیایی دەست بکەوێ.

د- خودی کارەکە، وەك نوێژو ڕۆژوو وزەکاتو خێر دائەمەزرێ وە قەزای ناوی، بەڵام ریائەکە پاداشەکەی کەم دەکاتەوە، یا هەر هیچی ناهێڵێ، گەلێ جار بەپێی شوێن لەسەری گوناهیشی دەگات.

٢- مەحموودی کوڕی لەبیدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی پێغەمبەردا لەدایك بووە، بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)

دەفەرموێ: (یەکێکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر). لەهۆزی بەنی ئەشهەلە، چەند فەرموودەیێ لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، لەم زاتانەوە گێڕانەوەی هەیە: ئیبنو عەبباس و عتبانی کوڕی مالیك، لەساڵی (٩٦) نەوەدو شەشی کۆچیدا مەرگ بوو بەمیوانیو کۆچی دوایی کردووە.

١٥١٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { آيَةُ اَلْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣١ = بوخاری/٣٣، ٢٦٨٢، ٢٧٤٩، ٦٠٩٥. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٧ = شيحا/٢٠٨ = مسلم/٥٩. ترمذی/٢٦٣١. نسائی. إيمان/٥٠٣٦. تحفة الأشراف/١٤٣٤}:

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نیشانەی مرۆڤی ناپاك، کە لەزاراوی یاسانامەدا ناسراوە بە مونافیق ئەم سێ شتەیە: کە قسەی کرد بەقەستی درۆبکا، کە بەڵێنیدا بەکەسێ، بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنێ، کە سپاردەیەکیان پێ سپارد گزی لێ بکاو ناپاکی لەسپاردەدا بکا).

(ڕوونکردنەوە):

واتە: خراپیو گەندەڵی کردارو گوتارو ڕەفتارو نیاز، بەڵگەو نیشانەی مرۆی ناپاکە. خوا پەنامان بدا. {بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١٧، لاپەڕە: ٤١، ج/١ + ریاض/١، لاپەڕە:٢٢٩، زنجیرە: ٢٥ + چاپی/٢، لاپەڕە: ١٨٢، ژمارە: ١٩٩}.

١٥١٤- وَلَهُمَا: مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: { وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ }.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٣٢ = بوخاری/٣٤، ٢٤٥٩، ٣١٧٨. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٢٦ = شيحا/٢٠٧ = مسلم/٦٤. ترمذی/٢٦٣٢. تحفة الأشراف/٨٩٣١}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ خووبگرێ بەم چوار شتەوە ئەوە موونافیقو ناپاکی تەواوە، وە هەرکەسێ خووبگرێ بەیەکێ لەم چوارشتەوە، ئەوە ڕەگێکی ناپاکیو نیفاقی واتیادا، هەتا وازی لێ دەهێنێ:

یەکەم: کاتێ قسەو گفتوگۆ دەکا، بەقەستی درۆی تیادا دەکات. (لەبوخاریدا: یەکەم: کاتێ بوو بە ئەمیندار گزیو ناپاکی بکا).

دووەم: کاتێ پەیمان دەدا بەکەسێ، دەیشکێنێو نایباتە سەرو دەیشکێنێو بێ پەیمان دەردەچێ.

سێیەم: کاتێ بەڵێن دەدا بەکەسێ نایباتە سەرو جێبەجێی ناکات.

چوارەم: کاتێ داوایەکی هەبوو لەسەر کەسێ ناهەقی لێ بکاو، بەهەق ڕازی نەبێو بەهەقو ناهەق بیەوێ قسەی خۆی سەربکەوێ).

ئەمە دەقی فەرموودەی ژمارە (١٥١٤)یە، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا لە تەجریدی بوخاریو موختەصەری صەحیحی موسلیما.

١٥١٥- وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { سِبَابُ اَلْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٤٥ = بوخاری/٤٨، ٦٠٤٤. صحيح مسلم. إيمان/٢١٨ شيحا = مسلم (فؤاد): ٦٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شەڕە جنێو لەگەڵ موسوڵماندا، فسوقو لەڕێگەی هەق دەرچوونەو، شەڕ تێبەستنیشی بێباوەڕیو ناموسوڵمانەتییە!). {ڕیاض/٤، لاپەڕە: ١١٥٩، فەرموودەی/١، زنجیرە: ٢٢٦، ژمارە: ١٥٥٩}.

١٥١٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ اَلظَّنَّ أَكْذَبُ اَلْحَدِيثِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجریدی بوخاری، وەرگەڕاوە کوردییەکەی/٥، ژمارە: ١٩٤١ = ٦٠٦٥، ٦٠٦٧ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٠٣ = شیحا/٦٤٨٢ = مسلم/فؤاد/٢٥٦٣}:

لەپوختەی موسلیما ئاوەهایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دووربن لەگومانی خراپ، چونکە گومانی خراپ لەدرۆ درۆترەو وەك درۆی خراپ تاوانێکی گەلێ گەورەیە، هەستیش هەڵمەگرن بەنیازی خراپو بەشوێن نەنگو عەیبو کەموکووڕی خەڵکدا مەگەڕێنو، سیخوڕیو خەفیەیی مەکەنو، بەربەرەکانێو ڤینەبەری مەکەنو، بەخیلیو ئێرەیی بەیەکتری مەبەنو، کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشنو، پشت مەکەنە یەکتری، وە وەك برا تەبابنو پشتی یەکتری بگرنو، بەندەی باشی خودابن!!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٧٦٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٦٩، ژمارە: ١٥٦٧}.

١٥١٧- وَعَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اَللَّهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ، وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إِلَّا حَرَّمَ اَللَّهُ عَلَيْهِ اَلْجَنَّةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢١٠٧ = بوخاری/٧١٥١. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢١١ = شیحا/٣٦١ = مسلم/فؤاد/١٤٢}:

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: مەعقیلی کوڕی یەساری ئەلموزەنی، کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو، لەنەخۆشی سەرەمەرگا، عەبدوڵلای کوڕی زیاد، کە ئەو سەردەمە فەرمانڕەوای بەصرە بوو، چوو بۆلای بۆ سەرخۆشی لێکردنو هەواڵپرسینی.

مـەعقيل پێـی فـەرموو: گـوێ بگـرە فەرموودەیـەكی پێغەمبـەرت بـۆ بگێڕمەوە، كـە بـەگوێی خـۆم لێـیم بیـستووە، ئەگـەر بمزانیبایـە دەژیـم‌و لـەم نەخۆشـییە هەڵدەسـتمەوە بـۆم نەدەگێڕایتـەوە، فـەرمووی (دروودی خـودای لەسەر بێ): (هەر بەندەیێ، لەبەندەكانی خودا، خـودا بیكا بـە كاربەدەسـت‌و بیكا بە گەورەی كۆمەڵێ لە موسوڵمانان‌و گزی‌و ناپاكییان لێ بكاو، لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بـێ تـا دەمـرێ، ئـەوە بێگومـان كـە خـودای گـەورە لەسـەر ئـەو گزی‌و ناپاكییەی كە لەو ملەتەی دەكا بەهەشتی لێ قەدەغـە دەكا). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٢٤٣٢ + ریاض/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٤}.

١٥١٨- وَعَنْ عَائِشَةَ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها)) قَالَتْ: قَالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَللَّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا، فَشَقَّ عَلَيْـهِ، فَاشْـقُقْ عَلَيْـهِ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{موختەصەری صەحیحی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٠٨ = مـسلم/فـؤاد/١٨٢٨ = ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا/٤٦٩٩}:

له موختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:

عەبدوڕەحمانی كوڕی شوماسـە (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: چووم بۆ خزمەتی دایكە عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) هەتا پرسیاری شتێكی لێ بكەم، فەرمووی پێم: خەڵكی كوێیت؟ گوتم: پیاوێكی میصریم، فـەرمووی: لـەم غەزایـەتانا، فەرمانڕەواكـەتان چـۆن بـوو بۆتـان؟ عـەرزیمكرد: هـیچ گلەییەكمان لێی نییە، پیاوی وامان هەبوو پێویستی بەخەرجی بـوو خـەرجی دەدایە.

عائیشە فەرمووی: گەرچی ئەم فەرمانڕەوایەی ئێوە كەتۆ ئەم وەسـپە جوانـەی دەكـەی، كـاتی خـۆی خراپـەی دەربـارەی موحەممـەدی كـوڕی ئەبوبـەكری بـرام كـردووە، بـەڵام ئـەوە ڕێگـەی ئـەوەم لێ نـاگرێ، كـە ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەرت پـێ بڵـێم، كـە وەسـپی جـوانی ئـەم جـۆرە

فەرمانڕەوایانــە دەکـا، لـەم ماڵـەی خۆمـا، بـەگوێی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (ئەی خودایە! هەرکەسێ بوو بەکاربەدەستو سـەرەوکاری شـتێ لـە کاروبـاری گـەلی ئیـسلامی مـنو خـراپ بـوو بۆیـانو سـەخڵەتی کـردن، تـۆیش خراپبـە بـۆ ئـەوو سـەخڵەتی بکـە، هەرکەسـێ بـوو بەکاربەدەستو سەرەوکاری شتێ لە کاروبـاری گـەلی ئیـسلامی مـنو بـاش بـوو بۆیـانو دڵـی پێیـان سـووتا، تـۆیش ئـەی خودایـە! باشـبە بـۆیو دڵـت پێـی بـسووتێو میهـری لەگـەڵدا بنوێنـە!). {تـاج/٣ن زنجـیرە: ١٠٦، ژمـارە: ٢٤٣٦ + ریاض/٢/١٨٤، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٥}.

١٥١٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَتَجَنَّبِ اَلْوَجْهَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

لەپێـشەوە لـەژمارە (١٢٦٩)دا رابـورد. لێـرەدا سـەرەتاکەی لـەباتی (إذا ضَرَبَ أَحَدُكم...) ئاوایە: (إذا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ...)

واتە: لەکاتی شەڕو شۆڕدا لە دەموچاوی یەکتری مەدەن!

١٥٢٠- وَعَنْهُ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: { يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَوْصِنِي. فَقَالَ: لَا تَغْضَبْ، فَرَدَّدَ مِرَارًا. قَالَ: لَا تَغْضَبْ } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٤٩ = بوخاری/٦١١٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزیکرد: قوربـان! شـتێکی وام فێربکە، کە تێی بگەم، کە کەمو پوخت بێ، بەشکم لێی حاڵی ببم.

پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی پێـی: (تـووڕە مەبـە) پیاوەکـە چـەند جارێ ئـەم قسەیەی دووبـارە کـردەوەو پێـی دەگـوت: شتێکم فێربکە، بەڵام زۆرنـا، بـەڵکوو لێـی حـاڵی بـبمو کـاری پـێ بکـەمو ببـێ بەهۆی چوونە بەهەشتم؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر بەم وەڵامە وەڵامی دەدایەوەو دەیفەرموو پێی: (تووڕە مەبە). {ریاض/١، زنجیرە: ٣، لاپەڕە: ٦٦، ژمارە: ٤٩/٢٥}.

١٥٢١- وَعَنْ خَوْلَةَ اَلْأَنْصَارِيَّةِ ((رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها)) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِنَّ رِجَالاً يتخوَّضون فِي مَالِ اَللَّهِ بِغَيْرِ حَقّ، فَلَهُمْ اَلنَّارُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ } أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٦٤ = بوخاری/٣١١٨}:

خەولەی ئەنصارییە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (پیاو گەلێکی زۆر بەناڕەوا لرف لەماڵو سامانی خودا دەدەن، بەهەقو بەناهەق، ماڵی بەندەکانی خودا دەخۆن، یا زیانی سامانی یان لێ دەدەن!). {تاج/ }.

(ڕوونکردنەوە):

خەولەی کچی ثامیری ئەنصارییە، هاوەڵی پێغەمبەرە

١٥٢٢- وَعَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ- سُبْحَانه وتعالى - قَالَ: {يَا عِبَادِي! إِنِّي حَرَّمْتُ اَلظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلَا تَظَّالَمُوا} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، زنجیرە: ١٣٩٥، ژمارە: ١٨٢٨ = شیحا/٦٥١٧ = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/٢٥٧٧}:

ئەم فەرموودەیە زۆر درێژە لە (مختصر صحيح مسلم)دا ئەمە دەقی وەرگەڕاوە کوردییەکەیەتی:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا، خودای پیرۆزو گەورە دەفەرموێ: ئەی عەبدەکانم! ئەی بەندەکانم! من زوڵمو زۆرو ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردووە، لەناو ئێوەیشا حەرامم کردووە، کەواتە: ئێوەیش

ئـەی بەنـدە گـەل! زۆرو سـتەم لـە یـەكتری مەكـەن، ئـەی بەنـدەكانم! ئێـوە هەمووتان سەر لێشێواوو گومڕان، تەنیا ئەوانەتان نەبێ كەمن خۆم هیدایەتی بدەمو بیخەمە سەر ڕێگەی ڕاستو ڕێی هەقی پێ نیشان بدەم، كەوایـە داوای ڕێنموونیو ڕێنماییو هیدایـەت هـەر لـەخۆم بكـەنو بـەس، هـەتا ڕێنماییتـان بكـەم، ئـەی بەنـدەكانم! هـەمووتان ڕەشو رووتو برسـین، تـەنیا ئەوانـەتان نەبێ كەخۆم نانو ئاوو بەرگو پۆشاكی پـێ بـدەم، كەواتـە: داوای ئـەم شـتانە هەر لەخۆم بكەنو بەس، هەتا پێتانیان بدەم. ئەی بەندەكانم! ئێـوە بەشـەوو بەڕۆژ گونـاه دەكـەن، وەلحـالْ مـن لەدەسـتم دێ كـە لەهـەموو گوناهـێ خـۆش بـبم، كـەوابوو داوای لێخۆشـبوون هـەر لـەخۆم بكـەن، ئـەی بەنـدەكانم! ئێـوە ناگەنـە ئـەو ڕادەیـەو ڕادەتـە، كـەبتوانن زیانـێ، یـا سـوودێ، بـەمن بگەیـەنن، كەواتە: مەبەست لەم پەندو تەمێو ئامۆژە، سوود، یـا زیـانی ئێوەیـە، نـەوەك سوودو زیانی من، ئەی بەندەكانم! ئەگـەر ئێـوە لەیەكـەم كەسـتانەوە بیگـری، هـەتا دواكەسـتان، بـە ئـادەمیزادو پەریتانـەوە، بـە خـاسو خراپتانـەوە، یـەك بەیـەكتان، پیـاوی بـاشو لـەخوا ترسـترین كـەس بـن، وەك لـەخودا ترسـترین كەسـی ئێـستاتان، بـەوە هـیچ لـە سـامانو موڵكو گـەورەیی مـن زیـاد ناكـات، هـەروەها ئەگـەر لەیەكـەم كەسـتانەوە بیگـری هـەتا دواهـەمین كەسـتان، بـە ئـادەمیزادو پـەریو جنۆكەتانـەوە، بـەخاسو خراپتانـەوە، یـەك بەیـەكتان، پیاوی خـراپ بـن، وەك: لـەخودا دوورتـرینـی كەسـی ئێـستاتان، بـەوە هـیچ لـە سامانو موڵكو گەورەیی من كـەم نابێتـەوە، واتـە: بـوونو نـەبوونی ئێـوە بـۆ خوایەتیی من یەكسانەو چوون یەكەو جیاوازیی نییە بۆ من!

ئـەی بەنـدەكانم! ئەگـەر بێتـو لـە یەكـەم كەسـتانەوە هـەتا دواهـەمین كەستان، بە ئـادەمیزادو جنۆكـەو پەریتانـەوە، لەدەشـتێكا ڕابوەسـتنو لەیـەك كاتـا لەیـەك دەمو چركەسـاتا، هەركەسـەتان داوای شـتێكم لێ بكـا، وە لەیـەك هەناسەدا، هەركەسەتان دڵخوازی خۆیی پێ بدەم، بەوە هیچ لە گەنجینەی من

کەم نابێتەوە، چۆن دەرزییەك بژەنی بەئاوی دەریایەکا، هیچی لێ کەم ناکا ئاوا!!

ئەی بەندەکانم! هەرچی دێتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، من زۆر بەوردی سەرژمێریان دەکەمو ژمارەو چەندیو چونی‌یان رادەگرمو دوایی بە تەواوی پێتانی دەدەمەوە!

جا هەرچی هاتەوە ڕێگەتان کردەوەی خۆتانە، ئەگەر باش بوو، ئەوا سوپاسی خودای لەسەر بکەن، خۆ ئەگەر بەجۆرێکی تر بوو، ئەوا سەرزەنشتی خۆتان بکەنو بەس، کە ئەوکارە بەدەتان لەوەپێش لەکاتی خۆیدا کردووە).

سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز، کە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، لە رەبیعەی کوڕی یەزیدەوە، لەئەبو ئیدریسی خەولانی‌یەوە، لە ئەبو زەڕەوە، لە پێغەمبەرەوە، ئەم سەعیدە دەیفەرموو:

(هەموو جارێ کە ئەبو ئیدریسی خەولانی، ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە، دەهات بەچۆکاو لەوکاتەدا زۆر بەڕێزەوە لەسەر چۆك دادەنیشتو دەیگێڕایەوە بۆ شاگردەکانی!). {ریاضی صالحين/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١١١ ج/٣ + تاج/٥، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٥١٣٤م. چاپی چوارەم}.

١٥٢٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: {أَتَدْرُونَ مَا اَلْغِيبَةُ؟ قَالُوا: اَللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ. قِيلَ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ اِغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٠٦ = شيحا/٦٥٣٦ = ترقيم محمد فؤاد/٢٥٨٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێو سەرو ماڵو منداڵو رۆحو گیانو هەستو نەست هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو صەلاتو سەلامو دروودو رەحمەتی

خـوداى گـەورەو مـەزنى لەسـەر بـێ) فـەرمووى: (ئـەرێ ئێـوە دەزانـن کـە غەيبـەتو پاشملـە گوێى چييە؟). گوتيـان: خـوداو پێغەمبـەرى خـودا باشـى دەزانـن. فـەرمووى: (ئەوەيـە کـە باسـى بـراى ئايينيـت بـەجۆرێکى وا بکـەى کەخۆى باسکردنى ئەو شتەى، بەو شێوەيە پێ ناخۆش بـێ). عـەرزيکرا: ئـەى ئەگەر ئەو قسەيەى کەمن دەيکـەم، لەبراکـەما هـەبوو ئـەوە چۆنە؟ ئـەوەيش هەر غەيبەتو پاشملە گۆيى نادروستە؟. فەرمووى: (غەيبەت ئەوەيە کـە ئـەو نەنگەى کـەتۆ دەيلێيت لـە پاشملـە لەغەيبەتکراوەکـەدا هـەبێت، دەنـا ئەگـەر تيـادا نـەبێ ئـەوە رێـك بوختـانى بـۆ دەکـەى!). {تـاج/٥، زنجـيرە: ١٣، ژمـارە: ٤٧٥٣}.

١٥٢٤- وَعَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم): { لَـا تَحَاسَدُوا وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَلَا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْـضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اَللَّهِ إِخْوَانًا، اَلْمُسْلِمُ أَخُو اَلْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، وَلَـا يَحْقِـرُهُ، اَلتَّقْوَى هَا هُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ، بِحَسْبِ اِمْـرِئٍ مِـنْ اَلـشَّرِّ أَنْ يَحْقِـرَ أَخَاهُ اَلْمُسْلِمَ، كُلُّ اَلْمُسْلِمِ عَلَى اَلْمُسْلِمِ حَرَامٌ، دَمُـهُ، وَمَالُـهُ، وَعِرْضُـهُ } أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صـحيح مـسلم/٥، ژمـارە: ١٨٠٠، ١٨٠١، ١٨٠٣ + تەجريـدى بوخارى بەکوردى/٥، ژمارە: ١٩٤١، ١٩٤٢}:

ئەبو هـورەيرە (رەزاى خـوداى لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (رقو کينەو دەغەز لەيەکترى مەکێشنو زەمـى درۆ بەسـەر يەکتريـەوە مەکـەنو، پـشت مەکەنـە يـەکترىو لەيـەکترى لووتـەلا مەبنو، کڕيار لەيەکترى هەڵمەگێڕنەوەو ناهەقىو ناڕەوايى لەيەکترى مەکەن، وەك دووبراى تەبا لـەناو خۆتانـا بـاشو تـەبابنو هـەموو وەك يـەك: کۆمـەڵێ بەنـدەى پێکەوە ئاشتو پێکەوە سازاوى باشى خودابن!

موسـولْمان بـراى موسـولْمانه، نابـێ سـتەمو ناهـەقى لىٚ بكـا، نابـێ دەستەشكێنى بكا، ونابێ بەچاوى سووك تەماشاى بكا).

پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) سىٚجار ئاماژەى بۆ دڵى خۆى كردو دەستى برد بۆ سينگىو فەرمووى: (لەخوا ترسىو تەقوا وا لێرەدا لـەناو دڵدا) ئەوجا فەرمووى: (مرۆڤ لەشەڕ ئەوەنـدەى بەسـە: كـەبراى موسـولْمانى خۆى بەكەم بزانىو بەچاوى سووك تەماشـاى بكـا، هـەموو شـتێكى موسـولْمان لـە موسـولْمانى تـر قەدەغـەو حەرامـە: خـوێنى پێـى حەرامـە كـە بەناهـەق بيرێژێ، ماڵى پێى حەرامـە كـە بـەناڕەوا بيخوا، نامووسى پێـى حەرامـە، كـە بەناڕەوا نامووسى ببا). {رياضى صالحين/٤، زنجيرە: ٢٧١، ژمـارە: ١٥٧٠. تـاج/٥، زنجيرە: ١٦، ژمارە: ٤٧٦٤ + رياض/٤، زنجيرە: ٢٦٩، ژمارە: ١٥٦٧}.

١٥٢٥- وَعَنْ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {اَللَّهُمَّ جَنِّبْنِي مُنْكَرَاتِ اَلْأَخْلَاقِ، وَالْأَعْمَالِ، وَالْأَهْوَاءِ، وَالْأَدْوَاءِ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ وَاللَّفْظِ لَهُ.

{صحيح الجامع/١٢٩٨. الصحيح المسند/١٠٨٤}:

قوطبـەى كـوڕى ماليـك (ڕەزاى خـوداى لىٚ بـێ) فـەرمووى: دەسـتوورى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بـێ) وابـوو، زۆرجـاران دەيفـەرموو: (اَللَّهُمَّ جَنِّبْنِي مُنْكَرَاتِ اَلْأَخْلَاقِ، وَالْأَعْمَالِ، وَالْأَهْوَاءِ، وَالْأَدْوَاءِ - ئەى خوايـە! لەڕەوشـتى بەدو لە كردەوەى خراپو لە ئارەزوو بازىو لە نەخۆشـى خراپـى، وەك گـولىو گەڕى، بمپارێزەو بەدوورم بگرە لەم جۆرە شتە خراپانە). {تاج/٥، زنجيرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٧٧}.

(ڕوونكردنەوە):

قـوطبـەى كـوڕى مـاليكى ئـەعلـەبى، هـاوەڵى پێغەمبـەرە، لەبـەنى ئەعلەبەيە، خەڵكى كووفەيە.

١٥٢٦- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا تُمَارِ أَخَاكَ، وَلَا تُمَازِحْهُ، وَلَا تَعِدْهُ مَوْعِدًا فَتُخْلِفَهُ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ بِسَنَدٍ فِيهِ ضَعْفٌ.

{ضعيف الجامع/٦٢٧٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەمە دەمێ لەگەڵ برای ئایینی خۆت مەکە، گاڵتەو سوعبەتی زۆری لەگەڵ مەکە، بەڵێنێکی وای پێ مەدە، کە دوایی جێبەجێی نەکەی).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: تەرمەزی بەڕشتەیەکی بێ هێز دەریهێناوە. {تاج/٥، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ٤٨١٢}.

١٥٢٧- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { خَصْلَتَانِ لَا يَجْتَمِعَانِ فِي مُؤْمِنٍ: اَلْبُخْلُ، وَسُوءُ اَلْخُلُقِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَفِي سَنَدِهِ ضَعْفٌ.

{ضعيف الجامع/٢٨٣٣}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (دوو ڕەوشت هەن، بەیەکەوە لە موسوڵمانا، کۆنابنەوە: ڕەزیلیو چرووکیو بەدخوویی!).

١٥٢٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ: {اَلْمُسْتَبَّانِ مَا قَالَا، فَعَلَى اَلْبَادِئِ، مَا لَمْ يَعْتَدِ اَلْمَظْلُومُ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨١٢ = شیحا/٦٥٣٤ = تەرقیمی محمد فؤاد/٢٥٨٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گوناهی شەڕەجمێن، کە لەنێوانی دوو کەسدا روو دەدا، هەرچی دەڵێن: گوناهەکەی بەملی ئەوەیانە کە لەپێشەوە جمێنەکە

دەست پێ دەکا، بەمەرجێ ناهەقی لێکراوە کە پێی لێ هەڵ نەبڕێو پتر لەمافی خۆی جوێنی پێ نەدات). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٦٦، ژمارە: ١٥٦١}.

١٥٢٩- وَعَنْ أَبِي صِرْمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { مَنْ ضَارَّ مُسْلِمًا ضَارَّهُ اَللَّهُ، وَمَنْ شَاقَّ مُسْلِمًا شَقَّ اَللَّهُ عَلَيْهِ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{حَسَنٌ. صحيح الجامع/٦٣٧٢}:

ئەبو صیرمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی زیانبەخشە بۆ موسوڵمانان، خودا زیانی لێ بدا، ئەوەی کە زەبرو زەنگ دەنوێنێو ئازاری موسوڵمانان دەدا، خودا پێی بنوێنێ!). {تاجول ئوصول/٥، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٧٤٢ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

لەناوی ئەبو صیرمەدا ڕاجیایی هەیە هەندێ دەڵێن:

ئەبو صیرمە ناوی: مالیکی کوڕی قەیسە، هەندێ تر دەڵێن: ناوی: لبابەی کوڕی قەیسە، هەندێ تریش دەڵێن: ناوی قەیسی کوڕی مالیکی کوڕی ئەبو ئەنەسە.

ئەبو صیرمە ئەنصارییە، بە کەسناو (بەکونیە)ەکەی ناسراوە، ئامادەی جەنگی بەدرو نەبەردەکانی پاشی بووە، لەشاگردەکانی کە گێڕانەوەیان لێیەوە ئەنجام داوە: محەمەدی کوڕی کەعبی قورەظیو موحەمەدی کوڕی قەیسو ئیبنو محبریزە.

١٥٣٠- وَعَنْ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { إِنَّ اَللَّهَ يُبْغِضُ اَلْفَاحِشَ اَلْبَذِيءَ}. أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ.

{صحيح الجامع/٥٦٣٢}:

ئـەبو دەرداء (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (خـودای گـەورە رقـی لـە مرۆڤـی هـەرزەگۆو مرۆڤی زمانپیسە).

١٥٣١- وَلَهُ مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ مَسْعُودٍ رَفَعَهُ: {لَيْسَ اَلْمُـؤْمِنُ بِالطَّعَّـانِ، وَلَـا اَللَّعَّانُ، وَلَا اَلْفَاحِشَ، وَلَا اَلْبَذِيءَ} وَحَسَّنَهُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَـاكِمُ، وَرَجَّـحَ اَلـدَّارَقُطْنِيُّ وَقْفَهُ.

{صحيح الجامع/٥٣٨١}:

ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (بـۆ موسـوڵمان ناشـێ کـە توانجـدەرو نەفرینکـەرو هەرزەگۆو زمانپیس بێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٨٠٠ ج/٤}.

١٥٣٢- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا تَسُبُّوا اَلْأَمْوَاتَ " فَـإِنَّهُمْ قَـدْ أَفْـضَوْا إِلَـى مَـا قَـدَّمُوا } أَخْرَجَـهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریـــدی بوخـــاری بـــەکوردی بـــەرگی دووەم، ژمـــارە: ٦٦٥ = بوخاری/٦٥١٦}:

عائیـــشە (رەزای خـــودای لێ بـــێ) فـــەرمووی: خۆشەویـــست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (جمـین بـەمردوو مـەدەن، چونکە مـردوو روو بەروو بۆتەوە لەگەڵ کردەوەی لەوەپێشی خـۆی، کـە لـەجیهانا کردوویـەتی، چ چاك، چ خراپ، وە بەپێی ئەو کـردەوە پێـشینەی پاداشـی خـۆی وەردەگـرێ!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٧، ژمارە: ١٠٨٢}.

١٥٣٣- وَعَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا يَدْخُلُ اَلْجَنَّةَ قَتَّاتٌ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٣٩ = بوخاری/٦٠٥٦ + موختەصەری صەحیحی موسلیم/١٨٠٨ = شیحا/٢٨٧ = ترقیم محمد فؤاد عبدالباقي/١٠٥. ترمذی. برّوصلة/٢٠٢٦. تحفة الأشراف/٣٣٨٦}:

**لە موختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:**

**هەممامی کوڕی حاریث (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەلای حوزەیفە، لە مزگەوت دانیشتبووین، پیاوێ لەولاوە هاتو ئەویش لەگەڵمانا دانیشت، عەرزی حوزەیفە کرا: کە ئەم پیاوە قسەو باس دەباتەوە بۆ دەستەڵاتداری وڵات، کە ئەوسەردەمە ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان بوو (ڕەزای خودای لێ بێ) حوزەیفەیش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی بەکابرا: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (مرۆڤی دوو زمان دوو پێی ناچێتە ناو بەهەشت!). {تاج/٥، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٧٤٨ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٧، ژمارە: ١٥٣٨}.**

١٥٣٤- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { مَنْ كَفَّ غَضَبَهُ، كَفَّ اَللَّهُ عَنْهُ عَذَابَهُ } أَخْرَجَهُ اَلطَّبَرَانِيُّ فِي" اَلْأَوْسَطِ".

{حسن، السلسلة الصحيحة/٢٣٦٠}:

**ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ڕقی خۆی بخواتەوە، خودا سزای خۆی لەو دوور دەخاتەوە).**

١٥٣٥- وَلَهُ شَاهِدٌ: مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عُمَرَ عِنْدَ اِبْنِ أَبِي اَلدُّنْيَا.

**ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لە (پەڕاوی - کتاب الصمت وآداب اللسان - دانراوی ابن أبی الدنیا):**

**ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ زمانی خۆی بگرێ خودا بە میهرەبانی خۆی ناموس‌و شەرمگای دەپۆشێ، وە هەرکەسێ ڕقی خۆی**

زەوت بكا، خودا لەسزای خۆی دەیپارێزێ، كەسێ عوزرخوایی بكا بۆ خودا، خودا عوزری لێ قەبووڵ دەكا).

١٥٣٦- وَعَنْ أَبِي بَكْرٍ اَلصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا يَدْخُلُ اَلْجَنَّةَ خِبٌّ، وَلَا بَخِيلٌ، وَلَا سَيِّئُ اَلْمَلَكَةِ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَفَرَّقَهُ حَدِيثَيْنِ، وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ.

{ضعيف الترغيب والترهيب/١١٨٨}:

ئەبوبەكری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئاژاوەچی ناچێتە بەهەشت، هەروا ڕەزیلی پیسكە، هەروا كەسێ خراپ بێ لەگەڵ كۆیلەی خۆی).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: تەرمەزی دەریهێناوە وە كردوویەتی بەدوو فەرموودە، لە ڕشتەكەیدا بێ هێزی هەیە.

١٥٣٧- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ تَسَمَّعَ حَدِيثَ قَوْمٍ، وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، صُبَّ فِي أُذُنَيْهِ اَلْآنُكُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ } يَعْنِي: اَلرَّصَاصَ. أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٨٩ = بوخاری/٧٠٤٢}:

لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوكی بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ لەخۆیەوە، خەونێ بەدرۆ هەڵبەستێ، لەڕۆژی قیامەتدا جەختی لێ دەكرێ كە دوو دەنكە جۆی ئاگرین پێكەوە گرێ بدا، ئەویش هەرگیز ئەوەی بۆ ناكرێ، واتەی وایە: كە بەردەوام هەر لەو سزاو ئەشكەنجەیەدا دەبێ، هەركەسەیش گوێ لەقسەی هۆزێ، یا كۆمەڵێ، بگرێ، كە ئەوان ئەو گوێگرتنەی ئەویان پێ ناخۆش بێ، یا ئەوان خۆیانی لێ دوور بخەنەوە، هەتا گوێی لەقسەیان نەبێ، كەچی ئەویش هەربچێتە پێشەوەو گوێیان لێ بگرێ، ئەوە لەڕۆژی قیامەتا، لەتوڵەی ئەو

تاوانـەدا، قوڕقـوشمی سـوورەوەکراوی تـواوە دەکرێتـە نـاو هـەردوو کونـە گوێچکەیەوە، هەرکەسێکیش وێنەیێ بکێشێ، ئەوە ئازارو سزا دەدرێو بـەزۆر داوای لێ دەکرێ، کە دەبێ گیان بکا بە بەریدا، دیارە کـە ئەوەیشی بۆنـاکرێ).
{تاج/٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٤٢٤٨}.

١٥٣٨- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { طُوبَى لِمَنْ شَغَلَهُ عَيْبُهُ عَنْ عُيُوبِ اَلنَّاسِ} أَخْرَجَهُ اَلْبَزَّارُ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.
{ضعيفٌ جداً، ضعيف الجامعِ/٣٦٤٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆشیو سەرفرازیو درەختـی طوبـا لە بەهەشتا بۆ ئەو کەسە، کە لەبەر نەنگو عـەیبی خۆی، نەیپەرژێتـە سـەر نەنگو عەیبی خەڵکی ترا!).

١٥٣٩- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ تَعَاظَمَ فِي نَفْسِهِ، وَاخْتَالَ فِي مِشْيَتِهِ، لَقِـيَ اَللَّـهَ وَهُـوَ عَلَيْـهِ غَضْبَانُ } أَخْرَجَهُ اَلْحَاكِمُ وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.
{صحيح الجامع/٦١٥٧. الصحيح المسند/٧١٨}:

ئیبنـو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (هەرکەسـێ خـۆی بـەزل بزانـێ، لـە رۆیـشتنا بـە کشو فشو دەعیـەوە بـڕوا، لـەرۆژی قیامـەتا، کاتـێ دەچێتەوە دیوانی خودا، خودا تووڕەیێ لێیو رقی لێگرتووە).

١٥٤٠- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَلْعَجَلَةُ مِنَ اَلشَّيْطَانِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَقَالَ: حَسَنٌ.
{حَسَنٌ، صحيح الجامع/٣٠١١ رِوَاية أَنس}:

سەهلی کوڕی سـەعد (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پەلەکردن لە شەیتانەوەیە!).

١٥٤١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): قَالَ: {اَلشُّؤْمُ: سُوءُ اَلْخُلُقِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ.

{ضعيف الامع/٣٤٢٦}:

عائیشه (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەد فووِمی برێتییە لە خوو بەدیی).

١٥٤٢- وَعَنْ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِنَّ اَللَّعَّانِينَ لَا يَكُونُونَ شُفَعَاءَ، وَلَا شُهَدَاءَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{موختەصەری صـەحیحی موسـلیم/٥، ژمـارە: ١٨٢١ = شـیحا/٦٥٥٣ = ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/٢٥٩٨}:

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (لـەڕۆژی دواڕۆژدا، نەفرینکـەران نـە پایـەی تکاکاران‌و نە پایەی شەهیدانیان پێ نادرێ!). {ریـاض/٤، زنجیـرە: ٢٦٤، ژمـارە: ١٥٥٤}.

١٥٤٣- وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ عَيَّرَ أَخَاهُ بِذَنْبٍ، لَمْ يَمُتْ حَتَّى يَعْمَلَهُ } أَخْرَجَـهُ اَلتِّرْمِـذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَسَنَدُهُ مُنْقَطِعٌ.

{مَوْضُوعٌ، ضعيف الجَامِعِ/٥٧١٠}:

موعازی کوڕی جەبەل (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (هەرکەسـێ تانـەی ئـەوە لەبرایـەکی ئایینی خۆی بدا کـە ئـەو گوناهـەی کـردووە، خـۆی نـامرێ هـەتا تووشـی ئـەو گوناهە نەبێ!).

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: تەرمەزی دەریهێناوەو بـە فەرموودەیـەکی جـوان (حەسـەن)ی دانـاوە، بـەڵام رشـتەکەی پـچڕاوە، واتـە:

مونقەطیعە. ئەلبانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە پەڕاوی (صحيح وضعيف الجامع)دا، بە موضوعی داناوەو بە فەرموودەیەکی دەستهەڵبەستی داناوە.

١٥٤٤- وَعَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ، فَيَكْذِبُ " لِيَضْحَكَ بِهِ اَلْقَوْمُ، وَيْلٌ لَهُ، ثُمَّ وَيْلٌ لَهُ} أَخْرَجَهُ اَلثَّلَاثَةُ، وَإِسْنَادُهُ قَوِيٌّ.

{أحمد رقم/٢٠٠٥٨. أبو داود. رقم/٤٩٩٠. ترمذى. رقم/٢٣١٥. حسنٌ، صحيح الجامع/٧١٣٦}:

بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکیەوە، لە باپیریەوە (رەزای خودایان لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خانە خراپیو ماڵ وێرانی بۆ ئەو جۆرە کەسانە، کە دەچن بەقسەو قسەڵۆكو درۆو دەلەسە خەڵك دەهێننە پێکەنین، دووبارەو سێ بارە چارە رەشی بۆ ئەم جۆرە خانە خراپانە!).

(ڕوونکردنەوە):

شانۆگەریو نمایشکردنو چیرۆك نووسینو داستان دانانو ئەم جۆرە شتە ئەدەبییانە، کەبۆ مەبەستێکی رەوای ئایینی، یان کۆمەڵایەتی بنو بە نیازێکی پاك بنو بەنیازی پیس نەبنو لە جەغزی هونەری بەرزو بەها باڵاکان دەرنەچن، ئەوە دروستنو زانا گەورەکان بەڕەوایان دادەنێن، جا ئەگەر رستەو دەربڕینو گوتاری وەهایش بەکاربهێنن، کە دروستکراو بنو راستەقینە نەبن، وە جارو باریشو کەمە کەمە، بە نوکتەی خۆشو بە رەخنەی گاڵتە ئامێز، گوێگرانو بینەرانو بیسەران بهێننە پێکەنین، ئەوە ئەو جۆرە کارە هونەرییە جوانە، بەر هەڕەشەی ئەم فەرموودەیە ناکەوێ، چونکە کۆمەڵێ دەق لە قورئانو لە فەرموودەی دروستدا هەیە، کە شتی وایان تیادایە لە سوننەتدا وەك داستانی ئوم زەرع، کە لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمدا هاتووە. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٧٣ =

بوخاری/٥١٨٩، هەتا کۆتای راڤە کوردییەکەی، هەروا بڕوانە: موختەصەری صەحیحی موسلیم/٤، ژمارە: ١٦٦٩} . هەروا لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە:

{أَنَّ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ اسْمُهُ عَبْدَ اللَّهِ ، وَكَانَ يُلَقَّبُ حِمَارًا ، وَكَانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)... الحديث = تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٦٧ = بوخاری/٦٧٨٠. ئەمەیش دەقی کوردییەکەی ئەم فەرموودەیە:

عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ هەبوو ناوی عەبدوڵلا بوو، پێیان دەگوت حیمار (واتە: گوێدرێژ = کەر) جاروبار بەقسەی خۆش، یا بە نوکتەیێ پێغەمبەری دەهێنایە پێکەنین، گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر مەیخواردنەوە، فەرمانی دەدا قەمچیکاریی دەکرا، واتە: داری حەددی مەینۆشی لێ دەدا، رۆژێ بەو حاڵە هێنابوویان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو، دارکارییان کرد. هەندێ کەس گوتیان: نەفرەتی خودای لێ بێ، چەندە بەزۆری لەسەر ئەم حاڵە دەیهێنن!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەفرین (لەعنەت)ی لێ مەکەن، دەسا بەخودا من ئاگام لێیەتی کە خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ، ئەوەیش واتای وایە کە باوەڕی بەخوداو بە پێغەمبەر هەیە، دەی لەعنەتو نەفرینکردن لە باوەڕدار دروست نییە).

بەڵام بێگومان زۆرینەی فلیمو شانۆو نمایشو چیرۆکە دانراوەکان، کە لەم سەردەمەدا باون، لەمپەری شەرمو شکۆو باوە کۆمەڵایەتییە جوانەکانیان بەزاندووەو جۆرێکن لە کامی کامی نێرو مێییو کۆمەڵەی مرۆڤ بەرەو بەر بەرەڵاییو رووتیو قووتیو ئازادی سێکسیو مرۆڤ بە ئاژەڵکردن دەبەن، جاری واهەیە کابرایەکی هەڵەوەڕی موهەرڕیج، دوو سەعات، یا سێ سەعات، جەماوەرە هەڵخەڵەتاوەکەی لە قاقای پێکەنینو فیکە فیكو جیکە جیکدا

نـوقم دەكـاو بـەدەمو بەدەسـتو بـەقاچ، بـەدەم مەسـتىو سەرخۆشـييەوە چـەپڵەى بـۆ لێـدەدەن. بێگومـان شـتى وا بێڕێزييـە بـەهۆش، بـە ويـژدان، بـە رەفتارى بەرز، بە كۆمەڵايەتى، بە مرۆڤايەتى، خوا پەنامان بدات.

١٥٤٥– وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: {كَفَّارَةُ مَنْ اِغْتَبْتَهُ أَنْ تَسْتَغْفِرَ لَهُ} رَوَاهُ اَلْحَارِثُ بْنُ أَبِي أُسَامَةَ بِسَنَدٍ ضَعِيفٍ.

{مَوْضُوعٌ، ضعيف الجامع/٤١٩٠}:

ئەنەس (رەزاى خوداى لێ بێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: (دروودى خوداى لەسەر بێ): (ئەگەر غەيبەتى كەسێكت كرد، كەفارەتەكەى ئەوەيە كە داواى لێخۆشبوونى لەخودا بۆ بكەى).

(روونكردنەوە):

وەك دانــەر دەفــەرموێ: ئــەم فەرموودەيــە لاوازو بــێ هێــزە، شــێخى ئــەلبانيش (رەحمــەتى خــوداى لێ بــێ) لەپــەڕاوى (صــحيح وضــعيف الجامع/٤١٩٠)دا بە مەوضوعو دانـراوى دانـاوە، بـەڵام لەگـەڵ ئەمـەيش چـارەى ئەم بابەتە بەم شێوەيە:

١- پاشملەگۆ داوا لە غەيبەتكراو بكا كە گەردنى ئازاد بكا.

٢- هەميشە بە باشە ناوى ئەو برادەرەى بهێنێ كە غەيبـەتى كـردووە، تا غەيبەتەكەى بسڕێتەوە.

٣- دوعاى خێرى بۆ بكاو لـەخودا داواى تاوانپۆشـى بـۆ بكـا، هـەتا بـەر ئەم ئايەتە بكەوێ {إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ – هود/١١٤}: چاكە خراپە دەسڕێتەوە).

١٥٤٦– وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { أَبْغَضُ اَلرِّجَالِ إِلَى اَللَّهِ اَلْأَلَدُّ اَلْخَصِمُ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٥٢ = صحيح مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا/٦٧٢٢ = مسلم/٢٦٦٨ + تەجريدى بوخارى/٣، ژمارە: ١٠٦٦ =

بوخـــاری/٢٤٥٧، ٣٥٢٣، ٤٥٢٣، ٧١٨٨. ترمـــذی. تفـــسير/٢٩٧٦. نـــسائی. آداب والقضاء/٥٤٣٨. تحفة الأشراف/١٦٢٤٨}:

دایکی برواداران خاتوو عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەسەر هەموو هاوەڵو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە لەهەموو کەسێ زیاتر رقی لەپیاوی شەڕانی شەڕ فرۆشی رق ئەستووری رەزا قورسی رەزا گرانە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٢، ژمارە: ٢٤٩٤}.

## لیستی ناوی ئەو هاوەڵ و ئەو کەسانەی کە بۆ یەکەمجار ناویان هاتووە لەم کتێبەدا، لەسەرەتای کتێبەکەوە هەتا کۆتایی کتێبەکە

| ژمارە | ناوی خاوەن ژیانامە | ژمارەی فەرموودە |
|---|---|---|
| ١ | ئەبوهورەیرە | ١ |
| ٢ | ئەبو سەعیدی خودری | ٢ |
| ٣ | ئەبو ئومامەی باهیلی | ٤ |
| ٤ | ئیبنو عومەر | ٥ |
| ٥ | ئیبنو عەبباس | ١٠ |
| ٦ | ئەبو قەتادە | ١٣ |
| ٧ | ئەنەسی کوڕی مالیك (خادِمُ الرَّسول) | ١٤ |
| ٨ | ئەبو واقیدی - لەیثی | ١٧ |
| ٩ | حوذەیفەی کوڕی یەمان | ١٨ |
| ١٠ | ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر | ١٩ |
| ١١ | سەلەمەی کوڕی المحبّق | ٢٣ |
| ١٢ | مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر | ٢٣ |
| ١٣ | ئەبو ئەعلەبەی ئەل - خوشەنی | ٢٤ |
| ١٤ | عیمرانی کوڕی حوصەین | ٢٥ |
| ١٥ | عەمری کوڕی خاریجە | ٢٨ |
| ١٦ | عائیشەی کچی ئەبو بەکری صەدیق | ٣٠ |
| ١٧ | ئەبو ئەل – سەمح (إياد) | ٣٣ |
| ١٨ | ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صەدیق | ٣٤ |
| ١٩ | خەولەی کچی یەسار | ٣٥ |

## ٩٧- باسی هاندانو شیرەکردن لەسەر رەفتارە نازدارەکان
## بَابُ: اَلتَّرْغِيبِ فِي مَكَارِمِ اَلْأَخْلَاقِ

{بڕوانە: التاج الجامع لِلأصُولِ فِي أحاديث الرسول = تاج بەکوردی/٥، زنجیرە: ٢٨ و ٢٩، لە ژمارە: ٤٨٣٣وە هەتا ژمارە: ٤٩٣٨ + تەجریدی بوخاری/٥، لەژمارە: ١٩٣٤وە هەتا ژمارە: ١٩٦٣ + ریاضی صالحین/٢، زنجیرە: ٧٣، لە ژمارە: ٦٢١وە هەتا ژمارە: ٦٥٢}.

١٥٤٧- عَنِ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ اَلصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى اَلْبِرِّ، وَإِنَّ اَلْبِرَّ يَهْدِي إِلَى

اَلْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ اَلرَّجُلُ يَصْدُقُ، وَيَتَحَرَّى اَلصِّدْقَ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اَللَّهِ صِدِّيقًا، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ اَلْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى اَلْفُجُورِ، وَإِنَّ اَلْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى اَلنَّارِ، وَمَا يَزَالُ اَلرَّجُلُ يَكْذِبُ، وَيَتَحَرَّى اَلْكَذِبَ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اَللَّهِ كَذَّابًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٤٦ = بوخاری/٦٠٩٤. مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٨٠٩ = ٦٥٨١ شيحا = مسلم/٢٦٠٧}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێو سەرو ماڵو منداڵو باوکو دایکو ڕۆحو گیانو هەستو نەست، هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو صەلاتو سەلامو درودو ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانی خودای گەورەو سەروەرو مەزنی لەسەر بێ) دەفەرموێ:

(لەڕاستی ڕەحمەت دەبارێ، ڕاستی بکەن بە پیشەی هەمیشە، چونکە ڕاستی ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی بەهەشت! پیاوی واهەیە ئەوەندە ڕاستگۆیەو ئەوەندە ڕاستگۆیەو ئەوەندە سۆراخی ڕاستی دەکاو ئەوەندە عەوداڵی ڕاستیو ڕاستگۆییە هەتا لەلای خودا بە پیاوی ڕاستو ڕاستاڵو ڕاستگۆ دەنووسرێ، وە نەکەن درۆ بکەن، چونکە درۆ مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگەی خراپە، کردەوەی خراپەیش پیاو دەخاتە سەر ڕێگەی ئاگری دۆزەخ، پیاوی وا هەیە ئەوەندە زۆر درۆ دەکاو ئەوەندە منەیی درۆ دەکا، هەتا لەلای خودا بەدرۆزن دەنووسرێ!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٧، ژمارە: ١٥٣٨ + پوختەی موسلیم/٥، ژمارە: ١٨٠٩ + ریاض/١، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٥٤ + تاج/٥، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٧٥١}.

١٥٤٨ – وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ اَلظَّنَّ أَكْذَبُ اَلْحَدِيثِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

ئەم ژمارەیە دەقی ژمارە (١٥١٦)یە کە لەپێشەوە لەم بەرگەدا رابورد.

١٥٤٩- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ بِالطُّرُقَاتِ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا" نَتَحَدَّثُ فِيهَا. قَالَ" فَأَمَّا إِذَا أَبَيْتُمْ، فَأَعْطُوا اَلطَّرِيقَ حَقَّهُ. قَالُوا: وَمَا حَقُّهُ؟ قَالَ:" غَضُّ اَلْبَصَرِ، وَكَفُّ اَلْأَذَى، وَرَدُّ اَلسَّلَامِ، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيُ عَنْ اَلْمُنْكَرِ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١٠٧٠ = بوخاری/٢٤٦٥، ٦٢٢٩. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤١٩ = شیحا/٥٦١٣ مسلم/٢١٢١}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەکەن لەسەرە ڕێگە دابنیشن!). عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چارمان نییە، نیشتنگەو جێ دانیشتنی ترمان نییە، ئەی لەکوێی تر دوو قسەو گفتوگۆ بۆ خۆمان بکەین!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کە وای لێ هات! کەوابوو مافی ڕێگەوبان بەجێ بهێنن). گوتیان: قوربان! پێمان بفەرموو کەمافی ڕێگەوبان چییە؟

فەرمووی: (چاوی خۆتان لە تەماشای ناڕەوا بگرن‌و، ئازاری کەس مەدەن‌و مەبن بە باری ئازار بۆ هاتوچۆکاران، لەهەمان کاتا وەڵامی سڵاو بدەنەوەو فەرمان بەچاکە بکەن‌و، جڵەوگیریی لەخراپەو کاری ناشایستە بکەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ٥٣٦١ چ/٤}.

١٥٥٠- وَعَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ يُرِدِ اَللَّهُ بِهِ خَيْرًا، يُفَقِّهْهُ فِي اَلدِّينِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٦٣ = بوخاری/٧١، ٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠. مسلم. شیحا/٤٩٣٣، ٢٣٨٦}:

لە تەجریدا ئاوایە:

موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ کەخودا بیەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا، شارەزای ئایینی دەکا، من تەنیا ئەوەندەم بەدەستە کە ئەم فەرمایشتو شەریعەتە دابەش بکەمو بەس، بەڵام بەشی گەورە یا بچووك، ئەوە بەدەست خودای گەورە خۆیەتیو خودا خۆی ئەو بڕیارە دەدا، وەئەم ئۆمەتی ئیسلامەیش هەر بەردەوام دەبن لەسەر ئەم ئایینی خودایە هەتا نزیکی رۆژی قیامەت، ئەوەی کە لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ!).

١٥٥١- وَعَنْ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَا مِنْ شَيْءٍ فِي اَلْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ اَلْخُلُقِ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{صحيح الجامع/ ٥٧٢١. الصحيح المسند/١٠٣٧}:

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە تەرازووی خێرو شەڕی بەندەدا، کە لەرۆژی ژیانەوەدا دائەنرێ بۆ کێشانی کردەوەکانی، هیچ کردەوەیەکی باشی بەندە وەك رەوشتی جوان قورسو گران نییە!).

(روونکردنەوە):

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) ناوی عوومەیرە، لە هاوەڵانی پێغەمبەرە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، لەپیاوانی صەحیحەینە، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، ئەبو دەرداء لەرۆژی غەزای بەدردا ئیسلام بووە، لەچاو خزمانی خۆیدا کەمێ درەنگ موسوڵمان بوو، بەڵام موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، لەگەڵ ئەوەدا پیاوێکی شەرعزانی هۆشیاری داناو زانا بوو، دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

لە پەسن‌و وەسپی جوانی ئەبو دەرداءدا فەرموویەتی: (ئەبو دەرداء داناو هۆشمەندی نەتەوەی ئیسلامی منە!).

ئامادەی جەنگی ئوحود بووە، نەبەردێکی جوانی نواندووە لەم جەنگەدا، ئامادەی هەموو جەنگ‌و غەزاکانی پاش غەزای ئوحود بووە، دووژنی هەبووە، هەردوو ژنەکەی ناسراون بە ئوم دەرداء، گەورەکەیان صەحابە بووە، ئوم دەردای بچکۆلە نابیعی بووە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی موسوڵمانانەدا، برایەتی بەست لەنێوانی ئەبو دەرداءو سەلمانی فارسیدا، مەسرووق دەفەرموێ: (روو بەروو گەڵێ گفتوگۆم لەگەڵ هاوەڵانی موحەممەددا کردووە، سەرنجم داوە، زانستەکەیان هەموو لەلای ئەم شەشکەسەیان کۆوە بووە: عومەرو عەلی‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو موعازو ئەبو دەرداءو زەیدی کوڕی ثابیت (رەزای خودا لەهەموو هاوەڵانی پێغەمبەر بێ) ئەبو زەڕ بە ئەبو دەردائی دەفەرموو: (لەسەر رووی زەوی لەتۆ زاناتری تیا نییە ئەی ئەبو دەرداء!).

لەسەردەمی جێنشینی عوسماندا، بەدوو ساڵ لەپێش شەهید بوونی عوسماندا، ئەبو دەرداء مردووە (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٢، لاپەڕە: ٢٨٣، ژمارە: ٨٩٧ + مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٠٨}.

١٥٥٢- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَلْحَيَاءُ مِنْ اَلْإِيمَانِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٣ = بوخاری/٢٤، ٣٦٩١، ٧٠٠٨، ٧٠٠٩. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٣٠ = شيحا/١٥٢، ١٥٣}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

ئـــەبو هـــورەیرە (ڕەزای خـــودای لێ بـــێ) دەفـــەرموێ: خۆشەویـــست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیمانو بـاوەڕ حـەفتاو ئەوەنـدە، یـا شەستو ئەوەندە لقە، گەورەترینیان وشەی پیرۆزی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یە، وە هەرە خوارووەکـەیان لابردنـی ئـازارە لەســەرەڕێ، وە شـەرمو شـکۆ بەشـێکە لـە بەشەکانی باوەڕ). {بڕوانە: ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٠١، ژمـارە: ٦٨٤ + ژمـارە: ١٢٥}. {تاج/٥، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٤٨٧٠}.

١٥٥٣ – وَعَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ اَلنَّاسُ مِنْ كَلَامِ اَلنُّبُوَّةِ اَلْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ، فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ .

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٥٠ = بوخاری/٦١٢٠}:

ئـــەبو مەســـعوودی ئەنـــصاری (ڕەزای خـــودای لێ بـــێ) فـــەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو فەرمایشتە جوانو قسە نەستەقەی کە دەفـەرموێ: ئەگـەر شـەرم ناکـەی چـی دەکـەی بیکـە، ئـەم فەرمایـشتە لـە فـەرموودەی پێغەمبـەرە پێـشینەکانە). {تـاج/٥، زنجـیرە: ٣٨، ژمارە: ٤٨٧١ – باسی شەرمو شکۆ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٤٤/٣٧}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەوەی کە لەسەرەتای فەرموودەکەوە دەڵێ: لە ئیبنـو مەسـعوودەوە، یـا هەڵـەی نووسـیارە، یـا هەڵـەی قەڵەمـە. ڕاسـتەکەی لـە ئـەبو مەسـعوودی ئەنصارییەوەیە.

٢- ئـەم فەرموودەیـە بـەدوو شـێوە ڕافـەو واتـەکراوە، یـەك لەیـەك جوانترن:

يەكـەم: مـرۆڤ كـەبێ شـەرمو بـێ ئـابڕوو بـوو، حـاڵی حـاڵی ئاژەڵـە، ئاژەڵیش شەرم لەهیچ ناكاو بەبێ قەیدو مەرج هەرچی بیوێ دەیكاو گوێ بـە حەڵاڵو حەرامو عەیبو عارو شوورەیی نادا.

دووەم: شەرمو شكۆ كلیلی باشیو خراپی‌یە، لەبەرئـەوە سـەرنج بـدە هەرشتێ كە كردنی شەرماویو حەیابەر نییە بیكە، چونكە شتی وا دروستو حەڵاڵە، دەنـا شـەرمی لێ دەكـرا، هـەروەها هەرچیش شـەرم ئـاوەرو حەیابـەرە مەیكـە چـونكە شـتی وا نادروسـتو قەدەغەیـە، دەنـا داعـی نییـە كـە شـەرم لەكردنی بكرێ.

١٥٥٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَلْمُؤْمِنُ اَلْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اَللَّهِ مِنْ اَلْمُؤْمِنِ اَلضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ، اِحْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ، وَلَا تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلَا تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَّرَ اَللَّهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ" فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ اَلشَّيْطَانِ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ .

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٤٠ = شيحا/٦٧١٦ = مـسلم تـرقيم محمد فؤاد/٢٦٦٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (موسـوڵمانی توانـاو بـەهێز، لـە موسـوڵمانی ناتەواناو بێ هێز باشترە، هەردوولایش مادەم موسوڵماننو ئەهلی ئیمانن زۆر باشـن، هەرچـی سـوودی ڕەوای هـەردوو جیهـانی هەیـە بـۆت، سـوورو مجیزبـە لەسەریو تێكۆشە بۆی، هەمیشە یارمەتی لە خودای گەورە داوابكەو، بەپشتی خودا دەست بدەرە كاری خێرو تەمبەڵو تەوەزەل مەبەو، خـاوە خـاوو سـستە سستی تیامەكە، خودا دەتگەیەنێ بە ئاوات، چونكە خۆی بەڵێنی ئەوەی داوەو دەفەرموێ: {وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَـى اللَّـهِ فَهُـوَ حَـسْبُهُ - الطـلاق/٣} : واتـە: ئـەوەی

بەڕاستی پشت بەخودای خۆی ببەستێ، خودای بەسەو، کاری بەکەسی تر نییە).

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر تووشی شتێکیش بوویت، مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە واوا دەبوو، ئەم کارەساتەم تووش نەدەبوو، یا ئەو شتە باشەم بۆ دەبوو! بەڵام بڵێ: ئەمە چارەنووسی خودا بوو، چارەنووسی خودایش ڕەتبوونەوەی بۆ نییەو خودا خواستو ویستی لەسەر هەرشتێ بێ دەیکاو ڕوو دەداو دەبێ ببێ، چونکە ئەگەر بڵێیت ئەگەر وام بکردایە وادەبوو ئەم جۆرە (ئەگەر)ە دەرگا بۆ کاری شەیتان دەکاتەوەو سەردەکێشێ بۆ خراپەگرتن لە چارەنووسی خواییو قەزاو قەدەر. کەواتە: خۆت بدە دەست ئەمری خوداو لەدوای چووە مەچۆ!!). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤١٩٨ — سوورەتی (هل أتی)}.

١٥٥٥- وَعَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِنَّ اَللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا، حَتَّى لَا يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلَا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٧٣ = ٧١٣٦ = مسلم/٢٨٦٥}:

عییاضی کوڕی حیمار (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە نیگای کردووە بۆم: کە هەتا دەتوانن بێ هەواو بێ دەعیەبنو خۆتان بەکەم بگرن، بەجۆرێکی وا کەس زۆرو ستەم لەکەس نەکاو کەس خۆی لەکەس بەگەورەتر نەزانێو کەس بەسەر کەسا شانازی نەکا). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٤٨٧٦ + مختصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٩٠ = شیحا/٦٥٣٥}.

١٥٥٦- وَعَنْ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) عَـنْ اَلنَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: { مَنْ رَدَّ عَنْ عِـرْضِ أَخِيـهِ بِالْغَيْـبِ، رَدَّ اَللَّـهُ عَـنْ وَجْهِـهِ اَلنَّـارَ يَـوْمَ اَلْقِيَامَةِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَحَسَّنَهُ .

{صحيح الجامع/٦٢٤٠}:

ئـەبو دەرداء (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ باسی ناموسی برای ئایینی خۆی بکاو بەرپەرچی رەخنەی ئەوانە بداتەوە کە لە پاشـەملە بەخراپـە باسـی دەکـەن، لەرۆژی قیامەتـدا خـودا لـەئاگری دۆزەخ تـەواو دووری دەخاتـەوە). {تـاج/٥، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٤٨٥٢}.

١٥٥٧- وَلِأَحْمَدَ، مِنْ حَدِيثِ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ نَحْوُهُ .

{صحيح الجامع/٦٢٤٠}:

ئـەسمائی کـچی یەزیـد (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (کەسـێ بـەرگری لـە ناموسـی بـرای ئایینی خۆی بکا، کاتێ کەسێ غەیبەتی دەکا، دەبێ بە مـاف لەسـەر خـودا، کە لەئاگری دۆزەخ ئازادی بکا).

(روونکردنەوە):

ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی السکن الأنصارية الأوسـية. وتاربێـژترینی ژنـان بـوو، نازنـاوی: وتاربێـژی ژنانـە، لەسـاڵی یەکـەمی کۆچـیدا لەگـەڵ دەستەیەکا هات بۆلای پێغەمبەرو پەیمانی پێ داو گوێی لە فەرمایشتی گـرت، ئامادەی نەبـەردی کـەم مانەنـدی یـەرمووك بـوو، کـە لەساڵی (١٣ك) رووی دا، ئـاوی دەگێـڕا بەسـەر جەنگاوەرەکانـەوە، تیمـاری برینـدارەکانی دەکـرد. کاتـێ شەڕ گەرم بوو، تێلای چادرەکەی خۆی هـەلگرتو خـۆی کـرد بـەناو جەرگـەی نەبەردەکەدا، بـەو تێلایـە نۆکەسـی لـە سوپای رۆم کوشـت، لـە بوخاریـدا دوو

فەرموودەی هەیە، کچی پووری موعازی کوڕی جەبەلە، لە باوکەوە، باوكو برایەکی لەشەڕی ئوحوددا کوژراونو شەهید بوون.

١٥٥٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اَللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلَّا عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ .

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٧٩٠ = ٦٥٣٥ شيحا = مسلم/٢٥٨٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نە ماڵ بە بەخشینو خێرلێکردن کەم دەکا، نە بەندەی خودایش بەچاو پۆشی لە هەڵەی خەڵكو بە لێبووردن لێیان کەم دەکا، بەڵکوو زیاتر خودا پلەو پایەی بەو چاوپۆشیو لێبووردنە بەرزەوە دەکا، هەر کەسێکیش ساخ لەبەر ڕەزای خودا خاکیو بێ هەوا بێو خۆی بەکەم بگرێو بێ فیزو دەعیە بێ، مسۆگەر کە خودای گەورەو سەروەر زیاتر پایە بەرزی دەکاو دەستی ڕێزی لێ ئەنێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٤٨٤٤ ج/٤}.

١٥٥٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ سَلَّامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { يَا أَيُّهَا اَلنَّاسُ! أَفْشُوا اَلسَّلَام، وَصِلُوا اَلْأَرْحَامَ، وَأَطْعِمُوا اَلطَّعَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا اَلْجَنَّةَ بِسَلَامٍ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{صحيح الجامع/٧٨٦٥}:

عەبدوڵلای کوڕی سەلام (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سەلام پەخش بکەنەوەو، پەیوەندی خزمایەتی پتەو ڕابگرنو، نانو ئاو بە مەردوم بدەنو، کاتێ خەڵکان

سەرگەرمی خەون، ئێوە سەرگەرمی شەو نوێژبن، ئیتر بەخۆشیو شادی دەچنە بەهەشتێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٧٠٤}.

١٥٦٠- وَعَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { اَلدِّينُ اَلنَّصِيحَةُ" ثَلَاثًا. قُلْنَا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اَللَّهِ؟ قَالَ:" لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ اَلْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٠٩ = شيحا/١٩٤ = مسلم/٥٥}:

تەمیمی داری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایین – واتە: دین – برێتییە لە ئامۆژگاری ساغو دڵسۆزی).

ئێمەیش گوتمان: بەرابەر بەکێ؟ فەرمووی: (بەرابەر بەخوداو بە قورئانو بە پێغەمبەرو پێشەوایانی موسوڵمانانو تێکڕای موسوڵمانان بەگشتی). {تاج/١/١٧، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١١، چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

تەمیمی داری (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێشا مەسیحی بوو، لەساڵی نۆی کۆچیدا موسوڵمان بوو، موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، غەزای لەخزمەتی پێغەمبەردا کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داستانی جەساسەو جەجاڵی لەوە گێڕاوەتەوە، وە ئەوە دائەنرێ بە گەورەترین شانازی بۆی {تاج/٥/٦١٥، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٥٦٠٥، چ/٤}. تەمیم یەکەم کەس بوو کە بەشەو چرای لەمزگەوتا داگیرساند، یەکەم کەسیش بوو کە چیرۆكو داستانی گێڕایەوە، بەشەو شەونوێژی زۆری دەکرد، جاری وابووە لەیەك ڕکاتی شەونوێژدا، هەموو قورئانی خەتم کردووە!

هەمیشەو بەردەوام شەونوێژێکی زۆر زۆری دەکرد، شەوێ تا بەیانی هەر بەم ئایەتە شەونوێژی دەکرد، لەهەموو ڕکاتێکا لەپاش فاتیحاوە دووبارەی دەکردەوە:

{أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَّن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاء مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاء مَا يَحْكُمُونَ – جاثنة – ٤٥/٢١}. واته:

با بێ باوەڕان كە ئەو هەموو كوفرو بەدكاریو خراپەیان تێ گوشیوە، كەچی باوەڕیشیان وایە: كە ئەوانو موسوڵمانان كە ئەو هەموو كردەوە باشانەیان كردووە، لەدنیاو قیامەتدا، بەیەك چاو تەماشایان بكەین؟ با بێباوەڕان خۆیان بەمجۆرە بۆچوونە هەڵەیە دەسخەڕۆ نەكەن، بەڕاستی ئەمە بڕیارێكی زۆر خراپو هەڵەو چەوتە.

لەپاش كوشتنی عوسمان، تەمیم ڕۆیشت بۆ شام، وە لەوێ مرد، گۆڕی وا لەبیت جەبرین، لە وڵاتی فەلەسطین، حەزرەتی عومەر زۆر ڕێزی لێ دەگرت.

١٥٦١– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ اَلْجَنَّةَ تَقْوى اَللَّهِ وَحُسْنُ اَلْخُلُقِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{السلسلة الصحيحة/٩٧٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زۆرترین شت كە مەردوم دەخاتە بەهەشت، تەقوای خوداو ڕەوشتی جوانە).

١٥٦٢– وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّكُمْ لَا تَسَعُونَ اَلنَّاسَ بِأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ لِيَسَعْهُمْ بَسْطُ اَلْوَجْهِ، وَحُسْنُ اَلْخُلُقِ} أَخْرَجَهُ أَبُو يَعْلَى، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{ضعيف الجامع/٢٠٤٣}:

دیسان ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێوە ناتوانن كە بە بەخشینی ماڵ،

ئـەو خەڵكـە هـەموو لـەخۆتان رازی بكـەن، بـەڵام دەتـوانن كـە لەڕێگـەی روو خۆشیو رەوشتی شیرینەوە هەموویان لەخۆتان رازی بكەن!).

١٥٦٣- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم): {اَلْمُـؤْمِنُ مِرْآةُ اَلْمُؤْمِنِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{صحيح الجامع/٦٦٥٥}:

دیـسان ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موسوڵمان ئاوینەی بـرای موسـوڵمانی خۆیەتی).

١٥٦٤- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {اَلْمُؤْمِنُ اَلَّذِي يُخَالِطُ اَلنَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنْ اَلَّذِي لَا يُخَالِطُ اَلنَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ} أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَـهْ بِإِسْـنَادٍ حَـسَنٍ، وَهُـوَ عِنْـدَ اَلتِّرْمِذِيِّ: إِلَّا أَنَّهُ لَمْ يُسَمِّ اَلصَّحَابِيَّ.

{صحيح الجامع/٦٦٥١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (ئـەو موسـوڵمانەی كـە تێكـەڵی لەگـەڵ خـەڵكا ددەكاو ئارام دەگرێ لەسەر ئێشو ئازاریان، باشـترە لـەو موسـوڵمانەی تێكـەڵی لەگەڵ خەڵكا ناكاو ئارام ناگرێ لەسەر ئێشو ئازاریان).

١٥٦٥- وَعَنِ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { اَللَّهُـمَّ كَمَـا أَحْـسَنْتَ خَلْقِـي، فَحَـسِّنْ خُلُقِـي } رَوَاهُ أَحْمَـدُ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع/١٣٠٧}:

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەی خودایـە! داوات لێ دەكـەم هـەر وەكـوو شێوەت شیرین كردووم، ئاوەهایش رەوشتم شیرین بكە!).

## ٩٨- باسی یادی خوداو نزاو پاڕانەوە
## باب: اَلذِّكْرِ وَالدُّعَاءِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول/٥، لە زنجیرە: ٥٨وە هەتا زنجیرە: ٩٣، لە ژمارە: ٤٩٣٩وە هەتا ژمارە: ٥١٥٦م + مختصر صحیح مسلم/٥، لە ژمارە: ١٨٨١وە هەتا ژمارە: ١٩١٥، لە زنجیرە: ٥٨ + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٤، لە ژمارە: ١٤٠٨وە هەتا ژمارە: ١٤٦٤}.

١٥٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { يَقُولُ اَللَّهُ -تَعَالَى-: أَنَا مَعَ عَبْدِي مَا ذَكَرَنِي، وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ} أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ، وَذَكَرَهُ اَلْبُخَارِيُّ تَعْلِيقًا.
{صحيح الجامع/١٩٠٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورەو سەروەر بۆخۆی دەفەرموێ: من لەگەڵ بەندەی خۆمدام مادەم یادو زیکری من بکاو لێوەکانی بەناوی من دەبزوێ).

١٥٦٧- وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ عَمَلاً أَنْجَى لَهُ مِنْ عَذَابِ اَللَّهِ مِنْ ذِكْرِ اَللَّهِ } أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَالطَّبَرَانِيُّ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ .
{صحيح الجامع/٥٦٤٤}:

موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هیچ کردەوەیەکی باشی ئادەمیزاد، وەك زیکری خودا، لەسزای خودا ڕزگاری ناکا).

١٥٦٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا، يَذْكُرُونَ اَللَّهَ فيهِ، إِلَّا حَفَّتْ بِهِمُ الْمَلَائِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{صحيح مسلم ترقيم/شيحا/٦٧٩٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر کۆمەڵێ لە موسوڵمانان لەشوێنێ کۆڕی زیکری خودای لێ ببەستنو یادو زیکری خودا بکەن، مسۆگەر کە فریشتەی خودا لەهەر چوار لاوە دەورەیان لێ دەدەنو شەپۆلی سۆزو میهرەبانی خودا دایان دەپۆشێو خودایش لەلای خۆیەوە، لەبارەگای خۆی لەلای ئەنجومەنی باڵا (مەلەئی ئەعلا) باسی چاکەیان دەکا). {تاج/١، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٠٠ + تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٤٤، بڕوانە: ژمارە: ١٠٠ لەبەرگی یەکا}.

١٥٦٩- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { مَا قَعَدَ قَوْمٌ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرُوا اَللَّهَ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) إِلَّا كَانَ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَقَالَ: "حَسَنٌ" .

{السلسلة الصحيحة/٧٦ – الصحيح المسند/١٣٢٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر کۆمەڵێ لەکۆڕێکا دابنیشن، بەڵام یادی خودای تیانەکەن، وە دروودو سەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خۆیان نەدەن، دڵنیابن کە ئەو دانیشتنە دەبێ بەداخو خەفەت بۆیان، ئیتر لەوەدوا خودا خۆی ئارەزوو بکا لەسەر ئەوە سزایان دەدا، ئارەزوویش بکا لێیان خۆش دەبێ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٥٨، ژمارە: ٤٩٤٨}.

١٥٧٠- وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأنصارى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ عَشْرَ مَرَّاتٍ، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٩٢ = ٦٤٠٣ بوخاری + تەجرید/٥، ژمارە: ١٩٩٣ = بوخاری/٦٤٠٤. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٠٨ = شيحا/٦٧٨٣، ٦٧٨٥ = ترقيم محمد فؤاد لصحيح مسلم/٢٦٩٣}:

ئـەبو ئـەييوبى ئەنـصارى (رەزاى خـوداى لێ بـێ) لـە خۆشەويـستەوە دەفەرموێ (دروودى خوداى لەسەر بێ): (هەركەسێ دەجار ئەم زيكرە بڵێ بە زمـانو بـە دڵ بـاوەڕى پێـى هـەبێ، وەك ئـەوە وايـە كـە بـۆ رەزاى خـودا، چـواركەس لەنـەوەى ئيـسماعيل، كـە بـاپيرە گـەورەى پێغەمبـەرە، ئازادبكـا، ئەمەيش زيكرەكەيە:

«لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ ، وَلَهُ الْحَمْـدُ ، وَهُـوَ عَلَـى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ».

هـەرخودا خـوداى بەهەقـەو بـەس، خودايـەكى تـاكو تەنهايـە، هـيچ هاوبەشێكى نييە، موڵكو سامانو دارايـىو پاشايىو سـەڵتەنەتو دەسـەڵاتو سوپاسو سـتايش، هـەمووى هـەر بـۆ ئـەوەو بـەس، وە خودايـەكى وەهايـە كـە دەستى دەڕوا بەسـەر گـشت شـتێكاو توانـاى هـەموو شـتێكى هەيـە). {رياضى صالحين/٣، زنجيره: ٢٤٤، ژماره: ١٤١١}.

١٥٧١– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اَللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَـتْ مِثْلَ زَبَدِ اَلْبَحْرِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

{تەجريدى بوخارى/٥، ژماره: ١٩٩٤ = بوخـارى/٦٤٠٥. مختـصر صـحيح مسلم/٥، ژماره: ١٩٠٨ = شيحا/٦٧٨٣ = مسلم/٢٦٩١}:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويـست (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ، هەر رۆژێ، سەدجار بڵێ: (سُـبْحَانَ اللّهِ وَبِحَمدِهِ: پاكىو پيرۆزىو بێ گـەردى لەهـەموو نـەنگو كـەمو كوڕييـەكو سوپاسو ستايش، هەر بۆ زاتى يەزدانى پاكە، هەر كەسێ، هەر رۆژێ سـەدجار ئەم يادە بڵێ، گوناهو تاوانەكانى لێ هەڵ دەوەرن، بـا بەوێنـەى كـەفى دەريـاش گوناهى زۆربن). {رياض/٣، زنجيره: ٢٤٨، ژماره: ١٤٥١/١}.

١٥٧٢- وَعَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ اَلْحَارِثِ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ اَلْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اَللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ } أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ .

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٩٠٢ = شيحا/٦٨٥١ = ترقيم محمد فؤاد لصحيح مسلم/٢٧٢٦}:

لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەبەیانییەك لەلای جووەیرییەی هاوسەری بوو، جووەیرییە لەنوێژگاکەیدا بوو، خەریکی یادی خودا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش کردنی نوێژی بەیانی لەسەر ئەو حاڵە بەجێی هێشتو دەرچووە دەرەوە، لەپاشان لەکاتی چێشتەنگاودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەگەڕێتەوە بۆلای جووەیرییە، دەبینێ هەر لەسەر نوێژگاکەی خۆی دانیشتووە، پێی دەفەرموێ: (لەوساکەوە کەمن بەجێم هێشتوویت، هەر خەریکی یادی خوداو تەسبیحاتی؟) جووەیرییە دەفەرموێ: بەڵێ. دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەسا من لەدوا ئەوە کە لەتۆ جیابوومەتەوە، سێجار ئەم چوار وشەیەم گوتووە، ئەگەر هەڵبکێشرێن بەو هەموو یادو زیکرو تەسبیحاتەدا، کەتۆ لەوساکەوە ئەمڕۆ کردووتن، بەرابەریان دەکەنو بەقەد ئەوان پاداشیان بۆ هەیە، بگرە بە زیادیشەوە، کە ئەو چوار وشانەیش ئەمانەن:

{سُبْحَانَ اَللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ}.

١- بەقەد ژمارەی دروستکراوانی خودا، تەسبیحاتو حەمدو سوپاسی خودا دەکەم.

٢- هەروا ئەوەندەی کە خودا خۆی پێی خۆش بێ تەسبیحاتو حەمدو سوپاسی دەکەم.

٣- هەروا بەقەد سەنگو کێشی تەختو بارەگای خودا، تەسبیحاتو حەمدو سوپاسی دەکەم.

٤- هەروا بەقەد ژمارەی وشەکانی خودا، کە لەژمارە نایەن، تەسبیحاتو حەمدو سوپاسی خودا دەکەم). {تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٣٠ + تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٩٧٣، ٤٩٧٤ + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ٢٤٤، ژمارە: ١٤٣٢}.

(ڕوونکردنەوە):

جووەیرییەی کچی حاریث، هاوسەری پێغەمبەرە، یەکێکە لە دایکانی باوەڕداران، لەهۆزی بەنی موصطەلیقە، لەپێشدا ناوی (بەڕرە) بوو، کە بە واتا (باش = چاك = خاس) پێغەمبەر مارەیکرد، ناوەکەی گۆڕیو ناوینا جووەیرییە، واتە: کچۆڵە. حاریثی باوکی ئاغای هۆزی بەنی موصطەلیق بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە لەبەرکردووە، لە بوخاریو موسلیمدا، لەچەند شوێنێکا، لەچەند بۆنەیەکا، ناوی هاتووە، لەسەر فەرمایشتی شێخی عەینی لە عومدەتولقاریئدا، ئافرەتێکی یادکاری زمانپاراو بەیادی خودا بووە، زۆر جاران کە نوێژی بەیانی دەکرد، لەسەر جێگە نوێژەکەی دادەنیشت، کۆمەڵێ ناوکە خورما، یا بەردە وردەی، لەبەردەمی خۆیدا دادەنا، وەك تەزبیحی ئەمڕۆ، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ لەباتی تەزبیح، ویردو تەسبیحاتی پێ دەژمارد، لە تەمەنی شەستو پێنجساڵیدا، لەمانگی ڕەبیعی یەکەما، ساڵی پەنجاو شەشی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە (ڕەزاو ڕوەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ). {موختەصەری صەحیحی موسلیم/٥، ژمارە: ١٩٠٣ + تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩١٦، لاپەڕە: ٢٩٨، چ/١}.

**بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بفەرموو بڕوانە ئەم سەرچاوانە:**

**١- تاج/١، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٦٣٠ کە جووەیرییە خەریکی تەسبیحات بووە ص٢١٧.**

**٢- تاج/٢، زنجیرە: ٣٥ ئایەتەکان، کە باسی قەدرو رێزی دایکانی موسوڵمانان دەکەن.**

**٣- تاج/٤، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ٤٦١٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٧ — باسی غەزای بەنی موصطەلیق.**

**٤- تاج/٥، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٤، باسی ژماردنی تەسبیحاتو ویردو سەرچاوەی تەزبیح.**

**٥- عومدەتولقاری/ شێخی عەینی، بەرگی/١١ ص١٠٦ + عەینی/١٧ ص٣٠٤ + ٣١٤ + عەینی/١٣ ص٩٥.**

**٦- فەتحولباری/شێخی عەسقەلانی، بەرگی/٤، ص٢٣٢ فەرموودەی ژمارە: ١٩٨٤ = ٩١٦ تەجریدی بوخاری.**

**٧- الإصابة في تمييز الصَّحَابَةِ، المجلد/٤ ص٢٥٦ (جويرية). تسلسل/٢٥١ من أسماء النِّساء.**

**٨- الإستيعاب في معرفة الأصحاب، لابن عبدالبر، المجلد الرابع، اسم (جويريّة) من أسماء النِّساء ص٢٥٨.**

**٩- تاج/١ ص٢١٧ + تاج/٢ ص٢٠٢ + ص٢٧٢ + تاج/٥ ص١٠١.**

**١٠- صحيح مسلم بشرح الإمام النووي المُلد/١٧ ص٤٤ + شرح صحيح مسلم/١٠ ص١٤٠ إلى ص١٤٥.**

**١٥٧٣**– وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { اَلْبَاقِيَاتُ اَلصَّالِحَاتُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، وَسُبْحَانَ اَللَّهِ، وَاَللَّهُ

أَكْبَرُ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ} أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{ضعيف الجامع/٨٢٨}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو باقیاتو صالحاتەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە {وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا — الكهف/٤٦}. مەبەست لێی ئەم یادە پیرۆزەیە:

{لَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ، وَسُبْحَانَ اَللّٰهِ، وَاَللّٰهُ أَكْبَرُ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللّٰهِ}.

١٥٧٤– وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { أَحَبُّ اَلْكَلَامِ إِلَى اَللّٰهِ أَرْبَعٌ، لَا يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ: سُبْحَانَ اَللّٰهِ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ، وَاَللّٰهُ أَكْبَرُ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٤١١ = ٥٥٦٦ شيحا = مسلم ١٤٦٣. أبوداود. أدب: ٤٩٥٨، ٤٩٥٩. ترمذی. أدب: ٢٨٣٤، ابن ماجة. أدب: ٣٧٢٩. تحفة الأشراف/٤٦١٢}:

سەمموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خۆشەویسترین گوتە، لەلای خودای گەورە، ئەم چوار وشەیەیە: {سُبْحَانَ اَللّٰهِ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ، وَاَللّٰهُ أَكْبَرُ}.

واتە: پاکیو پیرۆزی، لەڕاستیدا هەر بۆ خودایە، سوپاسو ستایش هەر شایستەی خودایە، هەر خودا خودایەو بەس، خودا لەهەموو کەسو لەهەموو شتێ گەورەترە.

بەهەرکامیَ لەم چوار وشەیە دەست پیَ بکەی، قەیدی نییە بۆ تۆ، کوڕی خۆشت ناومەنیَ یەسار، یا ڕەباح یا نەجیح، یا ئەفلەح، چونکە وا دەبیَ تۆ دەپرسیتو دەڵێیت: ئەریَ هین لەویَیە؟ جا ئەگەر لەویَ نەبوو دەڵێن: ئەو لێرە نییە) فسەبێژ دەفەرمویَ: ئەم ناوانە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیَ) جڵەوگیریی لێیان کردووە، تەنیا چوار ناونو بەس، بەدەم منەوە زیاتریان مەکەن!. {تاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٥٤٠١ ج/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەوەی کە دەفەرمویَ: (بەهەرکامیَ لەم چوار وشەیە دەست پیَ بکەی قەیدی نییە بۆ تۆ) مەبەست ئەوەیە بە:

١/ {سبحان اللهِ} دەست پیَ بکەی، وەك ئێستای خۆی ئەوە دەبیَو بگرە لەهەموو شێوەکانی تریش باشترە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیَ) ئەم شێوەی کردووە بەسەرمەشق بۆ شێوەکانی تر.

٢/ بە {الحمداللهِ} دەست پیَ بکەی دەبیَ، ئاوا: {الْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَسبحان اللهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ، وَاَللّٰهُ أَكْبَرُ}.

٣/ بە (لا إله إلا الله) دەست پیَ بکەی هەردەبیَ ئاوایە:

(لَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ، وَسبحان اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَاَللّٰهُ أَكْبَرُ).

٤- بە (الله اكبر) دەست پیَ بکەیت، دیسان هەردەبیَ، ئاوا: (اَللّٰهُ أَكْبَرُ، وَسبحان اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اَللّٰهُ).

ئەوەیشی کە دەفەرمویَ: (ئەریَ هین لەوێیە؟).

ئەم چوار ناوە، واتایان ئاوایە: (یەسار = ئاسان). (ڕەباح = قازانج). (نەجیح = سەرکەوتوو). (ئەفلەح = ڕزگار) جا لەکاتی پرسیاردا، ئەگەر کەسیَ لەکەسیَ بپرسیَ، ئەریَ کاك ئاسان لەوێیە؟) تۆیش بڵێی: ئاسان لێرە نییە.

نوقلآنەی باش نییە. بەپێی راڤەنامەکانو روونکەرەوەکان ئەم جۆرە ناوانە کە راهەتی تەنزیهی هەیە. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٣٥ کە لەپیشەوە رۆیشت}.

١٥٧٥- وَعَنْ أَبِي مُوسَى اَلْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { يَا عَبْدَ اَللَّهِ بْنَ قَيْسٍ! أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ اَلْجَنَّةِ؟ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٢٢٥ = ٢٩٩٢، ٤٢٠٥، ٦٣٨٤، ٦٤٠٩، ٦٦١٠، ٧٣٨٦ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٩٣ = شيحا/٦٨٠٣ = صحيح مسلم ترقيم محمد فؤاد/٢٧٠٤}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی خۆشەویستدا بووین، گشت جارێ کە دەگەیشتینە سەر بەرزاییەك، کە دەیڕوانی بەسەر شیوو دۆڵێکا، دەستمان دەکرد بە گوتنی (لا إِلَهَ إِلاّ اللّهُ) یا (الله اكبر) بەدەنگی بەرز، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! بەزەویتان بەخۆتانا بێتەوە، ئەم هاتو هاوارەی پێناوێ، خۆ ئێوە هاوار لە کەڕو لاڵ، یا لە نادیار ناکەن، ئێوە بانگی کەسێ دەکەنو لەکەسێ دەپاڕێنەوە، کە ئاگای لەخشەی مارو مێرووە، کە خودای گەورەیە، کەهەموو شتێ دەبیستێو لەهەموو شتێ نزیکترە).

ئەبو مووسا فەرمووی: من لەم کاتەدا لەدوایەوە بووم، خۆش خۆش دەمگوت: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ : هێزو توانایی هەر بەدەستی خودا خۆیەتیو بەس).

خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس! ئەی ئەبو مووسا! هۆشیاربە، با گەنجێنەیێ لە گەنجینەکانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! دڵم لەلاتە.

فەرمووی: (وشەی پیرۆزی (لَا حَوْلَ وَلَا قُـوَّةَ إِلَّـا بِاَللَّـهِ) گەنجینەیەکە لـە گەنجینەکانی بەهەشت!). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٩٧٥ – ذیکری: لَا حَـوْلَ وَلَـا قُـوَّةَ إِلَّـا بِاَللَّـهِ } + {تـاج/١، زنجیرە: ٦٣، ژمـارە: ٤٣٢ + تـاج/٥، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٤٩٧٩ ذیکری: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ...}.

١٥٧٦ – زَادَ النَّسَائِيُّ: { وَلَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ }.

١- نەسائی (ڕەحمەتی خـودای لێ بـێ) ئـەم زیادەیـە دەخاتـە سـەر ئـەم فەرموودەیە، ئاوای لێ دێ:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا، دەڕۆیـشتم، فــەرمووی: (ئــەی ئــەبوهورەیرە! هۆشــیاربە! بــا گەنجینــەیێ لەگەنجینەکانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم، کە وشەی پیرۆزی {لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاَللَّهِ وَلَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ} : هێزو توانایی هەربەدەستی خـودا خۆیـەتیو بەس، پەنا هەر پەنای خودایەو بەس. {ضعيف الترغيب والترهيب: ٢٤٣/١}.

٢- نوعمـانی کـوڕی بەشـیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (نـزاو پاڕانـەوە لـە خـودا کـورۆکی خوداپەرستیو مۆخی پەرستشی ساغە). {صحيح الجامع: ٣٤٠٧}.

١٥٧٧ – وَعَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِنَّ اَلدُّعَاءَ هُوَ اَلْعِبَادَةُ} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَـحَّحَهُ اَلتِّرْمِـذِيُّ. وَلَـهُ مِنْ حَدِيثِ أَنَسٍ بِلَفْظِ: {اَلدُّعَاءُ مُخُّ اَلْعِبَادَةِ}.

{ضعيف الجامع: ٣٠٠٣}:

ئیمـامی تەرمـەزی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەگێڕێتـەوە: ئەنـەس (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: (نزاو پاڕانەوە لەخودا کورۆکی خوداپەرستیو مـۆخی پەرستـشی ساغە).

١٥٧٨- وَلَهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ رَفَعَهُ: {لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اَللَّهِ مِنَ الدُّعَاءِ} وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ .

{حسن، صحيح الجامع: ٥٣٩٢}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هیچ شتێ لەلای خودا وەك نزاو پاڕانەوە رێزدارو نازدار نییە). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٥٠٠١}.

١٥٧٩- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلدُّعَاءُ بَيْنَ اَلْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لَا يُرَدُّ} أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، وَغَيْرُهُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَغَيْرُهُ .

{صحيح الجامع: ٣٤٠٨}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خودای لەسەر بێ) (نزاو پاڕانەوەی نێوانی بانگو قامەتی نوێژ قەبووڵەو گیرایە).

١٥٨٠- وَعَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِنَّ رَبَّكُمْ حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا } أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ .

{صحيح الجامع: ١٧٥٧}:

سەلمان (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پەروەردگاری ئێوە، زۆر بەشەرمو بەرێزە، هەر بەندەیێ لەپاڕانەوەدا دەستی هەڵبڕێ بۆلای خودا، خودا شەرم دەکا کە دەستەکانی بەخاڵی رەت بکاتەوە). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٥٠١٢}.

١٥٨١- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا مَدَّ يَدَيْهِ فِي اَلدُّعَاءِ، لَمْ يَرُدَّهُمَا، حَتَّى يَمْسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ .

{ضعيف، الإرواء/٤٣٣}:

عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەپاڕانەوەدا کە دەستەکانی هەڵدەبڕی، هەتا نەیانی هێنایە بەدەموچاویدا دایانی نەدەنایەوە. {تاج/٥، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٥٠١٣}.

١٥٨٢- حَدِيثُ اِبْنِ عَبَّاسٍ: عَنْ أَبِي دَاوُدَ . وَمَجْمُوعُهَا يَقْتَضِي أَنَّهُ حَدِيثٌ حَسَنٌ.

{ضعيف، إرواء الغليل: ٤٣٣}:

ئەبوداوود لەئیبنو عەبباسەوە فەرموودەیە لەم بارەیەوە دەردەهێنێ کۆی ئەم فەرموودانە نیشانەی ئەوەیە کەناوەرۆکی ئەم فەرموودانە فەرموودەیەکە لە پلەی (حسن)دا.

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیەیە لەئەبو داوودا:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پەردە بۆ دارو بەردو دیوار مەکەن، کەسێ کاغەزی برایەکی ئاییینی خۆی، بەبێ مۆڵەتو ڕەزای خۆی، بخوێنێتەوە ئەوە ئاگر دەکاتە ناو چاوی خۆی، کە لەخودا دەپاڕێنەوە بەبەری دەستتان لێی بپاڕێنەوە، بەپشتی دەست لێی مەپاڕێنەوە، کاتێ لەپاڕانەوەکەتان لێ بوونەوە، بەری هەردوو لەپتان بهێنن بە دەموچاوتانا).
{تاج/٥، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٥٠١٥}.

١٥٨٣- وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِنَّ أَوْلَى اَلنَّاسِ بِي يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ، أَكْثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلَاةً } أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{حسن لغيرهِ، صحيح الترغيب والترهيب/١٦٦٨}:

**ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا لەپێشترین کەس بەمن ئەو کەسانەن کە دروودو صەڵاوات زۆرتر لەسەر من دەدەن!). {تاج/٥، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٥١٢٦م}.**

**١٥٨٤- وَعَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { سَيِّدُ اَلِاسْتِغْفَارِ، أَنْ يَقُولَ اَلْعَبْدُ: اَللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي، وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اِسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي" فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ اَلذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ}. أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.**

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٩٧٦ = بوخاری/٦٣٠٦، ٦٣٢٣}:

**شەددادی کوڕی ئەوس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودو صەلاواتو سەلامو ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانی خودای لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو باوكو دایكو ڕۆحو گیانو هەستو نەست، هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو گشتی بە قوربانی خۆڵی بەرپێی دێنیکەرانی ئارامگای نازداری بێ لەمەدینەی خۆشەویستو نازدارو پیرۆز) دەفەرموێ: (پاڕانەوەی هەرە گەورەو سەروەری گشت داوای لێبووردنو داوای تاوانپۆشییەك، لەخودای گەورە: ئەوەیە کە بەندە، بە زمانی پاراوو بەسۆزی دڵ بڵێ:**

**(اَللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي، وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اِسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي" فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ اَلذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ).**

واتە: ئەی خودای من! هەرتۆ پەروەردگاری منیت، لەتۆ زیاتر خودای تر نییە، من بەندەو عەبدی تۆمو تۆ منت لە نەبوون دروست کردووە، تا بتوانم پەیمانو بەڵێنی تۆ ناشکێنمو پابەندی دەبمو دەیبەمە سەر! کە نەیشم توانی ئەوە لە دەستەوسانیمە، چونکە ئەستەمە کە بەندە بتوانێ تەواوی ئەرکی سەرشانی خۆی بەرابەر بەتۆی پەروەردگار بەجێ بهێنێ، پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی کردەوەی خۆم، کە دەبێ بە مایەی سزاو تۆڵە بۆم، ئەی خودایە! تۆ کانگاو سەرچاوەی هەموو نازو نیعمەتێکی بۆ منو، هەمیشەو بەردەوام چاکەو نازو بەهرەی بێ شوماری تۆم لەبەرچاوە، پێ دەنێم لە گوناهباریی خۆم.

کەواتە: لێم خۆش بە. بەڕاستی تۆ نەبێ کەسی تر ناتوانێو هیچ کەسێ رادەی ئەوەی ناکەوێ کە لەگوناهی بەندەی خودا خۆش بێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بەڕۆژ ئەم نزایە بەدەم بڵێ، وە بەدڵ باوەڕی تەواوی پێی هەبێ، وەبەر لەهاتنی شەو، لەو رۆژەدا بمرێ، ئەوە بەهەشتییە، وە هەرکەسێ — لەشەودا — ئەمە بەدەم بڵێ، وە بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، وە لەپێش هاتنی رۆژدا بمررێ، ئەوە بەهەشتییە). {ریاضُ الصالحين/٤، زنجیرە: ٣٧١، ژمارە: ١٨٧٥ — نامەی پاڕاهنەوەو داوای لێبوردن} + {تاج/٥، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٥٤٢٧.م}.

١٥٨٥– وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَدَعُ هَؤُلَاءِ اَلْكَلِمَاتِ حِينَ يُمْسِي وَحِينَ يُصْبِحُ: اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ اَلْعَافِيَةَ فِي دِينِي، وَدُنْيَايَ، وَأَهْلِي، وَمَالِي، اَللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي } أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الترغيب وَالترهيب/١٥٩، الصحيح المسند/٧٦٥}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، ئێواری‌و بەیانی، ئەم پاڕانەوەی فەرامۆش نەدەکرد، دەیفەرموو:

{اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ اَلْعَافِيَةَ فِي دِينِي، وَدُنْيَايَ، وَأَهْلِي، وَمَالِي، اَللّٰهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي}.

واتە: خودایە! داوای لێخۆشبوون‌و خۆشی هەردوو جیهانت لێ دەکەم، خودایە! داوای لێبووردن‌و خۆشحاڵیت لێ دەکەم، بۆ دینم، بۆ ئاینم، بۆ دنیام، بۆ جیهانم، بۆ خۆم، بۆ ماڵ‌و منداڵم. خودایە! ئابڕوو و نامووسم بپارێزەو هەموو کەموکوڕی‌و نەنگێکم بپۆشە، وە ترسم بڕەوێنەوەو دڵم هێمن بکەرەوە، خودایە! ئاگات لێم بێ، ئاگات لەلای بەردەمم بێ، ئاگات لەلای پشتم بێ، ئاگات لەلای ڕاست‌و لەلای چەپم بێ، ئاگات لە ژوور سەرم بێ، پەنا دەگرم بە گەورەیی تۆ کەلە ناکاو بەبێ ئاگا ڕۆبچم بەناخی زەویدا). {تاج/٥، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٩٩٤ ج/٤}.

١٥٨٦- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفَجْأَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ١٩١٣ = شيحا/٦٨٧٩ = صحيح مسلم/ ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/٢٧٣٩}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب، کە ناسراوە بە (ئیبنو عومەر = ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) دەفەرموێ: زۆرجاران خۆشەویست (دروودو صەلاوات‌و سەلام‌و ڕەحمەت‌و سۆزو میهرەبانی خودای لەسەربێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و باوك‌و دایك‌و ڕۆح‌و گیان‌و هەست‌و نەست، هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ‌و گشتی بە قوربانی خۆڵی

بەرپێی دێنیکەرانی ئارامگای نـازداری بـۆ لەمەدینـەی خۆشەویـستو نـازدارو پیرۆز). ئیبنو عومەر فەرمووی: زۆرجاران پێغەمبەر ئەم نزایەی دەکرد:
{اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَـوُّلِ عَافِيَتِـكَ، وَفَجْـأَةِ نِقْمَتِـكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ}.

واتە: ئەی خودای گەورەم! ئەی یەزدانی پاکو پیرۆزم! پـەنا دەگـرم بـە پەنای تۆ لەوە کە خوا نەخواستە: بەهرەو نازو نیعمەتی تۆ پشتم تـێ بکـەن، هەروا لەوەیش کە ئەو ئاسوودەییەی کە بەخشیوتە بـەمن، لـەپڕا تـۆ لـەمنی بسەنیتەوەو تووشی دەردو بەڵاو مەینەتیو سەخڵەتیم بکـەی، هـەروەها پـەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کە لەناکاودا، لەپڕا ئاو قەدی تۆڵەی سەختی ناگـەهانی تـۆ ببم، پەنا دەگرم بەتۆ لەهەرچی شتێ کە دەبێ بەهۆی نـاڕەزاییو ڕەنجانـدنو ڕقو تووڕەیی تۆ!). {تاج/٥، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٥٠٦٨}.

١٥٨٧- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ: اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ اَلـدَّيْنِ، وَغَلَبَـةِ اَلْعَـدُوِّ، وَشَمَاتَةِ اَلْأَعْدَاءِ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.
{صحيح الجامع/١٢٩٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: زۆرجـاران پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: {اَللَّهُـمَّ إِنِّـي أَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ اَلدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ اَلْعَدُوِّ، وَشَمَاتَةِ اَلْأَعْدَاءِ}.

واتە: ئەی خودایە! من پەنا دەگرم بەتۆ لـەوەی کـە بـبم بـەژێر قـەرزو قۆڵـەوە، هـەروا پـەنا دەگـرم بـەتۆ لـەزاڵبوونی دوژمـنو لـە لێخۆشـبوونو شادەکامی دوژمنان).

١٥٨٨- وَعَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { سَمِعَ اَلنَّبِـيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) رَجُلاً يَقُولُ: اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْـتَ اَللَّـهُ لَـا إِلَـهَ إِلَّـا أَنْـتَ،

اَلْأَحَدُ اَلصَّمَدُ، اَلَّذِي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ. فَقَالَ" لَقَدْ سَأَلَ اَللَّهُ بِاسْمِهِ اَلَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الترغيب والترهيب/١٦٤٠. الصحيح المسند/١٥٢}:

**بورەیدە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لە پیاوێ بوو دەیگوت: {اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اَللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، اَلْأَحَدُ اَلصَّمَدُ، اَلَّذِي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ}.**

**واتە: ئەی خودای خۆم! بەوە لەتۆ داوادەکەم: کەمن شایەتی دەدەم کە تەنها تۆ تاقە خودای راستو دروستی، بێجگە لەتۆ خودای تر نییە، خودایەکی تاکو تەنیای، جێگەی ئومێدی ئومێدارانی، نە لەکەس بوویتو نەکەست لێ بووە، خودایەکی بێ وێنەو بێ مانەندی).**

**جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە گوێی لەم پیاوە بوو ئەم نزایەی خوێند، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (لەڕاستیدا ئەم پیاوە بەو ناوەی خودا لێی پاڕایەوەو داوای مەبەستی خۆی لێی کرد، کە هەرکاتێ بەو ناوە، داوای هەرچی لێ بکرێ، نائومێدی ناکاو دڵخوازەکەیی بۆ جێبەجێ دەکا، وە هەرکاتێ بەو ناوە لێی بپاڕێتەوە، نزاو پاڕانەوەکەی گیرا دەکا).**

١٥٨٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا أَصْبَحَ، يَقُولُ: اَللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ اَلنُّشُورُ} وَإِذَا أَمْسَى قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ " إِلَّا أَنَّهُ قَالَ: {وَإِلَيْكَ اَلْمَصِيرُ} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ.

{السلسلة الصحيحة: ٢٦٢. الصحيح المسند: ١٤٠١}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) وابـوو، سـەرلەئێواران دەیفـەرموو: {اَللّٰهُـمَّ بِـكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ اَلنُّشُورُ}.

واتە: ئەی خودایـە! بەپـشتی تـۆ وا رۆژمـان کـردەوە، بەپـشتی تـۆ شـەو دەکەینــەوە، لەسایەی تـۆوە دەژیـنو بەفـەرمانی تـۆ دەمـرین، کاتـێ زینـدوو دەبینەوە دەگەڕێینەوە بۆلای خۆت. ئێوارانیش هـەروای دەگوت: {اَللّٰهُـمَّ بِـكَ ........تاد} بەلام لـەباتی {وَإِلَيْـكَ اَلنُّـشُورُ}. دەیفـەرموو: {وَإِلَيْـكَ اَلْمَـصِيرُ}. {تاج/٥، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ٤٩٨٦}.

١٥٩٠- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ أَكْثَـرُ دُعَـاءِ رَسُـولِ اَللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَبَّنَا آتِنَا فِي اَلدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي اَلْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَـا عَـذَابَ اَلنَّارِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمـارە: ١٩٩٠ = بوخـاری/٦٣٩٩، ٦٣٩٨. مختـصر صحیح مسلم/٥، ژمارە: ١٨٧٣ = شیحا: ٦٧٨١ = صحیح مسلم ترقیم محمـد فـؤاد عبدالباقی/٢٦٩٠}:

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

عەبدولعەزیزی کوڕی صوهەیب (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: قەتادە لە ئەنەسی کوڕی مالیکی پرسی: زۆرترین پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) بەکام نزایە نزای دەکـرد؟ فەرمووی: (زۆرتریـنی کـات، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم نزایە نـزای دەکـردو دەیفـەرموو: {اَللّٰهُـمَّ - رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ - البقرة/٢٠١}.

واتە: خودایە! ئـەی پـەروەردگاری ئێمـە! هـەم لـەجیهاناو هـەم لـەڕۆژی پاشـەڕۆژا، بەشـی باشمـان پـێ بـدەو، لەهـەردوو جیهانـدا چاکمان بـۆ بکـە، وە

